حومەیرا موشیر زادە

# لە بزاڤەوە
# تا تیۆری کۆمەڵایەتی
## مێژووی دوو سەدەی فیمینیزم

بەرگی یەکەم

شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژنان

وەرگێڕانی: مراد حەکیم

هەولێر – ٢٠٠٥


**ناوی کتێب:** لە بزاڤەوە تا تیۆری کۆمەڵایەتی دوو سەدەی فیمینیزم

- نووسینی: حومەیرا موشیر زادە
- وەرگێڕانی: مراد حەکیم
- نەخشەسازی ناوەوە: طــه حسین
- بەرگ: هۆگر صدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپی یەکەم:
- هەولێر ٢٠٠٥
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ١٢٤
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

ئەم کتێبە بە هاوکاری سەنتەری راگەیاندن و رووناکبیری ژنان لە سلێمانی چاپکراوە

زنجیرەی کتێب – ٨ – (١١١)



**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی:** asokareem@ maktoob.com

**ژمارەی تەلەفۆن:** 2260311




# ناوەڕۆک

## پێشەکی

ڕەنگە بتوانین بڵێین بەدرێژایی سەدەی بیست فیمنیزم یەکێك بووە لەو بزاڤە کۆمەڵایەتیو هزریانەی زۆرترین مشتومڕی لە ئاستی جیهاندا دروست کردووە. زۆر لە گۆڕانە کۆمەڵایەتی، سیاسی و یاساییەکان لە ڕەوشی ژنان لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا دەشێ لە یەکەمجاردا بەهەڵقولاوی ئەو بزاڤە لەقەڵەم بدەین. لەو گۆڕانانەش ئامادەیی ژنان لە کایەی گشتیدا بەشێوەی جیاواز، لەوانەش کارکردن لەکایەی ئابووریو بەشە جیاوازەکانی پلەوپایە حکومییەکان، مافی دەنگدان، ئەندامێتی پەرلەمانەکان، کابینەی حکومەت و دەسەڵاتی قەزایی، بەهرەمەندبوون لە مافە مەدەنیەکان و...هتد.

لەلایەکی دیکەوە، هەندێجار گۆڕانەکانی وەك ناهاوسەنگی لە دامەزراوەی خێزان، کەمبوونی هاوسەرێتی، زۆربوونی تەڵاق، دەرکەوتنی هەڵسوکەوتە دوژمنکارەکانی نێوان ژنان و پیاوان، خستنە ژێر پرسیاری هەندێ لە نەریتە کۆنەکان کە بە بونیادی سەقامگیریی کۆمەڵایەتی دەژمێردرێن بە ئاکام یاخود تەنانەت نیشانەو سیمای ناسێنەری گەشەکردنو فراوانبوونی فیمنیزم سەیریان دەکرێت.

بەدرێژایی چەند سەدەی ڕابردوو بەتایبەتی لە چەند ساڵی ڕابردوودا، "فیمنیزم" و هەندێ لە ڕەخنە، داواکاریو خواستەکان کە بەبۆچوونی هەندێ کەس دەشێ بە گۆڕانکارییەکانی دەستی یەکەم یان دووەم کۆتایی بێن، هاتوونەتە نێو گوتاری ڕۆشنبیری و گشتی کۆمەڵگاکەمان، بەڵام وادەردەکەوێت فیمنیزمیش وەك زۆر لە دیاردە هزرییەکان کە بەلای کەمەوە لە یەکەمجاردا بەجۆرێك لە جۆرەکان "هێنراو"و "ڕۆژئاوایین"، ڕووبەڕووی دوو پەرچەکردار بووەتەوە. لەلایەکەوە، هەندێ کەس بەبێ



ڕەخنەو هەڵسەنگاندنو، بەپەرۆشەوە تیایدا بەدوای ڕێگەچارەی گیروگرفتەکانی ژنانی ئێران دەگەڕێنو هەندێکی دیکەش بەتەواوی و بەبێ هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی قووڵ لێی، هیچ جۆرێکی تەحەمووڵ ناکەن یاخود هەموو جۆرە هەوڵێك بۆ گۆڕینی ڕەوشی ژنان بە هەڵقولاوی نفووزی ناپەسەندو عاقیبەتی خراپی فیمنیزم دەزانن. هەڵبەت لەم نێوەدا چەند هەوڵێکیش دراون و دەدرێن بۆ تێگەیشتنی قووڵو ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی هۆشیارانە.

ئەو پرسیارەی کە دەبێت لە سەرەتادا بپەرژێینە سەری ئەوەیە لە بنچینەدا فیمنیزم چییەو چ پەیوەندیەیەکی بەو گۆڕانانەوە هەیە کە لەسەرەوە ناویان هات؟ فیمنیزم وەك بزاڤێکی کۆمەڵایەتی و هزری لە فراوانترین مانایدا لە هەوڵی بەرزکردنی پێگەی ژناندایە وەك گروپێك لە کۆمەڵگەدا. چاوەڕێ لە فیمنیزمیش دەکرێت وەکو هەر بزاڤێکی کۆمەڵایەتی و هزری پێگەی نزمی ئەو گروپە ـ واتە ژنان ـ ڕاڤە بکات و هۆو فاکتەرە کاریگەرەکان لەسەر ئەم ڕەوشە ڕوونبکاتەوە، وێنەیەکی ئەو کۆمەڵگا خوازراوەی کە تیایدا ژنان بەهرەمەندن لە ڕەوشێکی گونجاو، بخاتەڕوو، کۆمەڵە داواکارییەك بۆ گەیشتن بەم ئامانجەی بخاتە ناو پرۆگرامەکەی و، دواجار لەگەڵ دیاریکردنی ستراتیژی کارەکەی، سەرچاوەکانی ڕێکبخاتو مۆبالیزەبکات و ئەو شێوازە شەرعی یاخود کاریگەرانەی کە مەبەستینە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی دەستنیشان بکات.

لێرەدا گرنگترین مەسەلە ئەوەیە کە بەخستنەڕووی ئەم بابەتانەی کە تاڕادەیەك بابەتیترو دیارترن، واتە ئەو کاتەی لە پێناسەی گشتی فیمنیزم دەردەچینو بەرەو پێناسەیەکی وردتر هەنگاو دەنێین، تێدەگەین لە بنچینەدا ئێمە لەگەڵ یەك "فیمنیزم"دا ڕووبەڕوو نین. بەدرێژایی زێتر لەو سەدو پەنجا ساڵەی بەسەر دەسپێکی بزاڤی ژنان و زێتر لە سەدەیەك کە بەسەر خستنەڕووی زاراوەی فیمنیزم لە ئاماژەکردنی بەم بزاڤە تێدەپەڕێت، تیۆرگەلێکی جیاوازو هەندێکات ناکۆك لە ڕاڤەی ژێردەستەیی ژنان، تێگەیشتنی جۆراوجۆرو جیاواز لە ڕەوشی خوازراو و نموونەیی بۆ ژنان و گشت

کۆمەڵگا، پرۆگرامگەلێکی جیاجیاو هەندێکات دژیەك لە بزاڤدا و، ئەو شێوازو ڕێگایانەی بۆ گەیشتن بە ئەنجامەکان جەختیان لەسەر کراوەتەوە.

لە تیۆردانەریی فیمینیستیدا هەندێکات لە جیاوازیە فیسیۆلۆجیو ئیکۆلۆجییەکاندا (دەسەڵاتخوازی زاتی پیاوان، توانای تایبەتی ژنان لە وەچەخستنەوە، ستەمی زۆرتری فیزیکی پیاوان...) بەدوای رەگوریشەی ژێردەستەیی ژناندا گەڕاون. هەندێکات جەخت کراوەتە سەر پێکهاتەی ئەم جیاوازییانە لەگەڵ زەرورەتە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا (وەك بایەخی کۆمەڵایەتی راو هاوکات لەگەڵ بەڕاوچیبوونی پیاوانو بوونی ژنان بەکۆکەرەوەی میوەو خۆراك لەبەر سکپڕی ژنان و دواتریش کەمی توانای ژنان بەهۆی غارنەدانیان هێندەی پیاوان)، هەندێکاتیش بەدوای رەگوریشەکانیدا گەڕاون لەنێو دامەزراوە تایبەتییە کۆمەڵایەتییەکانی وەك سەرهەڵدانی کشتوکاڵ، هیرارکییەتی کۆمەڵایەتی، موڵکییەتی تایبەتیو چینەکان، دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتی، دەوڵەت، سەرمایەداریو... هەندێجاریش جەخت لەسەر شێوەبەندییە گوتاری و کولتوورییەکان کراوەتەوە، هەندێکاتیش لە بنچینەدا جۆرە سستەمێکی دوالیزمی دەسەڵات بەشێوەی ئاماژە پێکراوی دەخرایە ڕوو کە لەم سستەمدا ژنان لە کایەگەلێکدا ژێردەستو هەندێ کایەی دیکەدا سەردەستن.

فیمنیزم هەندێکات وەك خەبات بۆ مافە یەکسانەکانی ژنان لەگەڵ پیاوان لە ئارادا بووە (لە فیمنیزمی لیبڕالدا)، هەندێجاریش جەخت لەسەر باشتری ژنان لە پیاوان (نەك لە ڕووی یاسایی و لە واقعی کۆمەڵایەتیدا، بەڵکو لەڕووی ئەخلاقییەوە) کراوە (لە هەندێك لقی فیمنیزمی رادیکال)، هەندێجار جیاوازی ژنو پیاوی کردووە بەخاڵی دەستپێکی بزاڤەکەی (لە فیمنیزمی کۆمەڵایەتیدا) و، هەندێجاریش لەبنەڕەتدا ژنو پیاو، ژنایەتیو پیاوەتی، بەهەندێ شتی ناجەوهەری یاخود بەرهەمی کۆمەڵگای ناساندوون (لە فیمنیزمی پۆست مۆدێرندا).

سەردەمایەك، پارومەتری فیمنیزم چالاکی سیاسی نادامەزراوی لە شێوەی خۆپیشاندان و مانگرتن دا بووە، لە هەندێك حاڵەتدا لە چوارچێوەی سیاسەتی ڕۆژانەو دامەزراودا



کاری کردووەو، سەرەنجام بەتایبەتی لە دوو دەیەی کۆتایی، زێتر لەهەر شتێك بەرەو خەباتی کولتووری و گوتاری لە چوارچێوەی تیۆریستی کۆمەڵایەتیدا بزاڤی کردووە.

سەرەڕای ئەوە، ئەوانەی بانگەوازیان بۆ ئەم بزاڤ و بیرو هزرانە کردووە، نەتەنیا ئەو فیمینیستانە نەبوون کە هەم خۆیان بە فیمنیزم لەقەڵەم دەداو هەمیش لە بزاڤی ژناندا وەك فیمینیست ناسراون، بەڵکو لەسەرووی ئەمەوە تێگەیشتنگەلێکی جیاواز لەلایەن ژنان ـ و هەندێکات هەندێ پیاوـ خراونەتە ڕوو کە لە هەندێ باردا ئەوان خۆیان بە فیمینیست لە قەڵەم نەداوە، بەڵام ئەوانی دیکە ئەوانیان بە فیمینیست ناوبردوون، یاخود خۆیان بە فیمینیست زانیوە و ئەوانی دیکە وەك فیمینیست سەیری ئەوانیان نەکردووە.

بەدەربڕینێکی تر، ئێمە لەگەڵ "شتێکی" روون و دیاری وەك فیمنیزم رووبەڕووین کە بتوانین بەئاسانیو بەشێوەیەکی سادە پەسەند یاخود ڕەتی بکەین. لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ فیمنیزمدا (وەك گوتە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە) دەبێت خۆمان لە بەیەکپارچە لەقەڵەم دانی دووربگرین، وەرچەرخان و جۆراوجۆریە زەمەنی ـ مێژوویی و شوێنی جوگرافیاییەکەی بناسینو سەرنج لە بوونی تێگەیشتنو راڤە جیاجیاکانی بدەین.

بەم شێوەیە، ئەگەر بمانەوێت لە کۆمەڵگەکەماندا بەتێگەیشتنێکی بە ئینسافو هەرچەند رەخنەگرانە لە فیمنیزم بگەین، پێویستە سەرەتا لە فۆرمۆڵەبوونو گەشەسەندنی مێژوویی فیمنیزم تێبگەین، زەمینەو هۆکارە مێژووییەکانی فۆرمۆڵەبوونو وەرچەرخانەکەی بناسین، لە مانا جیاوازەکانی تێبگەین. ئەم کتێبە هەوڵێکە بەئاراستەی گەیشتن بەوجۆرە زانینە. بەڵگەی سەرەکی کتێبەکە ئەوەیە کە لە ناسینی زەمینەکانی دروستبوون و وەرچەرخانەکانی فیمنیزم، پێویستە سەرنج لە کۆمەڵە هۆکارێکی گوتاری، ئابووریو سیاسی بدەین. ئەم هۆکارانە بەشێوەیەکی تایبەتی لە کۆمەڵگای ڕۆژئاواییدا بریتین لە گوتاری مۆدێرنیتە (وەك کۆمەڵێك بیروباوەر، چەمك و ئەو شێوازانەی لە سەردەمی رۆشنگەرییەوە بەجەخت کردن لەسەر پرەنسیپەکانی وەك هیومانیزم، ئەقلانیەت، یەکسانی، تاککەرایی... لە رۆژئاوا





فۆرمۆلەبوونو بەشێوەیەکی دژانە گۆڕان بۆ گوتارەکانی هەژموونی و دژە هەژموونی)، بونیادی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی سەرمایەداری (وەك سستەمێکی پشت ئەستوور بە موڵکیەتی تایبەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان هاوکات لەگەڵ هێزی کاری ئازادی حەقدەست وەرگر کە تیایدا ئامانج لە بەرهەمهێنانی ئابووری بردنە سەرەوەی قازانجە)، و دەوڵەتی لیبرال (وەك سیمای سیاسی سەرەکی لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا هاوکات لەگەڵ ڕێزگرتن لە ئازادیە تاکەکەسیو کۆمەڵایەتییەکان).

ئەم هۆکارانە لەلایەکەوە زەمینەیان بۆ فۆرمۆلەبوونی بزاڤی ژنان/ فیمنیزم ڕەخساندو لەلایەکی دیکەوە، دوای فۆرمۆلەبوونی بزاڤ، کارلێکی نێوان بزاڤی ژنانو بزاڤ و گوتارەکانی دیکە (هەژموونی و دژەهەژموونی) لەلایەکەوەو دەوڵەت لەلایەکی دیکەوە، بەرەو بێبزاوتی ڕێژەیی بزاڤ (بەمانای کەمبوونی چالاکییەکانی پەیڕەوانی بزاڤ لە کردە بەکۆمەڵە نابڕازیبوونییەکان لە دەرەوەی دامەزراوەکانو کەناڵە ئاساییە سیاسییەکان) چوو و فیمنیزم زێتر بەرەو بەرهەمهێنانی تیۆری کۆمەڵایەتی (واتە کۆمەڵێکی تاڕادەیەك ڕێکخراو لەو چەمك و گوزارانەی کە سەرەڕای بانگەشەی ڕوونکردنەوەی ڕاستی دەرەکی، هەروەها لە هەوڵی گۆڕینیشی دان) بردووە.

هێلکاری یەکەم (بڕوانە پاشکۆ) مۆدێلی تیۆری بەکارهێنراو لەم کتێبەدا بۆ ڕوونکردنەوەی فیمنیزم و گۆڕانەکانی پیشاندەدات.

بەو هیوایەی بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە بتوانێت هەنگاوێك بێت هەرچەند بچووکیش بەمەبەستی زۆربوونی زانستی ئەوانەی حەزیان لە لێکۆڵینەوەی بزاڤەکانو تیۆرە کۆمەڵایەتییەکانو بەشێوەیەکی تایبەتی بزاڤی ژنانو فیمنیزم هەیە و، زەمینە بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی ڕەخنە زاناترو قووڵترەکان لەمەڕ ئەم بزاڤە برەخسێنێت.

## بەشی یەکەم

## زەمینەکانی سەرهەڵدانی فیمنیزم لە ڕۆژئاوا

### پێشەکی

فیمنیزم چ وەك بزاڤێکی کۆمەڵایەتیو چ وەك کۆمەڵە بیرو هزرێك کە شەرعیەت بەو بزاڤە دەبەخشێت، نموونەی کردەیەکی بەکۆمەڵە، ئەگەر ئەوە پەسەند بکەین کە پێشمەرجی دروست بوونی کردەی بە کۆمەڵ بەنێوی گروپێکی کۆمەڵایەتی تایبەت، هەستکردنە بەبوونی ناسنامەیەکی هاوبەشو هەستی یەکێتییە لەگەڵ ئەو ناسنامەیە، پێویستە بزانین ئەو هۆکارانە چی بوون ئەم هەستە ناسنامەییەیان لەنێو ژناندا دروست کرد. ڕەگەزیش وەکو نەتەوە، نەژاد، ڕەنگو... لە بناغە سەرەتاکانی ناسنامەبەخشین لەقەڵەم دەدرێت. بەڵام ئەم بناغە سەرەتاییە ناسنامەیەکی ئەکتیڤ فۆرمۆڵە ناکاتو بەدەستەواژەیەکی دیکە، "ناسنامەی بەکۆمەڵ وەك ژن" - بەچاوپۆشین لەوەی ژنان بەشێوەی تاکتاکە، خۆیان وەك ژن دەناسێنن - لە هەموو هەلومەرجێکدا دروست نابێتو سەقامگیربوون لە خالێکی بەیەکگەیشتنی مێژوویی دا[1] بۆ دروستبوونی ئەم ناسنامە هاوبەشە پێویستە.

بەسەرنجدان لەوەی ژنان بەپێچەوانەی زۆربەی گروپە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە کە پشت دەبەستن بەناسنامە سەرەتاییەکان لە جۆری دابڕانە کۆمەڵایەتییە سەرەکیو لاوەکییەکان دەکەونە هەردوو لای ئەم کەلێنانە - لە چینە سەردەستو ژێر دەستەکان، نەژادە جیاوازەکان، نەتەوە جیاجیاکان، ئایینە جیاوازەکان، شارو گوندەکانو... هتد-



سەرەڕای تایبەتمەندیە هاوبەشەکان لە گروپە جیاوازەکاندا "پۆلێن" کراونو وابەستەییە جیاوازەکان لێك جیادەکەنەوە[2]، فۆرمۆلەبوونی ناسنامەی بەکۆمەڵی ئەکتیڤ لەنێویاندا زەحمەتتر بەئەنجام دەگات. بەدەربڕینێکی دیکە، وابەستەییە جیاوازەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسیو...لەتەك وابەستەیی بە ڕەگەزی مێ ڕێگرە لەبەردەم ئەوەی ناسنامەی ژنانە بەئاسانی دروست ببێت، بەگوتەی ئالیس ڕۆسی[3] "نایەکسانی پشت ئەستۆر بەرەگەز تاکە حاڵەتێکە کە تیایدا نوێنەرانی گروپە نایەکسانەکان لە کۆمەڵدا دڵسۆزترن لەگەڵ یەکتر تاکو لەگەڵ ئەندامانی گروپەکەیان).[4]

ئەوەی زێتر لە هەر شتێك ناسنامەیەکی زەمینەسازی کردەی بە کۆمەڵ و پراگماتیزمی کۆمەڵایەتی فۆرمۆڵە دەکات، بوونی شوێنگە زەینیو بابەتییە دژەکانە. دژایەتی نێوان ڕەگەزە جیاوازەکان شوێنگەی بابەتیی تاکەکانو هەروەها دژایەتی نێوان شوێنگەی بابەتیو ڕەگەزە زەینییەکانی تاکەکەسی، زەمینەیەکی ناڕەزایی دروست دەکات کە هەمیشە بۆ ئەو تاکانەی کۆمەڵێکی تایبەتیان پێکهێناوە دێتە پێشەوە ـ ئەو تاکەکەسانەی لەسەر بنچینەی وابەستەییە سەرەتایی یاخود لاوەکییەکان کۆمەڵ یاخود گروپێك پێکدەهێنن ـ زەمینەی کردە دەرەخسێنێت[5]. دەربڕینی من لێرەدا ئەوەیە کە هەستی کۆمەڵبوون واتە فۆرمۆڵەبوونی ناسنامەیەك، دوای ناڕەزاییەکی هاوبەش یاخود لە ڕاستیدا کۆمەڵێکی هێزەکی (بالقوە) ـ بەمانای ئەو تاکانەی هەندێك تایبەتمەندیو ئەرکی هاوشێوەو هاوبەشیان هەیە ـ لەسەر بنچینەی ناڕەزاییەك کە لەم ناکۆکیانەوە سەرهەڵدەدات دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵێکی بکەر واتە ناسنامەیەکی ئەکتیڤ بەدەست دێنێت.

ئامانجی ئەم بەشە ئەوەیە کە لە زەمینەی دەرکەوتنی ناسنامەی بەکۆمەڵی ژنان هەروەها بەدوای ئەویشدا لە سەرهەڵدانی فیمنیزم لە هەلومەرجی زەینیو بابەتی سەدەی نۆزدەدا بکۆڵێتەوە. وادێتە بەرچاو کە دەشێ لە گوتاری مۆدێرنیتەدا[6]، تایبەتمەندییەکانی سستەمی سەرمایەداریو کاریگەرییەکانی لەسەر ژیانی





کۆمەڵایەتی‌و پێگەی ژنان لە چوارچێوەی دەوڵەتی لیبرال ـ دیمۆکراتدا بەدوای زەمینە سەرەکیەکانیدا بگەڕێین.

**گوتاری مۆدێرنیتەو ڕێگەخۆشکردنی هزری بۆ بزاڤی ژنان**

بەپێی پێناسەی ڤێبەر، نەریتخوازی بریتیە: لە "کۆمەڵە هەڵوێستو تێڕوانینێکی زەینی بۆ کارە ئاساییە ڕۆژانەییەکان... باوەڕکردن بەشتی ڕۆژانەی ئاسایی وەك نۆرمێك *کە ناکرێ لە رەفتار لابدات*"[٧] لە چوارچێوەی ئەو بیرکردنەوەیەدا ئەو تێگەیشتنە هەیە، کە جیهان لەوەتەی هەیە بەم شێوەیە بووەو تاهەشە بەم جۆرە دەبێت‌و وێڕای ئەوەی تاکەکان لەم سستەمەدا جۆرێك لە "دووبارە بیرکردنەوە"یان لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە. بەڵام ئەم سستەمە پیرۆزیەکی هەبوو کە بەرەوای نەدەزانی تێکبشکێنرێت، رابردوو مایەی شانازی بوو سیمبولەکانی رابردوو بەرێزبوون، چونکە وەکو هەڵگرو رەنگدانەوەی ئەزموونی نەوەکان سەیر دەکراو رەوشی ئێستا بەگەڕانەوەی بۆ رابردوو مانای وەردەگرت.[٨]

بەهەمان ئەو شێوەیەی لەم سستەمەدا، هەژارەکان هەژاری خۆیان، ژێردەستەکان ژێردەستی خۆیان‌و گەورەکان‌و دەسەڵاتداران شوێنگەی خۆیان بەسروشتی دەبینی، ژنانیش دایکایەتی، باڵادەستی پیاو، گوێڕایەڵی لەو ... بەسروشتی لەقەڵەم دەداو پاساویان بۆ دەهێنایەوە.. بەم شێوەیە جگە لە چەند حاڵەتێکی ریزپەڕ، لەحاڵەتی ئاساییدا، ئەم پەیوەندیانە و ئەو سستەمەی لێیان دەکەوتەوە نەدەچووە ژێر پرسیارەوە، تەنیا لەو هەلومەرجانەدا کە گوشار لەسەر گروپە ژێردەستەکان لە رادەی ئاسایی و "پاساو بۆهێنانەوە" تێدەپەڕی، دەیتوانی راپەڕینە پچڕپچڕەکان بەئامانجی سنووردارەوە ـ و بەزۆری بەگەڕانەوە بۆ هەلومەرجی "گونجاو"ی جاران ـ هەڵگیرسێنێت، ژنانیش بەگشتی رەوشی خۆیان پەسەنددەکرد. هەڵبەت کردە تاکەکەسییەکانی هەندێك ژن کە بە"سەرکێش"، "بەدڕەوشت" و... سەیریان دەکرا، هەندێجار بەمانای سەرپێچییە تاکەکەسییەکان بوون لە دژی ئەو پەیوەندیانەی بەرەوا نەدەزانران. بەڵام بەسەرنجدان لەوەی بەدەگمەن ژنان وەك کۆمەڵێك، لەگەڵ زۆربوونی هاوکاتی گوشاری پیاوان لەسەر



خۆیان رووبەڕوودەبوونەوەو پەرتەوازەبوونیان لە دوولای کەلێنە جیاجیایە کۆمەڵایەتییەکان دەبووە رێگر لەبەردەم دروستبوونی ناسنامەیەکی بەکۆمەڵ تیایاندا، هەروەها کردەیەکی بەکۆمەڵیش نەبوو لەدژی پیاوان/ یاخود کەسەکان، گروپەکان‌و یان دامەزراوە بەرپرسەکان لە رەوشی تایبەتی ژنان. بەدەربڕینی گیدێنز "هەردوو رەگەز لە بەشی هەرە زۆری مێژووی مرۆڤایەتیدا، باوکسالاریان پەسەند کردبوو".[٩]

بەڵام سەرهەڵدانی بیروبۆچوونەکانی سەردەمی مۆدێرنیتەو رۆشنگەری ـ چ بە رێگە خۆشکەری سەرمایەداری لەقەڵەمیان بدەین، یان بڵێین لە پێویستییەکانی ئەم سەردەمە سەریانهەڵدا یاخود بەشێوەیەکی پەسەندتر، لە مامەڵەو پەیوەندی بەرامبەرو هەندێ کات کەم تا زۆر وەزیفی لەگەڵ سەرمایەداریدا سەیریان بکەین ـ بەمانای دابڕان بوو لە رابردوو.

مۆدێرنیتە وەك "پەیکەربەندییەکی ئایدیۆلۆژی ـ کولتووری" دابڕانی لەگەڵ هەموو جۆرە تێگەیشتنێکی رەهاگەرایانەو فەرمانئامێزانە دروست دەکرد.[١٠] مرۆڤتەوەری‌و عەقڵانییەتی مۆدێرن، خۆبەدەستەوەدان، ملکەچی، پەسەندکردنی بێ ئەملاو ئەولا و، سەقامگیری ژیانی نەریتی پسەند نەدەکرد و، گۆرانکاری لە هەموو رەهەندەکانی ژیانی تاکەکەسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی لەتەك گۆڕینی سروشت‌و زێدەکردنی توانا سروشتییەکانی بەرێگەپێدراو و تەنانەت پێویست لەقەڵەم دەدا.[١١] خێرایی گۆڕان‌و پانتاییەکەی ـ لە ئەنجامی ئەم گۆڕانە لە جیهانبینی مرۆڤدا ـ رەهەندگەلێکی بێ پێشینەی وەرگرت. "نەخشەسازی مرۆیی" و لە کۆتایشدا گۆڕان‌و کۆنترۆڵی سروشت‌و هەروەها کۆمەڵگا، بەشێك بوو لە "پرۆگرامی" مۆدێرنیتەو سەرتاپاگیرکردنی بەسەر کۆمەڵگادا بەمانای بردنە ژێر پرسیاری هەموو "دراوە کۆمەڵایەتییەکان"[١٢] دەژمێردرا. بەگوتەی کۆلب:

> ئێمە [لەجیهانی مۆدێرندا] خوازیاری پلەیەکی دەسەڵاتین بەسەر جیهانی فیزیاییدا کە کۆمەڵگاکانی پێش ئێمە ئەو دەسەڵاتەیان نەبوو... دیکارت لە گوتارێکدا لەمەڕ میتۆد گوتی: ئێمە دەبینە خاوەن‌و گەورەی زەوی‌و تەنانەت





ئەو کاتەی بڕیار دەدەین کایەیەك هەتاهەتایە بەدەستپێنەگەیشتوویی بمێنێتەوە دیسان ویستو کۆنترۆڵی خۆمانی بەسەردا پیادەدەکەین... لە ئاستی ژیانی کۆمەڵایەتیشدا هەوڵدەدەین پلان دابنێینو بیگۆڕین.. [لە سەردەمی مۆدێرن] هەموو شتێك لە دەوروبەری خۆمان وەك بابەتێك کە دەشێ پلانی بۆ دابنێینو کۆنترۆڵی بکەین تەماشای دەکەین.[١٣]

ئەگەر لە ژیانی نەریتیدا پایەی هەر تاکێك لە هەرەمی کۆمەڵایەتیداو تارادەیەك نەگۆڕانەکەی، وەك شتێکی ئاسایی‌و پاساو بۆهێنراو پەسەند بکرێت، چیتر بەراست لەقەڵەم دان یاخود پاساوی نەریتی ڕەفتارەکان، بارودۆخەکان، پایە تاکەکەسی‌و کۆمەڵایەتییەکان، پەیوەندییەکانی دەسەڵات لەناوەوەو لەنێوان دامەزراوەکانداو لەنێوان تاکەکان لە ڕۆڵی جیاوازدا، بانگەشەکانی دەسەڵاتو بەشەرعی زانینیانو... لە"گوتاری مۆدێرندا" شوێنێکیان نەبوو. "مرۆڤ"و ئەقڵی مرۆیی بۆن بەتەوەری دەستنیشانکردنی دووبارەی پلەوپایەکان، جۆری پەیوەندییەکان، هێزی تاکەکانو دامەزراوەکان. "پێداچوونەوە" کە بەدەربڕینی گیدێنز بە تایبەتمەندی سەردەمی مۆدێرنیتە لەقەڵەم دەدرێت بەمانای چاودێری بەردەوام بوو بەسەر دامەزراوەکان، پەیوەندییەکانو... لەسەر بنچینەی ئەوە، دەبوو هەموو کایەکانی ژیان لەلایەن بکەرە هەڵبژێراوەکان دروست بکرابانەوە.[١٤]

لەڕووی ئەپستمۆلۆجییەوە، لەگەڵ باڵادەستبوونی وتاری زانستی مۆدێرن، ئەم گریمانەیە پەرەی سەند کەوا "پەسەندکردنی هەر شتێك وەك ڕاستی، نادادپەروەرانەیە مەگەر ئەوەی بتوانن بیسەلمێنن، ئەمەش تەنیا لەدوای وردکردنەوەی زانیارییەکان بۆ چەندین بەشو تێپەڕینی قۆناغ بەقۆناغ بەشێوەیەکی ڕێکوپێكو ئەقلانی دەکرێ بەمەعریفەی قیاسی‌و تەنانەت ئالۆزترین ڕەهەندەکانی زانستی ـ بەچاوپۆشی لەوەی تا چ ڕادەیەك نەریتی یاخود چەسپاو بەرچاو دەکەوێت ـ بگەین.[١٥]

لەبەرامبەردا، هەڵبەت ئەم مەسەلەیە دێتە پێش کە ناتوانین ئەوەی بەدرێژایی مێژوو وەك خۆڕسکی ژن، سروشتی ژنانە، ژێردەستییەکەی، دەسەڵاتی پیاو، نموونەی ژنی



باشو... جەختی لەسەر کراوەتەوە، بێ ئەملاو ئەولا پەسەند بکەین. لێکۆڵینەوە مۆدێرنەکانی مێژوویی‌و مرۆڤناسی سەدەی نۆزدەیەم لەبارەی کۆمەڵگا مێژوویی‌و هاوچەرخە جیاجیاکان ئەوەیان دەرخست کە ژیانی ژنان لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا وەك یەك نەبووەو ژنان لە هەموو شوێنێك ڕۆڵو پێگەی کۆمەڵایەتی هاوشێوەیان نەبووەو نییە، لەوانەیە ئەوەی لە کۆمەڵگایەکدا بۆ ژنان بەناپەسەند بزانرێت لە کۆمەڵگایەکی دیکەدا بەها یاخود شتێکی پێویست بێت و بەپێچەوانەوە، لەئەنجامدا ناکرێت یاسایەکی گشتی لەبارەی هەلومەرجی ئافرەتان دەربکرێتو هەمان ئەو لێکۆڵینەوانە، بۆن بەپێگەیەك بۆ ئەوەی "جۆن ستیوارت میل" بە"دەستکردیبوون"ی ژنایەتی‌و نووسەرە هاوچەرخەکانیش "بونیادنانی"[١٦] ناودەنێن. سەرەڕای ئەوە، زانست کە بڕیاربوو بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی سروشت بخرێتەگەڕ، تەنانەت لە توانای دابوو ڕۆڵە "سروشتی" یەکانو ئەوانەی پشتیان بەتایبەتمەندیە سروشتییەکانیش دەبەست تێکبشکێنێتو لەم ڕێگەیەوە گۆڕان لەوەدا دروست بکات کەبە "هەلومەرجی سروشتی" ژنان دەژمێردرێت.

گوتاری شۆڕشگێڕانەی سەردەمی مۆدێرن بەتایبەتی لە دوو نموونەی گرنگیدا، واتە شۆڕشەکانی ئەمریکاو فەرەنساش دەیانتوانی ڕێگەخۆشکەری بانگەشەی ژنان بن بۆ یەکسانی. چەمکە سەرەتاییەکانی ئەم شۆڕشانە واتە باوەڕهێنان بەو مافانەی مرۆڤ کە ناکرێ لێی بسەنرێن، ڕەتکردنەوەی شەرعیەتی ئەو هیرارکییەتەی بەدەسەڵات پشت ئەستوورە، وابەستەیی شەرعییەتی حکوومەت بە ڕەزامەندی ئەو تاکەکەسانەی فەرمانڕەواییان بەسەردا دەکات، هەموویان دەیانتوانی لەلایەن ژنانەوە پشتگیریان لێ بکرێت.[١٧] باسی ئەوە دەکرا کە پێویستە ژنانیش سوود لە مافەکانی مرۆڤ وەرگرنو باڵادەستی مەدەنی پشت بەرەزامەندی ئەوانیش ببەستێت.[١٨]

تەنانەت گرنگترین ڕەهەندی وەرچەرخانی ئایینی لە سەردەمی مۆدێرندا، واتە ریفۆرمە ئایینەکانو سەرهەڵدانی پرۆتستانتیزم ـ سەرەڕای دەکتۆرینە باوکسالارەکانی ـ باڵادەستی و هیرارکییەتی ڕەتدەکردەوەو جەختی لەسەر تاکەکان (وەك ئەو مرۆڤانەی ـ





بەپیاو و ژنەوە ـ روحی یەکسانیان هەیە) دەکردەوە.[١٩] لە هەندێك لە تایفەکانی ئەم ئایینەشدا بەکردەوە بەشێوەیەکی یەکسانتر مامەڵە لەگەڵ ژنان دەکرا، نموونەی دیاریشیان کۆیکرەکان بوون کە رێبەرەکەیان جۆرج فۆکس.[٢٠] دامەزرێنەری "کۆمەڵەی برادەران"[٢١] خۆیشی لە چالاکییە ئایینییەکاندا بەهرەمەند بوو لە هاوکاری هاوسەرەکەی، رێگەی وتاردانی بەژنان داو پێیوابوو ژنانیش وەك پیاوان "دەبێت خاچ هەڵگرنو لەتەك پیاواندا رۆژانە بەدوای مەسیحەوە (س) هەنگاو بنێن" چونکە ئەوانیش وەکو پیاوان "خزمەتکارانی پەروەردگارن"[٢٢] سەرەڕای ئەوە، سینکلەر پێیوایە پرۆتستانتیزم بەسەرنجدان لە جەوهەرەکەی نەیدەتوانی سنوورێك بۆ باوەڕدارەکانی دابنێت. بەم شێوەیە، پرۆتستانتیزم بەداکۆکی کردن لەسەر تاکایەتی، یەکسانیی مرۆڤەکانو هەروەها نەریتی رەخنەگرتن، رێگەی بۆ رەخنەگری ژنان هەموار کرد.

هیۆمانیزمو ئەقلانیەت کە لەگەڵ باوەڕهێنانیان بەیەکسانی بنەڕەتی تاکەکانی مرۆڤ بەدوور لە پەیوەندی و تایبەمەندییەکانی وابەستەیی نەریتی هاوشان بوون، بەدەربڕینی میشێل[٢٣] بەجۆرێك لە کەسایەتیخوازی[٢٤] دەگەیشتن، واتە جەخت کردنەوە لەسەر ئیعتبارو کەرامەتی تاکەکەسی. ئەو تاکەی دەبێت ئازاد بێت تاکو بەتەکامووڵی خود[٢٥] بگات. هەموو ئەمانە ئەو بابەتە بەمێشکدا دەهێنن کە ژنانیش وەك مرۆڤ بوونەوەری ئەقلانینو "ئیعتبارو کەرامەتی" ئەوان شیاوی بایەخپێدانە، لە مرۆڤبووندا لەگەڵ پیاوان یەکسانو پێویستە هاوشێوەی پیاوان لە ئازادی بەدیهێنانی خودی خۆیان سوودمەندبن.

لە یەکەم سەیرکردندا، دەردەکەوێت پەیڤەکانی man (men) لە زمانی ئینگلیزیدا یاخود (S) homme لە زمانی فەرەنسیدا ناوێکی گشتیە بۆ گشت جۆری مرۆڤ و هەڵبەت ژنانیش دەگرێتەوەو ئەگەر باس لە یەکسانی men دەکرێت، مەبەست لێی ژنانیشنو دوای ئەوەش ئەم یەکسانییە لە سروشتیدا کە لە مافی یەکسان بەهرەمەندن، لە سیاقی باسی زۆر لە نووسەرانی رێنیسانس بەدواوە وا دەردەکەوێت هەندێکیان، لە



دەربڕینی man /homme (پیاو)یان لەبەرچاو گرتووە، بەڵام ئەم شتە نەگشتی بوو و نەك ئەوەی بەشێوەیەکی دیکە تەفسیری بۆ نەکرێت، و لەبەرئەوەی تەنانەت کۆمەڵێك نووسەر لە هەندێك حاڵەتدا بە رۆشنیەك کە نکۆلی لێناکرێت سوودیان لە پەیڤەکانی man یاخود homme بۆ گەڕانەوە بۆ "مرۆڤ" بەچاوپۆشی لەرەگەزەکەی ـ وەرگرت، و لەزۆر باردا بەئاسانی دەکرا بەکارهێنانەکانی دیکەی ئەم پەیڤەش لە مانا گشتییەکەیدا گریمانە بکرێن. هەر لەبەر ئەوەش لەکۆتایەکانی سەدەی حەڤدەیەمەوە ئەم مەسەلەیە کە "ژن بەباشی پیاوە" خرایەڕوو.[٢٦] بەڵام لەهەمان کاتدا هەندێ لە نووسەران وێڕای جەخت کردنیان لەسەر ئازادی، یەکسانی، مافەکانی تاکەکەسو.. هتد، بەڕاشکاوی ئەو پەیڤانەیان تەنیا بۆ پیاوان لەقەڵەم دەدانو ژنیان بەخاوەنی سروشتێکی تایبەتی دەبینی کە پێویستی دەکرد فەزای تایبەتی تەواو ژنانە ـ لە فەزای گشتی ـ تەواو پیاوانە ـ جیابکرێتەوە.

نموونەی دیار ـ و لەلای نووسەرە فیمینیستەکان، نموونەی ریسوا ـ ی ئەم جۆرە هزرەی کۆتایی، دەتوانین لە بیروڕاکانی جان جاك رۆسۆدا ببینین کە ڕاشکاوانە لەو بڕوایەدا بوو "هەستەکانی ژنان لەوە بەهێزترن بەتوانای ئەقلانی پیاوان بگەن"[٢٧] ئەو جەختی لەسەر ئەوەی "ژن بەسروشت لاوازە" کردەوەو لەبەرامبەردا، تەنیا لە هەرەمێك ـ کە بەگوتەی رۆسۆ ئەم هەرەمە بایەخی کەم نییە ـ بەهرەمەندەو ئەویش بریتییە لەوەی کە دەتوانێت "دڵی پیاو بەهەژێنێت".[٢٨] لەبەرئەوەی سەرچاوەی مافە سروشتییەکان بۆ مرۆڤ لەو جیاوازیە دایە کە بەهۆی ئەقڵمەندی، ئەو لە ئاژەڵان جیادەکاتەوەو لەبەرئەوەی گومان لە ئەقلانییەتی ژن هەیە، ناشێ ئەو بەخاوەن ماف لەقەڵەم بدرێت.[٢٩]

بەڵام گرنگترین رەگەزی دەکتۆرینی رۆسۆ لەبارەی ژنان ئەوەیە کە ئەرکی ژن شادکردنی پیاوە. بەدەستەواژەیەکی دیکە، ئەو پێیوایە ئافرەت هۆکارە نەك ئامانج، راشکاوانە لە کتێبی "ئەمیل"دا دەنووسێت: پێویستە هەموو فێرکردنی ژنان بۆ بایەخدان بەپیاوان بێت، پێویستە ئەوان پیاوان رازی بکەن، سوودمەندبن بۆیان، کارێك بکەن کە پیاوان





خۆشیان بوێن‌و ڕێزیان لێ بگرن، لە قۆناغی منداڵییەوە فێر بکرێن، کاتێك گەورە دەبن چاودێڕیان بکەن، ئارامی بەبوونیان ببەخشن‌و ژیانیان بۆ خۆش بکەن ـ ئەوانە ئەرکی ژنانن لە هەموو قۆناغەکانداو دەبێت لەمنداڵییەوە لەم بوارەوە فێر بکرێن.[٣٠]

هەمان جیاوازی "جەوهەری" لەنێوان ژن‌و مێردو قایل بوون بەلایەنی کەرەستەیی بۆ ژن لەلایەن ڕۆسۆ دەبێتە هۆی ئەوەی ڕۆسۆ ژنان بەهاووڵاتی لەقەڵەم نەدات.

هەندێکی دیکەش لە هزرڤانانی سەردەمی ڕۆشنگەری وەکو ڕۆسۆ لەو بڕوایە دا بوون ژنان سروشتێکی جیاواز لە پیاوانیان هەیەو بوونەوەری ڕوحیتر، هەستیارتر، پاکترو ئارامترن لە پیاوان. زۆریان نیگەرانی گەندەڵی‌و ئەخلاقیاتی فەرمانڕەوا بوون بەسەر کۆمەڵگاداو ستایشی ژنانیان دەکرد بەو پێیەی لەو گەندەڵییەدا بێبەریترن.[٣١] وێڕای ئەوەی ئەم هزرە لای ڕۆسۆ بەدوورخستنەوەی ژنان لە فەزای گشتی کۆتایی دەهات، بەڵام دەکرا دەستەواژەیەکی دیکەشی بەسەرنجدان لەوەی فەزای گشتی کایەی ململانێ، پێکدادان، پەیوەندییە دەسەڵاتخوازو نائەخلاقییەکان، ماددەخوازی.. بوو، ژنان بەهاتنە ناویەوە دەیانتوانی، ئەخلاقیتر، بەهاییتر، ئارامترو مەعنەویتری لێبکەن ڕۆمانتیزمی سەدەی نۆزدەش کە بەیەکێك لەدەربڕینەکان، گوتارێکی دژەمۆدێرن بوو، ئەم کاریگەرییەی هەبوو. ڕۆمانتیکەکان ئەوەیان پەسەند دەکرد کە پیاوان جیاوازییان لەگەڵ ژنان هەیە، بەڵام ژنان لە ڕەگەزێکی ناسکترو ئەخلاقیترن، بۆیە هاتنی ژنان بۆ ناو کایەی سیاسەت‌و کۆمەڵگا بەمانای هاتنی ئەخلاقیاتە بۆ ناو ئەو کایەیە.[٣٢]

بەپێی گوتەی ڕۆباتام، هزری یەکسانی ژن‌و مێردو پێویستی سەرنجدان لە ڕەوشی ژنان‌و رزگارکردنیان لە هەڵومەرجی باو لەنێو بیریارانی سەردەمی ڕۆشنگەریشدا ڕەواجی هەبوو، زۆریان لە فەرەنسا، ئینگلتەراو سکۆتلەندا لەو باوەڕەدابوون ئەگەر کەمایەتی‌و ناتەواویەك لە بیرو ڕەفتاری ژندا هەیە، پێویستە بەریفۆرمە کۆمەڵایەتیەکان ئەو کەمایەتییە نەهێڵرێت: پێویستە ژنان بخوێنن‌و هەروەها یاسا نادادپەروەرەکانیش بگۆڕێن تاکو ژنان خۆیان کامڵ بکەن. لە سەدەی هەژدەیەم "ئەقڵ"و "سروشتی" دوو وشەی سەرەکی هزرڤانە فەرەنسی‌و ئینسکلۆپیدیستەکان بوون‌و سوودیان لەم دوو



وشەیە وەردەگرت بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو هێزانەی خۆیان حەزیان لێ بوو و هەمان ئەو چەمکانە لە تواناییاندا بوو کاریگەری زۆر بکەنە سەر هزری رزگاری ژنان.[٣٣] ئەوان لەو بڕوایەدا بوون بەپشت بەستن بەئەقڵ‌و چاودێریکردنی، دەتوانن یاسا فەرمانڕواکان بەسەر سروشتی مرۆیی بدۆزنەوە، بەدەربڕینی بۆلا: "ئەوان بەبێ ئەوەی بیانەوێ شۆڕشگێر بن دەکەوتنە دژایەتی لەگەڵ زۆر لە دامەزراوە جێگیرەکان کە بەبۆچوونی ئەوان هیچ بەڵگەیەکی واقعی بۆ بوونی ئەوان نەبوو و پێچەوانەی یاسای سروشتی بوون‌و پێویست بوو کۆمەڵگا لەو ناوە هەڵیانگرێت"[٣٤] فەیلەسووفە فەرەنسیەکان[٣٥] پشتگیریان لەوە دەکرد کە ژنان کەموکووڕیان هەیە، بەڵام ئەو کەموکووڕییانەیان نەدەگەڕاندنەوە بۆ یاسای سروشت بەڵکو لەو بڕوایەدابوون ئەم خەسڵەتانە بەدەستهێنراون‌و ئەنجامی هەلومەرجی ژیانی ئەوانن. کەواتە ئەگەر هەلومەرج بگۆڕێت، کەموکوڕییەکانی ژنان لە ریشەوە دەدرێن. بۆیە پێویستە ژنان پەرە بەتوانا زەینییەکانی خۆیان بدەن‌و تەنیا لە ڕێگەی ڕۆشنگەری بەدەستهێنانی زانینەوەیە کە ئەوان دەتوانن ببنە خاوەنی فەزیلەتی باشتر، ڤۆلتێر نادادپەروەری سەبارەت بەژنان ریسوا دەکات، دیدرۆ لەوبڕوایەدابوو سەرەکیترین هۆکاری ژێر دەستی ژنان، کۆمەڵگایە، و مارکی دو کوندرسێ بە ڕاشکاوی ئەوەی خستەڕوو کە: "دەبێت مافە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییە یەکسانەکان بەئافرەتان ببەخشرێن" فەیلەسووفانی ڕۆشنگەری لە ئەڵمانیاش جەختیان لەسەر خۆسەلماندن[٣٦] لە ڕێگەی گەشانەوەی هێزەکی (بالقوە) کەسایەتی هێزەکی (بالقوەی) مرۆیی دەکردەوە. بەڵگەی ئەوان ئەوە بوو کە ئەگەر بکرێ "خود" بەسەر جۆری مرۆڤ لە ژن‌و پیاودا بگشتێنین پێویستە ژنانیش توانای بەدیهێنانی ئەو بەدەست بهێنن، کەواتە پێویستە "بخوێنن"و "پەرە بەئەقڵانییەتی خۆیان بدەن" لە ئینگلتەرا داڤید هیۆم[٣٧] (ملکەچی ژن)ی بە خەسڵەتی کۆمەڵگا بەربەرەکان لەقەڵەم داو ویلیام وۆلاستۆن[٣٨] بەرەخنەگرتن لە پایەی نزمی ژنان لە خێزانەکاندا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە هاوسەرێتی تەنیا بۆ زیادکردنی جۆری مرۆڤ نییەو دەبێت لەسەر بنچینەی گونجان‌و تەبایی بەرامبەری دوو لایەنەکە دروست ببێت.[٣٩]





"تۆم پین" هزرڤانی ئەمریکی بەڕەگەز ئینگلیز ئامانج لە یەکێتی مرۆڤەکانی لە کۆمەڵگادا بە((پاراستنی مافە سروشتی، مەدەنیو سیاسییەکانی ئەوانی)) لەقەڵەم دەدا[٤٠]. خوازیاری پەرەپێدانی ئەو مافانە بوو بۆ ژنانو رەوشی ژنانی تەنانەت لەو وڵاتانەشدا کە وەکو بەرچاو دەکەوێت ژنان تیایاندا بەختەوەرن، مەحکوم دەکرد.

خودی ژنانیش بەرەبەرە لەژێر کاریگەری ئەم گوتارە نوێیە، یەکسانی مرۆییو لەئەنجامدا جەختیان لەسەر پێویستی یەکسانی مافەکانیان لەگەڵ پیاوان کردەوە. مادام رۆلان[٤١] و ئۆلامپ دوگۆژ[٤٢] لە شۆڕشی فەرەنسادا خوازیاری مافەکانی ژنان بوون. مادموزال دوگۆرانی[٤٣] لە قوتابیانی دیکارت لە کتێبی یەکسانی ژنانو پیاواندا[٤٤] ئەم بڕوایەی خستەڕوو کە سووکی کچان لە خوێندنی سنووردارتری ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێت نەك ژێردەستی زاتیی یاخود سروشتی ئەوان. لە ئینگلتەرا کاترین ماکئۆلی[٤٥] ساڵی ١٧٩٠ رایگەیاند کۆمەڵگا، بەرپرسە لە" کەمایەتییە کەسایەتیو خاڵە لاوازەکانی ژنان"[٤٦] لە ئەمریکای تازە سەربەخۆبوودا، ئەبیگایل ئادەمز[٤٧] هاوسەری جۆن ئادەمز یەکێك لە رێبەرانی سەربەخۆیی ئەمریکاو دووەمین سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتە، ئەو کاتەی هاوسەرەکەی نووسەری رەشنووسی دەستووری وڵاتە یەکگرتووەکان بوو، ساڵی ١٧٧٧ داوای لە هاوسەرەکەی کرد لە دانانی یاساکاندا سەرنج لە رەوشی ژنان بداتەوە. ئەو بەپشتبەستن بە نیگەرانی هزرڤانە سیاسیە مۆدێرنەکان لە کۆبوونەوەی دەسەڵات لە دەستی کەسێکدا، لەوەی کە "دەسەڵاتێکی بێ سنوور بکەیتە دەستی مێردەکان" نیگەرانی خۆی پیشانداو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە "هەموو پیاوەکان ئەگەر لە توانایان دا بێت دەبنە زۆردار" و "هاوڕەگەزانی مێردەکەی ناوبردن بەوەی کە بەسروشت زۆردارن".[٤٨]

"جودیت سارجێنت موری"[٤٩] ئەمریکی ساڵی ١٧٨٢ لە وتارێکدا نووسی:

ئایا (کارێکی) ئاقڵانەیە وابیربکەینەوە سروشت لە دابەشکردنی "بەهرەکانی" خۆی بەم شێوە لایەنگرانەیە کاردەکات؟ ئایا ئەوە راستە کە سروشت باڵادەستییەکی هزری گومان لێنەکراوی بەنیوەی جۆری مرۆڤ



بەخشیوە؟... دەشێ ئەو پرسیارە بکرێت کە ئەم باڵادەستییە لە ئامادەیی دیاریکەری روح "لە هێزی هەڵسەنگاندن"دا لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ ئایا ناکرێ سەرچاوەکەی لە جیاوازی خوێندنەکانو بەردەوامی ئیمتیازەکاندا ببینینەوە؟[٥٠]

بەم شێوەیە، موریش وەکو زۆر لە هزرڤانانی سەردەمی رۆشنگەری رەگوڕیشەی جیاوازی نێوان ژنانو پیاوانو ئەوەی (باشتری) پیاوان دەهێنێتە ئاراوە بۆ جیاوازییە سروشتییەکان ناگەڕێنێتەوە، بەڵکو ئەو جیاوازیە لە نەگەیشتنی ژنان بەخوێندنی یەکساندا دەبینێتەوە.

بەڵام بێ دوودڵی گرنگترینو سستەماتیکترین هەوڵی ژنان بۆ رەخنەگرتن لە هەلومەرجی هەبیو خستنەڕووی ئەو مافەی دەیانەوێت، دەبێت لە کتێبی بەرگریکردن لەمافەکانی ژنان[٥١] بەرهەمی "ماری وۆلستۆن کرافت"ی ئینگلیزدا، بدۆزینەوە کە بە"یەکەمین راگەیاندنی گەورەی فیمینیستی بەزمانی ئینگلیزی" دادەنرێتو بەزۆری لە نووسینی مێژووی فیمنیزمدا ئەو بەخاڵی دەسپێکی ئەم هزرە دەژمێرن[٥٢] یاخود تەنانەت وەکو ئینجیلی فیمنیزم ناوی دەبەن[٥٣].

وۆلستون کرافت لە تیۆری تاکخوازیی سیاسیو کۆمەڵایەتی لۆك بەو جۆرەی کە پەیڕەوە رادیکالو ناڕازییەکانی لە سەدەی هەژدەیەم ـ وەکو تۆماس پین ـ چاکسازیان تیادا ئەنجامدا، لەبارەی مەسەلەی ژنانەوە سوودی وەرگرتو لە هەمان روانگەوە دەگوترێت بەرهەمەکەی "سەرەکیترین هەوڵو پشکێکە (سهم) کە فیمنیزمی تاکخوازانە" لە فۆرمۆلیزەکردنی گوتاری فیمینیستیدا هەیەتی.[٥٤] ئەو بەتوندی لەژێر کاریگەری شۆڕشەکانی فەرەنساو ئەمریکادا بوو، هەوڵیدەدا ئەم دەستەواژەیە کە دەبێت مرۆڤەکان مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان هەبێت ژنانیش بگرێتەوە.

وۆلستۆن کرافت بەشێکی زۆری بەرهەمەکەی تایبەت دەکات بەرەخنەگرتن لە تێڕوانینی سووکئامێزی پیاوان سەبارەت بەژنانو هەروەها ژنان خۆیان ـ لەبەر پەسەند





کردنی پایەی دروستکراو و نزمی خۆیان ـ ئەو نووسەری پارێزگاری ئینگلیز ئەدمۆند بێرک[٥٥]، لەبەر تێگەیشتنە کەرەستەییەکەی لە ژنان "وەك نیشانەی پێویستی پیاوان بۆ ئایدیالێکی ژنانە"و بەئەقلانی نەبینینی ژن تاوانبار دەکات. وۆلستۆن کرافت بەتوندی رەخنە لە رۆسۆش دەگرێت لەبەر تێگەیشتنەکەی لە سروشتی نزمتری ژنو لەبەرامبەردا، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەموو مرۆڤەکان خۆبەخۆ بوونەوەری ئەقلانین کە میراتگری هەندێ مافن، لەوانەش مافی یەکسان سەبارەت بەئازادی. بەدەربڕینی رۆباتام ئەو هزرەی کە "رەگەزی تاکەکەس، مافە مرۆییەکانی ئەو سنووردار دەکات، رەت دەکردەوە"[٥٦]. ئەو مافەکانی مرۆڤی وەك پلەیەك لە ئازادی مەدەنیو ئایینی دەناساند کە لەگەڵ ئازادی هەر تاکێکی دیکە کە هەلومەرجی هاوشێوەی ئەوی هەیە شیاوی بەراوردکردن بێت. ملکەچی کوێرانە رەت دەکاتەوەو لەو بڕوایەدا بوو پێویستە ملکەچی پشت ئەستوور بێت بە بەڵگەهێنانەوەو ئاگاداری لە مافەکانی تاکەکەس. وۆلستۆن کرافت ستایشکاری ئەقڵ ـ واتە رەگەزی گرنگی رۆشنگەری ـ بوو: "ئەقڵ هێزی پێشکەوتنە، یاخود بەدەربڕینێکی باشتر، هێزی دەستنیشانکردنی راستییە. هەر تاکێك لەم گۆشە نیگایەوە خۆی لەخۆیدا جیهانێکە"[٥٧]. لە راستیدا، مکووڕی ئەو لەسەر پەرەپێدانی باوەڕی رۆشنگەری بەئەقڵ وەکو بنەمایەکی رێکخەری هەموو رەهەندەکانی بوونی مرۆییو سەرتاپاگیرییەکەی بوو لەسەر "تاك" نەك "پیاو". بەدەربڕینی ئەو "ئەقڵ "شتێکی" رەگەزی نییە، مەعریفە رەگەزی نییەو، زەینیش رەگەزی نییە"و ئازادی، یەکسانیو ئەقڵ زۆر گرنگترن لە خەسڵەتە رەگەزییەکان، کەواتە ئەگەر وادەردەکەوێت ژنان شتێکیان لە پیاوان کەمترە، لەبەر ئەوەیە کە"پیاوان لەنێوان ئەقڵو ژناندا وەستاون" و بەدرێژایی مێژوو نکۆلیان لە "تێگەیشتنی" ژنان کردووە. ئەو بە ڕاشکاوی نکۆڵی لەوە دەکرد کە ژنان هێزی ناسینیان نەبێت، چونکە بەپەیڕەویکردن لە لۆك، هیچ نرخێکی بۆ بایۆلۆجی دانەدەناو ئەوەی گرنگ بوو لای ئەو خوێندن بوو. ئەو خوازیاری



ئامادەبوونی ژنان بوو لە چالاکیە کۆمەڵایەتییەکاندا: "ژنان دەبێت پزیشكو پەرستاربن ... لە سیاسەت بکۆڵنەوە ... بپەرژێنە سەر هەموو جۆرە کارێکی بازرگانی".[٥٨]

لە سەدەی نۆزدەیەمیشدا، هزری باشکردنی رەوشی ژنان وەکو خۆی لەئارادا بوو. قسەکەرانی زێتری گوتارە مۆدێرنەکان بەتایبەتی لیبراڵو سۆشیالیستەکان، تاڕادەیەك لە رەتکردنەوەی رۆڵی نزمی ژنانو خستنەڕووی راڤە کۆمەڵناسی ـ مێژووییەکان لەبارەی ئەم ژێردەستیو هەروەها پێویستی یەکسانیی ژنو مێرد هاوڕابوون ـ و هەڵبەت ئەوەی سەرنج راکێشە ئەوەیە کە هەندێك لەوان کەوتبوونە ژێر کاریگەری ژنێك لەدەوروبەریان. ویلیام تۆمپسۆن[٥٩] مولکداری ئیرلەندی لەژێر کاریگەری برادەرە سۆشیالیستەکەی خاتوو ئانا وێلەر[٦٠] کە لە کتێبی داواکاری نیوەی جۆری مرۆڤ (١٨٢٥) جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە دەبێت ژنان وەکو پیاوان مافی بەشداریکردن لە ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتی خۆیاندا لەرێگەی پیادەکردنی مافی دەنگدان، هەبێت. ئەو پێیوابوو رزگاری ژنان پەیوەستە بەرێکخستنی دووبارەی ئابووری کۆمەڵگاو لەگەڵ ریفۆرمی کۆمەڵایەتیدایە یەکسانی ژنان بەدەست دێت.[٦١]

لەنێو ژنان خۆشیاندا، بەرەبەرە بەرهەمی زێتر کە هەموویان تاڕادەیەك لەژێر کاریگەری وۆلستۆن کرافت دا بوون بڵاودەبوونەوە. یەکێك لە نموونەکانیان لە ئەمریکا، کتێبی چەند سەرنجێك لەمەڕ مافە راستەقینەکانی ژنان، بەرهەمی هانا مادەر کرۆکێر[٦٢] بوو. ئەو تاڕادەیەك قایل بوو بەجیاوازی نێوان ژنانو پیاوان لەسەر بنچینەی جیاوازییە سروشتییەکان، بەڵام بڕوای بەیەکسانی توانای هزری ئەم دووانە هەبوو، لەو بڕوایەدا بوو دەبێت ژنان بەمافە سەرەکییەکانو ئیعتیباری راستەقینەی خۆیان بگەن.

لە بەرهەمەکانی دیکەی سەدەی نۆزدەیەم کە لە بەرگریکردن لە ژنان نووسران. دەشێ ئاماژە بەکتێبی ژن لە سەدەی نۆزدەیەمدا بەرهەمی مارگرێت فولەر[٦٣] بکەین. ئەم کتێبە هێندەی بەرهەمی وۆلستون کرافت هێرشاویو توند نەبوو رەنگەش هەر لەبەر ئەوە بووبێت پێشوازی زیاتری لێکرا. فولەر پاساوی رزگاری ژنی دەهێنایەوە لەسەر بنچینەی "توانای خوایی"و گەڕاندنەوەی "هەماهەنگی بۆ جیهان"و پێیوابوو "ئەوەی





ژن پێویستییەتی ئەوە نییە وەکو ژنێك کاربکات یاخود فەرمان دەرکات، بەڵکو دەیەوێت ئەو سروشتە بێت کە گەشە دەسەنێت، زەینێك بێت هێزی دەستنیشانکردنی هەیەو روحێك بێت ئازادانەو بێ رێگر بژیت"[٦٤]. لە راستیدا، ئەوەی فولەر جەختی لەسەر دەکاتەوە، یەکێکە لە دەستەواژە گرنگەکانی سەردەمی مۆدێرنیتە واتە رەخساندنی ئەگەری بەدیهاتنی خود بۆ ژنان (وەکو پیاوان).

بێگومان گرنگترین قسەکەری هزری لیبرالی رادیکالی سەدەی نۆزدەیەم کە لە بەرگریکردن لە مافەکانی ژنان قسەی کرد "جۆن ستیوارت میل"ە. تێگەیشتنی ئەو لە ژن دەکەوێتە خاڵی بەرامبەر تێگەیشتنی رۆسۆ. ئەو نوێنەری ئەو هزرەیە کە لەبەرئەوەی گومانی لە ئەقڵانیبوونی ژنان نییە، پێیوایە تەنانەت ئەگەر لەم رووەوە جیاوازییەك لەنێوان ژنانو پیاواندا دەبینرێت لە خوێندنە جیاوازەکانەوە سەرچاوە دەگرێتو بەزاراوەی کۆمەڵناسیی هاوچەرخ هەموو جیاوازییەکان بۆ جیاوازی لە پرۆسەی "بەکۆمەڵایەتیبوون" یاخود "بەکولتووریبوون" دەگەڕێتەوە. میل، کە ئەویش لەژێر کاریگەری هاوسەرەکەی هاریت تایلۆر[٦٥] دایە، بەگشتی "ژنایەتی" بە خاوەنی جەوهەرێکی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم دەدات نەك سروشتیو لێرەشەوە بەیەکسانیو هاوشێوەی مافەکانی ژنو مێرد دەگات. ئەو دەنووسێت:

> ...من لە گۆشەنیگای تێگەیشتنی باو لە زەینییەتی مرۆییدا نکۆلی لەوە دەکەم کە کەسێك جەوهەری دوو رەگەز تا ئەو کاتەی کە لە پەیوەندییە هەنوکەییەکانیدا پێکەوەن بناسێت یاخود بتوانێت بەو ناسینە بگات.. ئەوەی ئێستا بەسروشتی ژن ناودەبرێت شتێکی لەبنەڕەتدا دروستکراوە کە لەئەنجامی سەرکوتکردنی بەشێك لە رەهەندەکان [بوونی مرۆیی] و جوڵاندنی ناسروشتی رەهەندەکانی دیکەدا مومکینە.[٦٦]

بەبۆچوونی میل، ئەوە هەلومەرجی کۆمەڵایەتییە کەسایەتی ژن کە سووکیش دەبێت دەهێنێتە ئاراوە. میل لەو بڕوایەدایە ژنان "بەرهەمی ستەمێکن" کە ستەمیان لێدەکات و ستەمی خوێندنی ڕەسمیو ناڕەسمی لە خزمەتی بەردەوامی ئەو



هەلومەرجەدایە. بەبۆچوونی ئەو، ئەو جیاوازییە زەینیانەی گریمانە دەکرێن لەنێوان ژنانو پیاواندا هەن تەنیا ئەنجامی سروشتی جیاوازی لە خوێندن و هەلومەرجە جیاوازەکانیانە [واتە ژنانو پیاوان] و نیشانەی بوونی هیچ جۆرە جیاوازییەکی بنەڕەتی نییە چ بگات بەوەی پیشاندەری ژێردەستی بنەڕەتی [ژنان] بێت.[٦٧]

لە گوتاری سۆشیالیستیدا وەکو یەکێك لە لقەکانی گوتاری مۆدێرنو هەروەها وەکو هزرێك کە خوازیاری دارشتنو بەدیهێنانی گۆڕانکاری بنەڕەتی کۆمەڵایەتییە، ژنان وەکو یەکێك لە قوربانیانی ستەمی باڵادەستی چینایەتی لەبەرچاو گیران. بەگوتەی میچێل "گرفتی ملکەچی ژنانو پێویستی بۆ ئازادکردنیان هەموو بیریارە گەورەکانی سۆشیالیستی سەدەی نۆزدەیەم درکیان کردبوو [ئەم تێگەیشتنە] بەشێك بوو لە میراتی کلاسیکی بزاڤی شۆڕشگێڕی".[٦٨]

شارل فۆرییێ[٦٩] سۆشیالیستی فەرەنسی ئەو کەسە بوو کە پەیڤی "فیمنیزم"ی داهێنا.[٧٠] هەندێك ئەو "بەگەرموگوڕترینو قسەکەرترین لایەنگری ئازادی ژنان" لە نێو سۆشیالیستە سەرەتاکاندا لەقەڵەم دەدەن. فۆرییێ لە کۆمۆنەکانی هەرەوەزیدا کە لە سەدەی نۆزدەیەم دامەزران، بەکردەوە یەکسانیی تەواوی نێوان ژنانو پیاوانی بەرقەرار کرد. لەم کۆمۆنانەدا ژنان لەڕووی ئابوورییەوە سەربەخۆبوون لە پیاوان، گەورەکردنی منداڵان ئەرکی کۆمۆن بوو نەك تاکەکان، هەروەها جۆری خوێندن بۆ ژنان وەکو پیاوان بۆ بەشداریکردنی سیاسیو کۆمەڵایەتی بوو لە کۆمۆندا نەك بۆ ماڵداری.[٧١]

کارل مارکس لە کتێبی خێزانی پیرۆزدا پێیوایە باشتری مرۆڤ لە ئاژەڵان، پێشکەوتنی کاری کولتوورییە لەبەرامبەر کاری سروشتیدا، ئەو وای بۆ دەچێت پەیوەندی نێوان ژنو مێرد کە سروشتیترین پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانە باشترین شوێنی سەرهەڵدانی جەوهەری "مرۆییە" کە مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی دیکە جیادەکاتەوە. مارکس لەو بڕوایەدا بوو لە قۆناغی سەرمایەداریدا لەبەرئەوەی خێزان لە شێوە نەریتییەکەیدا ئەرکەکانی لەدەست دەداتو هەڵدەوەشێت، پەیوەندی نوێ لەنێوان ژنانو پیاواندا دروست دەبن. بەتێڕوانینی ئەو کارکردنی ژنان شتێکی ناسروشتی نەبوو پێیوابوو ئەو





یاسایانەی بەرگری لە کاری ژنان دەکەن لە توانایاندا دەبێت لە ڕادەی چەوساندنەوەی ئەوان کەم بکەنەوە. فریدریش ئەنگلز زێتر لە مارکس بەشێوەیەکی راستەوخۆتر لە"کێشەی ژن" دواوە. بەبڕوای ئەو یەکەمین ستەمی چینایەتی لەگەڵ یەکەمین ستەم لە رەگەزی مێ لەلایەن رەگەزی نێرەوە نزیکەو لەئەنجامیشدا شتێکی مێژووکردە. ئەو رزگاری ژنانو یەکسانیان لەگەڵ پیاوان پەیوەست بەگۆرانکارییە کۆمەڵایەتییەکان لەقەڵەم دەدات. ئەوەی سەرنج راکێشە بەبۆچوونی ئەو یەکێك لە مەرجە زۆر گرنگەکان بۆ ئازادی ژنان، ئامادەبوونیانە لە کاری بەرهەمهێن لە دەرەوەی ماڵدا واتە ئەو مەرجەی لەگەڵ برەوسەندنی سەرمایەداریی پیشەسازیدا بەدی دێت.[٧٢]

ئوگست بێبێل[٧٣] قوتابی ئەنگلزو لە رابەرەکانی سۆشیال دیمۆکراتەکانی ئەڵمانی لەو بڕوایەدا بوو باڵادەستی پیاو بەسەر ژنەوە ئەنجامی لاوازی فیزیکی ژنو هەروەها ئەرکەکەی وەکو دایك بووە، بەڵام ئەم بەڵگە "سروشتی"یانەی بەپاساوی بەردەوامی ملکەچی ژنانی لەقەڵەم نەدەدانو پێیوابوو دەبێت ژنان لە وابەستەیی ئابووری بەپیاوانەوە رزگاریان ببێت.[٧٤]

بەم شێوەیە، چەمکە سەرەکییەکانی ئەو گوتارە مۆدێرنەی لە دەکتۆرینو ئایدیۆلۆژیە جیاوازەکانی ئەم سەردەمەدا هەڵدەقوولا، فەزای لە پاساوی نەریتی ژێردەستی ژنان زێتر لە جاران تەنگ دەکردو لەبەرامبەردا پاساوی دەهێنایەوە بۆ دروستکردنی گۆڕانی بنەڕەتی لە هەلومەرجی ژناندا زێتر لە هەر کاتێکی تر و ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە هەلومەرجی بونیادی ئابووریو سیاسی، زەمینەی پێویستی بۆ دروستکردنو بەدیهێنانی ناسنامەیەکی ژنانەو هەروەها هەستی هاوبەشی رێژەیی لەنێو ژناندا ئامادە دەکرد.



**سستەمی ئابووری سەرمایەداریو کاریگەرییەکەی لەسەر پایەی ژنان**

ئەوە شۆڕشی پیشەسازی بوو کە بۆ ژنان ئەنگێزەی یەکسانیخوازی لە دەرفەتەکاندا دروست کرد، شۆڕشی پیشەسازی بوو یەکەمین قۆناغی لە گۆڕانی پایەی ژناندا هێنایە ئاراوە ـ واتە نەهێشتنی رێگرە یاساییو عورفییەکان لەسەر رێگای بەشداری تەواوی ژنان لە چالاکییە جیهانییەکاندا.[٧٥]

شۆڕشی پیشەسازیو گەشەسەندنی پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان بەرەبەرە گۆڕانگەلێکی گەورەیان لە ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانداو دوای ئەوەش لە هەلومەرجی ژناندا دروست کرد. بەزۆری سوود لە زاراوەی شۆڕشی پیشەسازی وەردەگیرێت بۆ ئاماژەکردن بەماوەی نێوان ١٧٥٠ـ١٨٢٥ کە لەو ماوەیەدا بەگەشەسەندنو بەکارهێنانی بەردەوامی مەعریفەی زانستیو بنەما میکانیکییەکانی وەك وزەی هەڵم لە بەرهەمهێناندا، گۆڕانێکی گەورە لە پەرەسەندنو بونیادی ئابووریدا دروست بوو. سستەمی بەرهەمهێنانی خێزانی شوێنی خۆی بەسستەمی بەرهەمهێنانی کارگەیی دا کە تیایدا بەشێوەیەکی چڕ سوود لە کەرەستەکان وەردەگیرا کە گوژمەی زێتر، بەڵام کاریگەرتر بوو و گوژمەی واقعی بەرهەمهێنانی هەر یەکەیەکی کالاکەی کەمدەکردەوە.[٧٦] ململانێ بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکان فرەوانتر ببوو و گوشار لەسەر بەرهەمهێنە سەربەخۆکان بووە هۆی ئەوەی یان بنەماکانی یاری نوێ پەسەند بکەنو شێوازە ئەرزانترەکانی بەرهەمهێنانو کەلەکەکردنی قازانجو سەرمایەگوزاری سەرلەنوێ بگرنەبەر یاخود شایەدی نەمانی پلەو پایەی خۆیان بنو بگۆڕێن بۆ کرێکاری کرێگرتەی سەرمایەداری.[٧٧] کار لەم قۆناغەدا گۆڕا بۆ چالاکییەك لەبەرامبەر حەقدەست کە لە دەرەوەی شوێنی ژیان (ماڵ) ئەنجامدەدراو چالاکییەکانی بەرهەمهێنانی ماڵەوە چیدی کار بەمانای چالاکی بەرهەمهێنان لەقەڵەم نەدەدرا.[٧٨] لە سەدەکانی بەر لە سەدەی نۆزدەیەم سەرەڕای ئەو گۆرانکاریو گەشەسەندنەی روویدا بوو کۆمەڵگاکان زێتر لە





کۆمەڵگاکانی پێشتری سەدەکانی ناڤینی خۆیان دەچوونو، ئەوە شۆڕشی پیشەسازی بوو، بۆوە هۆی گۆڕانێکی بەرچاو لە سیمای ژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتیدا.[٧٩]

لە یەکەمین ئەو کایانەی گەشەسەندنی پیسەشازیان بەخۆوە بینی، پیشەسازییە پەیوەستەکان بوون بە بەرهەمهێنانی ئەو کەلوپەلانەی یەکسەر بەکاردەبرێنو بەتایبەتی پیشەسازییەکانی پۆشاك واتە رستنو چنین. داواکاری بۆ ئەم جۆرە بەرهەمانە زۆر بوو و بەسەرنجدان لە زۆربوونی دانیشتوان بەردەوام داواکارییەکە زێدە دەبوو، گوژمەی بەرهەمهێنان تاڕادەیەك لە خوارەوە بوو، بەرهەمەکان لەبنەڕەتدا ستاندارد بوون.[٨٠] دروستکردنی کارگەکانی رستنو چنین بەو مانایە بوو کە سستەمی کارگەیی جێگەی سستەمی بەرهەمهێنانی ماڵەوەی پیشەسازی گرتەوە. کارگە لەلایەك بەمانای سستەمێك بوو کە خاوەنەکەی دەیتوانی کرێکاران بکاربهێنێتو کارەکەیان کۆنترۆڵ بکات ـ ئەمە بنەمای جیاوازییەکەی بوو لەگەڵ سستەمی بەرهەمهێنانی ماڵەوەـو قازانجی بەدەستهاتووش دووبارە وەبەربهێنێت[٨١] و لەلایەکی دیکەشەوە، بنەمای جیاوازی نێوان کاری بەرهەمهێنو نابەرهەمهێن بوو. کاری بەرهەمهێن بەکردەوە وەك کاری "پارەهێنەر" (واتە کارێك کە بە حەقدەست پەیوەست دەبێت) و کاری نابەرهەمهێن وەك کارێك پێناسە دەکرا کە ئەگەرچی پێویستە، بەڵام بەتەواوی رەهەندی "مەعیشەتی" هەیەو بەرهەمهێن هیچ "زێدە بەرهەم"ێکی نییەو بەگشتی بەناکالایی دەژمێردرێت.[٨٢] بەم شێوەیە، جیاوازییەکی سەرەکی لە هێڵەکانی جیاوازی نێوان کاری تایبەتیو کاری گشتی دروست بووـ بەیەکێك لە دەستەواژەکان، بۆ یەکەم جار ئەم جۆرە جیاکردنەوەیە هاتە ئاراوە. کە کایەی گشتی پێش ئەوە کایەی بەرهەمهێنانی نەدەگرتەوەو وەکو نەریت لە رووی تیۆری ئابووری بەمانای "ماڵ بەڕێوەبردن" بوو و پەیوەست بوو بەکایەی تایبەتییەوەو بەکردەوەش بەرهەمهێنان لەماڵ لە چوارچێوەی کاری خێزاندا فۆرمۆلە دەبوو[٨٣]. بەڵام ئێستا لەگەڵ گواستنەوەی "شوێنی کار" بۆ دەرەوەی ماڵ، بەگوتەی "سیر" جیابوونەوەی پیشەسازی لەخێزان فۆرمۆلە بوو و کایەی ماڵەوە[٨٤] لەرووی کاتو شوێنەوە وەك کایەیێکی جیا لە کایەی



جیهانی دەرەوە یاخود کایەی "بەرهەمهێنان" تەماشای کرا.[٨٥] ئەمە تاڕادەیەك بەمانای دروستبوونی کۆمەڵگای مەدەنییە بەو دەستەواژەیەی هیگل مەبەستی بوو. بەبۆچوونی کۆلب، هیگل کۆمەڵگای مەدەنی بەکایەی نێوان فەزای خێزانو فەزای سیاسیو لە دژایەتیدا لەگەڵ هەردووکیان لەقەڵەم دەدات. کۆمەڵگای مەدەنی لە خێزان گەورەترو لەهەمانکاتدا فەزای سیاسی ـ واتە ئەوەی فەیلەسووفە ئینگلیزەکان وەکو لۆك بەزۆری بەمانای کۆمەڵگای مەدەنیان بەکاردەهێنا ـ لەو گەورەتر. کۆمەڵگای مەدەنی سستەمێکی ئابوورییە کە ئەندامەکانی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانیان تیایدا کارو بازرگانی دەکەنو هەروەها ئەو دامەزراوە مەدەنیانەش دەگرێتەوە کە پێویستن بۆ بەردەوامی ئەرکی ئەم سستەمە.[٨٦] لە کاتێکدا کۆمەڵگا بەمانا کۆنەکەی لە خێزانەکان پێکهاتبوو، دواجار ژنانیش لێی بەدەرنەبوون (جەخت کردنەکە لەمنەوەیەـ نووسەر).[٨٧]

جیاوازی نێوان فەزای گشتیو تایبەتی ئاکامگەلێکی قووڵی لێکەوتنەوە بۆ پەیوەندیو ناسنامە پشت ئەستوورەکان بەرەگەز.[٨٨] لەبنەڕەتدا ژنان وەك کۆمەڵێك لە بڕیاردانو هەنگاوە گشتییەکاندا ـ بەمانا پێش سەرمایەدارییەکەی ـ رۆڵێکی دەستنیشانکەریان نەبوو، بەڵام لە بەرهەمهێنان و دواجار ژیانی کۆمەڵگادا رۆڵێکی دەستنیشانکەریان هەبوو. هیچ دابەشکردنێك لەنێوان جیهانی خێزانو جیهانی بەرهەمهێناندا نەبوو[٨٩] و "کاری" ئەوان وەکو کاری پیاوان نرخی بۆ دادەنرا. بەڵام لەگەڵ ئەم گۆرانکارییانە، ژنان بەرەو "فەزای تایبەتی" یاخود "ماڵەوە" بەرێ کران کە ئەو "کارەی" تیایدا دەکرا چیدی بەکار دانەدەنرا، چونکە کارێکی بەرهەمهێن نەبوو، ئەو ژنەی لەماڵدا "کاری" دەکرد، تەنیا "ماڵدار" بوو و ئەوە پیاو بوو بە"نانهێنەر" سەیر دەکرا.[٩٠]

لەلایەکی دیکەوە، لەو هەلومەرجەدا کە "دابەشبوونی نێوان دەوڵەتو کۆمەڵگای مەدەنی دروست دەبوو و فەزای گشتی بۆ بەشە جیاوازەکان دابەش دەبوو" ژنان "تیایدا پەراوێزکران"[٩١] لەتەك جیاوازی نێوان فەزای تایبەتیو فەزای گشتیدا، دەکتۆرینێك دەرکەوت کە بە ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە[٩٢] یاخود دەکتۆرینی ڤیکتۆریایی





ناسرا.[٩٣] دروشمی سەرەکی ئەم ئایدیۆلۆژیایە بەرزڕاگرتنی رۆڵی ماڵەوەی ژنانو جەخت کردن لەسەر جیاوازی کایەکانی ژنانو پیاوان بوو.[٩٤]

لەو هەلومەرجەدا کە چیتر ژنان رۆڵیان لە دابینکردنی سەرچاوەکانی خێزاندا نەبوو، وابەستە بوون بەهاوسەرەکانیانو ملکەچی[٩٥] لە چوارچێوەی ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە گۆڕا بۆ یەکێك لە کۆڵەگەکانی کەسایەتی ژن کە دەکرا ستایش بکرێت.[٩٦] کارنەکردنی ژنانی چینی سەرەوەو چینی ناوەڕاست بەرە بەرە گۆڕا بۆ بەهایەكو "ژنی قەشەنگ، جلوبەرگ جوانو بێکار بوو بە نیشانەی سەرکەوتن" "خاتوون" پێویست بوو تەنیا خاتوون بێتو "نەدەبوو لەپێناو قازانجدا کاربکات".[٩٧] جەخت کردن لەسەر بایەخی دایکایەتیو ماڵداری وەك دوو رۆڵو ئەرکی سەرەکی ژنان لەجیاتی قەرەبووکردنەوەی دابڕان بوو لە هەموو چالاکییەکانی دیکە.

وا دێتە بەرچاو کە جیاوازی دوو فەزای تایبەتیو گشتی هاوکات لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە ئەرکگەلێکی بۆ سەرمایەداریی پڕکێشمەکێشی ئەو قۆناغە هەبوو، ئەم جیاکردنەوەیە "شێوازێك" بوو بۆ کەمکردنەوەی "ململانێیە بەکێشمەکێشەکان" بەم شێوەیە "ماڵ و خێزان" دەیانتوانی بۆ ئەو پیاوانەی لە"کایەی گشتی"دا گرفتاری، ململانێ و ئەو دژایەتییانەیان ئەزموون دەکرد کە لەسەر ژیانی سەرمایەداری زاڵبوون، "شوێنێك بن ئاسایشیان لێ بەرقەرار بێت" و جەخت لەسەر رۆڵو هاوکاری روحیو دەروونی ژن بۆ خێزان وەك هۆکاری رزگاری روحی پیاوەکان لە گرفتەکانی شوێنی کار دەکرایەوە. هەڵبەت رەنگە ئەم ئەرکە زێتر تایبەت بێت بەپیاوانی چینی ناوەڕاست کە بەزۆری هاوسەرەکانیان کارێکیان لە دەرەوەی ماڵ نەبوو و لەئەنجامدا دەیانتوانی پشتیوانی سۆزاوی بۆ پیاوەکان دەستەبەر بکەن کە دەستەویەخە بوون لەگەڵ "شەڕ"و "ململانێ"دا. بەڵام لە خێزانە کرێکارییەکانیشدا تەنانەت ئەگەر ژن لە دەرەوەی ماڵیش کاری دەکرد، پێویست بوو "سەبر، بەرگەگرتنو مەترسییە وروژێنەرەکەی" بۆ ماڵ ـ وەك ئەو شوێنە سەرەکییەی وابەستەیە پێیەوەـ بخاتە کارو لە ئەنجامیشدا ببێتە ئارمانجی تێکشکانەکانی هاوسەرەکەی کە لە ئەنجامی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان



بێزار بووەو ناتوانێت بیانگۆڕێت. بەم شێوەیە، بۆ چینی کرێکاریش دەکرا خانوو ببێتە شوێنی پیادەکردنی دەسەڵاتی ئەو پیاوانەی لە دەرەوەی ماڵ بواری پیشاندانی دەسەڵاتی خۆیان نەبوو پیادەکردنی دەسەڵات لەماڵەوە بۆ ئەوان جۆرێك بوو لە میکانیزمی دەروونناسیی قەرەبووکردنەوە[٩٨] و دواتریش لە کێشمەکێشە دەرەکییەکانی ئەوانی کەم دەکردەوە.[٩٩]

تایبەتمەندییەکی دیکەی لەماڵدامانەوەی ژنان کاری نەبینراوی بێ حەقدەست بوو کە یارمەتی پاراستنی ئابووری سەرمایەداری دەدا، بەدەربڕینی مارگرێت بێنستۆن[١٠٠] کاری ماڵەوە پێش سەرمایەدارییە، چونکە تەنیا بەها بەکاربراوەکان[١٠١] بەرهەمدەهێنێت، واتە ئەو کاڵاو خزمەتگوزارییانەی راستەوخۆ لەلایەن خێزانەوە بەکاردەبرێن. بەڵام لەهەمان کاتدا، بەتەواوی پێویستن چونکە بەبێ ئەو کەسەی "کەرەستەی خواردن بکرێت، خواردن لێبنێت، جلەکان بشوات، گەسك بدات و ..." ئابووری ناتوانێت بەردەوام بێت و بەم پێیەش ژنانی ماڵدار بە"ستوونی بڕبڕەکانی" ئابووری لەقەڵەم دەدرێن[١٠٢] لەئەنجامی ئەم تایبەتمەندییە سەرەکیانەبوو کە لەماڵدامانەوەی ژنان هاوشان لەگەڵ تێگەیشتنگەلێکی تایبەتی پێویست لەبارەی "ژنایەتی"[١٠٣] لەلایەن سەرمایەداری پیشەسازیی تازە سەرهەڵدراوەوە جەختی لەسەر دەکرایەوە.[١٠٤]

بەڵام تایبەتمەندییەکانی لەماڵدامانەوە بۆ سستەمی سەرمایەدارییو دواتریش بڵاوکردنەوەی ئەو ئایدیۆلۆژیایەی پشتیوانی لێدەکرد، بەو مانایە نەبوو کە ئەم ئایدیۆلۆژیایە هەڵگری تایبەتمەندیگەلێکی نیگەتیڤ نیە، لەگەڵ راستیە بابەتییەکاندا لە دژایەتیدا نییەو هیچ ناکۆکییەکی نییە لەگەڵ بنەماکانی سەرمایەداری. گەشەسەندنی سەرمایەداری پێویستی بەبڵاوکردنەوەی هێزی کارو هەرزانیو زۆربوونەکەیەتیو، وەلانانی نیوەی دانیشتوان لە بازاڕی کار، ئەویش لە سەدەی نۆزدەو لەو هەلومەرجەدا کە ئابووری لە پەرەسەندنو بوژانەوەدابوو، نەیدەتوانی سوود بەسەرمایەداری بگەیێنێت.[١٠٥] سەرەڕای ئەوەش سەرمایەداری پەرەپێدانی پەیوەندییە





کالاییەکانی لە هەموو کایەو کەلوپەلو خزمەتگوزارییەکاندا لەخۆ دەگرێت، ئەمە بەو مانایەیە کە چالاکییەکانی سەرمایەداری، کارو بەرهەمەکانی ماڵەوە ـ لە کەلوپەلو خزمەتگوزارییەکان ـ دەهێنێـە نێو پەیوەندییە کالاییەکانو لەئەنجامدا کایەی کاری ماڵەوە زێتر لە جاران سنووردار دەکاتو دەکرێ چاوەڕێی ئەوەی لێبکەین ئەو ڕۆڵانە بگێڕێت کە ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە بەسەر ژندا سەپاندنی.

سەرەڕای ئەوە، ئەگەر ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە لەگەڵ دەکتۆرینە پێویستەکانی لەبارەی "ژنایەتی" بەنێو هەموو توێژەکاندا بڵاودەبوەوە، بەمانای نەمانی ئاستی ژیار (مەعیشەت) بوو لە نێو چینەکانی خوارەوەدا، چونکە ئەگەر بڕیار بوایە لەم چینانەشدا ژنان لەبارەی "جوانی، ڕێکپۆشیو بێکاری" ئەو چاوەڕوانیانەیان هەبن کە ژنە خۆشگوزەرانەکان هەیانەو لە هەمان کاتدا، راستیە بابەتیەکانیش وەڵامدەرەوەی ئەم چاوەڕوانیانە نەبن، ئەوا "چاوەڕوانیە زێترەکان" دەیانتوانی خراپ ئەرکی[١٠٦] لە سستمەکەدا دروست بکەن.

وێڕای ئەوەی لەڕووی تیۆرییەوە ئەم ئایدیۆلۆژیایە بەیەکێك لە دەربڕینەکان لایەنێکی "هەژمونی" هەبوو و چینی کرێکاریش پەسەندی کردبوو بەتایبەتی لە زۆر هەڵوێستی کرێکارانو سەندیکا کرێکارییەکاندا لەبارەی کاری ژنان ڕەنگی دەدایەوە، بەڵام لەگەڵ واقعی ژیانی ڕۆژانە نەدەگونجا. ئەگەر ژنانی چینی کرێکارو توێژەکانی دیکەی خوارەوە لە دەرەوەی ماڵ کاریان نەکردبا، دابینکردنی خەرجییەکانی ئەم خێزانانە کە پەیوەست بوو بەداهاتی پیاو و، تەنانەت منداڵەکان، نامومکین دەبوو. لە نێو چینی ناوەڕاستیشدا زۆر لە ژنانو بەتایبەتی ئەو ژنانەی شوویان نەکردبوو، بێوەژنەکان، تەڵاقدراوەکان بۆ بەڕێوەبردنی ژیانیان ناچاربوون کارێکیان هەبێتو لەئەنجامدا بەکردەوە ئەو تێگەیشتنەی باو بوو لەمەڕ ژنایەتی ئەمانەی نەدەگرتەوەو بارودۆخی خۆیانیان جیاواز دەبینی لە راسپاردەکانی ئایدیۆلۆژیای "هەژمونی" لەماڵدامانەوە.

بەڵام ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە بۆ ئەو گروپەی ژنان کە وەکو دیار دروشمەکانی لەگەڵ ڕەوشی ژیانیان وێکدەهاتنەوە ـ واتە ژنە خۆشگوزەرانە بەمێردەکانی چینی ناوەڕاست ـ



بەرەبەرە دەگۆڕا بۆ فاکتەرێکی قەیرانی هزریو روحی ژنە ماڵدارەکانی چینی ناوەڕاست، بەزۆری ئەو ژنە خوێندەوارانە بوون کە بەکردەوە جگە لە منداڵ بەخێوکردن کارێکی دیکەیان نەبوو. ئەوان دڵیان بەپاسیڤبوونی خۆیانو پایەی "تایبەتی"و "بەرێز" بەڵام لە خوارەوەی خۆیان خۆش نەبوو[١٠٧]. ئەوان بەشێوەیەکی تایبەتی خۆیان بەناچار دەبینی لە مانابەخشین بەژیانێك کە ڕۆژانە بێ ماناتر دەبوو و ئەم "قەیرانەی مانا" بوارێکی گونجاو بوو، بۆ کردەی بەکۆمەڵ. سەرەڕای ئەوەش، جەخت کردن لەسەر پیرۆزی لەماڵدامانەوەو ئەو باوەڕەی لە زۆربەی ژناندا بەهێز دەکرد کە ئەوان بوونەوەری باشترن لە پیاوانو ئەوەش دەبووە زەمینەیەك بۆ داواکردنی پایەیەك کە لەگەڵ ئەم باشترییە بگونجێت.[١٠٨]

سەرەڕای ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە، کۆمەڵگای سەرمایەداری لەسەر بنچینەی پێویستییە ئابووریو کۆمەڵایەتییەکان ڕێگایێکی دیکەی دەبڕی، ئەویش فرەوانبوونی کەرتی پیشەسازیو زۆربوونی خێرای ژمارەی کارگەکان بوو. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم بەمانای کەمبوونەوەی بەرەبەرەی بایەخی کشتوکاڵو پیشەسازییەکانی ماڵەوەو گواستنەوەی بەرهەم لە ماڵەوە بۆ کارگەو زۆربوونی هەرچی زێتری هێزی کاری بەکرێو هاتنی بەشێکی فرەوانی دانیشتوان بۆ بازاڕی کاری گشتی. ئەم پرۆسەیە سەرەڕای ئەو کاریگەرییەی لەسەر پایەی کۆمەڵایەتیو ئابووری پیاوانی هەبووـ هەمیشە لە نووسینی مێژووی گۆڕانکارییەکانی سەرمایەداریدا جەختی لەسەر دەکرێتەوەـ چەند کاریگەرییەکی گرنگی لەسەر ژیانی ژنانیش بەجێهێشتن. ئەزموونی ژنان وێڕای ئەوەی لە زۆر رووەوە لە ئەزموونی پیاوان دەچوو، بەڵام یەکسان نەبوو لە گەڵی و بەدەستەواژەیەکی دیکە سەرمایەداری پیشەسازی ئاکامگەلێکی تایبەتی بۆ ژنان وەك گروپێکی کۆمەڵایەتی هەبوو کە پێویستە بەشێوەیەکی گشتی لەبەرچاو بگیرێت.

زۆربوونی قازانج لە چالاکی بەرهەمهێناندا کە لۆجیکی بنچینەیی سستەمی سەرمایەدارییە، بووە هۆی گۆڕینی بەرهەمهێنانی ماڵەوە بۆ بەرهەمهێنانی کارگەیی.





ئەم پرۆسەیە لەگەڵ کۆبوونەوەی هێزی کار لە کارگەو چەند گۆرانکارییەك لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا هاوشان بوو. بەم شێوەیە بە بەشبەشکردنی پرۆسەکە بۆ چەند قۆناغێکی جیاوازی سادەو بەپشتبەستن بەتەکنیكو ئامێر کە جێگەی ماسولکەکانی مرۆڤیان دەگرتەوە، هەم لێهاتوویی لە کرێکاران دادەماڵیو هەمیش کۆنترۆڵی ئەوانی ئاسانتر دەکرد.[١٠٩] لێهاتوویی داماڵین بەمانای ئەگەری بەکارهێنانی کرێکارە نالێهاتووەکان بەحەقدەستێکی کەمتر بوو، لەم قۆناغەی گەشەسەندنی پیشەسازیدا کارگەکان تەنیا پێویستیان بە رەوتێکی جێگیری کرێکارە نەخوێندەوارەکان یاخود خاوەن خوێندەوارییەکی سنووردار لە پرۆسەی کاردا هەبوو و تاکە شتێکیش کە بایەخی هەبوو ژمارەی کرێکاران بوو.[١١٠] ژمارەی زۆری کرێکاران هەم بۆ راکێشانە ناو کارەکان پێویست بوو هەمیش بوونی ژمارەیەکی زۆر لەو کرێکارانەی بەدوای کاردا دەگەڕان یارمەتی فۆرمۆلیزەبوونی "سوپای زەخیرەکراوی بێکاران"ی دەدا کە خۆی لەخۆیدا دەبووە هۆی کەمکردنەوەی نرخی هێزی کار. ژنان بەشێك بوون لەم سوپا زەخیرەییەو بە سەرنجدان لە ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە بە ئاسانی دەکرا بەپێی پێویستی، بگەڕێنرێنەوە ماڵەوە[١١١] و لە ئەنجامدا سوود لە رەهەندی "وەزیفی" بێکاری وەرگرن و، کاتێك ئەم بێکارییە بەخراپی ئەرکەکەی دەبینی، دەیتوانی بەگەڕاندنەوەی ژنان بۆ ماڵەوە کەمی بکەنەوە. سەرەڕای ئەوە، کچ و ژنە هەژارەکان، کچە قەیرەکانو بێوەژنەکان کە بە بەراورد لەگەڵ پیاوان گوێڕایەڵترو زێتر قابیلی کۆنترۆڵ سەیریان دەکرا،[١١٢] گۆڕان بۆ کرێکاری خوازراوی ئەو کارگانەی تازە دروست ببوون ـ کە بەپشتبەستن بە وزەی هەڵمو ئامێری نوێ هێزی زۆری جەستەیی کرێکار چیدی بەتایبەتمەندییەکی دیاریکراو لە قەڵەم نەدەدرا.

لە سەدەی نۆزدەو بیست، لە هەلومەرجی شەڕدا پێویستی بەهێزی کاری ژنان زێتر دەبوو و پێویست بوو لە زۆر لە پیشەسازییەکاندا هێزی کاری ژنان شوێنی ئەو پیاوانە بگرێتەوە کە بەرەو بەرەی شەڕ دەنێردران. پێویستی بەرەی شەڕ بەجلوبەرگو پێلاو بەمانای زێدەبوونی داواکاریی بوو بۆ کاری ژنان و ژنی زێدەتر پەلکێشی ناو بازاڕی



کارکرد.[١١٣] دوای کۆتایی هاتنی شەڕیش لەگەڵ دەستپێکردنی نۆژەنکردنەوەو فرەوانبوونی قەبارەی پیشەسازی پێویستیی بەکرێکاری ناشارەزاو بەدەستحەقێکی کەم لە جاران زێتر زیادی کردو بەگوتەی لاروس، پێویستی سەردەمی بونیاتنانەوە بە "سەردەمی کار بۆ ژنان" هەڵبەت جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە "لە ژێر گوشاری بارودۆخ نەك لەسەر بنچینەی هەڵبژاردن" دروستی کرد.[١١٤] کارکردنی ژنان لە کارگەکاندا بەمانای چوونیان بوو بۆ ناو "بازاڕی کار" و پەیوەندییە کالاییە فەرمانڕەواکان لەسەریان. ئەم پەیوەندییە کالاییانە پێویستییان بەجۆرێك لە گشتگیری[١١٥] بوو، بەو مانایەی دەبێت بەهای بازاڕ نرخاندنی هێزی کار (هەروەها کالاو خزمەتگوزارییەکان) وەك تاکە پێوەر سەیر بکرێت[١١٦]. پێویستە کرێکاران لە هەلومەرجی بەرامبەردا لە بازاڕی کار، هێزی کاری خۆیان بخەنەڕوو و بەپێی هەلومەرجی پێشنیارکراو کە ئازادانەو لەسەر بنچینەی لۆجیکی داواکاریو خستنەڕوو دیاری دەکرێت، بیفرۆشنو دەبێت ئەو کرێکارانەی کاری یەکسان لەگەڵ چۆنیەتیو چەندایەتی هاوشێوە دەخەنەڕوو لە هەلومەرجی یەکساندا حەقدەستی یەکسان وەرگرنو لەبنەڕەتدا نابێت لەسەر بنچینەی رەگەز (و هەروەها نەژاد) نایەکسانی دروست ببێت، بەڵام سەرمایەداری لەبەر پێویستییەکەی بەکەمی گوژمەی هێزی کار ـ و لە ئەنجامی کەمی گوژمەی بەرهەمهێنانو زۆری قازانج ـ بەکردەوە چەند بەشێکی هێزی کار دەخاتە پەراوێزەوەو ئەوەی بە بازاڕی کاری لاوەکی ناودەبرێت فۆرمۆلە دەبێت، ئەم بازارە دەبێتە زەمینەی داواکاریو خستنەڕووی کار بۆ گرووپە کەمایەتییەکان، هەروەها بە سەرنجدان لە باسەکەمان دەبێتە ئەو زەمینەیە بۆ ژنان بەشێوەیەکی تایبەتی.[١١٧]

بازاڕی لاوەکی لەلایەکەوە، گۆڕەپانی خستنەڕوو و داواکاری کارە کەم حەقدەستەکانە لە ناو هەریەك لە کەرتەکانی ئابووریدا ـ بەگشتی ئەو کارانەن کە لێهاتوویيان تێدا نییەو رێکخراوی کرێکاری بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندییە بەکۆمەڵەکانی کرێکاران تیایدا دروست نەبووە ـ لەلایەکی دیکەوە، گۆڕەپانی ئەو کارانەیە کە پەیوەستن





بەکایەگەلێکی تایبەتی ئابووریو بەگشتی حەقدەست تیایاندا لە کایەکی دیکە کەمترە. ئەم زەمینەیە لە وەزیفەی جیاکاری رەگەزی[١١٨] (بەتایبەتی دژی ژنان) لە بازاڕی کاردا دەشێ ببینرێت.[١١٩]

رۆباتام پێیوایە ئەم ئامادەییەی ژنان لە بازاڕی کاری لاوەکیدا نەدەکرا جیابکرێتەوە لە ژێردەستیی گشتی ژنانو پێناسەی کۆمەڵایەتیی "کاری ژن" وەك کارێك کە "حەقدەستێکی کەمی هەیەو هەروەها کارێکی نالێهاتووانە بوو".[١٢٠] دەشێ بڵێین ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە بەدروستکردنی ئەم باوەڕە کۆمەڵایەتییە کە کاری ژن لە دەرەوەی ماڵ ناکرێ جگە لە شتێکی ریزپەڕ، هەوڵێکی کاتی بۆ یارمەتیدانی داهاتی خێزان، یاخود بوونی پارە بێت لە گیرفاندا، بووە هۆی ئەوەی ژنان بەدرێژایی سەدەی نۆزدەیەم لەسەر بنچینەی بنەماکانی یاری نوێی ئابووری بچنە ناو بازاڕی کاری لاوەکیو لە ئەنجامیشدا بکەونە پەراوێزەوە.

بەدرێژایی سەدەی نۆزدەیەم، یەکێك لە دەرکەوتە سەرەکییەکانی ئامادەیی ژنان لە بازاڕی کاری لاوەکیدا لە کۆبوونەوەیان لە پیشەسازی پۆشاك دا دەرکەوت. لەلایەکەوە، بەگشتی ئاستی حەقدەست لەم کایەیەدا هێندە بەرز نەبوو لەلایەکی دیکەوە، ژنان کە زۆربەی ئەو کرێکارانەی لەم بەشەدا کاریان دەکرد پێکدەهێنا ـ بۆ نموونە ساڵی ١٨٦٠ چوار لەسەر پێنجی گشت ئەو ژنانەی کاریان دەکرد یان لە پیشەسازی پۆشاکدا بوون یاخود خزمەتگوزارییەکانی ماڵەوە ـ بەنسبەت پیاوە هاوڕێکاکانیانیش لە هەلومەرجێکی ناگونجاوتردا بوون، چونکە زۆربەیان کرێکاری نالێهاتوو بوون کە ئەگەری پێشکەوتنیان نەبوو.[١٢١]

لە کایەکانی دیکە کە ژنانی کرێکار کاریان تێدا دەکرد، کارگەکانی دروستکردنی ئاوی نەبات، بەرهەمهێنانی هۆیەکانی رازاندنەوە، جلوبەرگ شوریی، خزمەتگوزارییەکانی ماڵەوەو چەند کارێکی دیکەی لەم شێوەیە بوون، واتە کارە وەرزییەکان کە ئەگەری بوونی کاری جێگیری (وەك یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کرێکاران لە بازاڕی سەرەتاییدا) لێی دەسەندەوە.[١٢٢]



لە سەدەی نۆزدە لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی لە بونیادی ئابووریدا دروست بوون، پێویستی زێتر بەهێزی کاری خوێندەواری لێهاتوو هەبوو، لە ئەنجامدا لە هەندێك کەرتی پیشەسازیدا هێزی کاری پیاوان جێگەی هێزی کاری ژنانی گرتەوە.[١٢٣] هەڵبەت ئەمە بەمانای لابردنی ژنان یاخود کەمبوونی ئامادەیی هێزی کاری ئەوان نەبوو لە کەرتە جیاوازەکاندا، [بەڵکو] بووە هۆی ئەوەی ژنان بچنە نێو کایەگەلێکی دیکەوەو لە ئەنجامدا فەزای کاری ژنان فرەوان بوو.

لەلایەکی دیکەوە، سەرمایەداری لە قۆناغەکانی پێشکەوتووتری خۆیدا پێویستی بە بەهێزکردنی کەرتی خزمەتگوزارییەکان هەبوو بەگەشەکردنی ئەم کەرتە، ژمارەی کارەکانی زیادیان کرد، بەجۆرێك کە ئەم کارانە لە سەرەتاکانی سەدەی بیست نزیکەی لەسەدا دەی گشت هێزی کاری پەلکێشی ناوخۆی کردبوو. هاوەشان بەپێشکەوتنە تەکنیکییەکان کە هەندێ کاری لە کەرتی خزمەتگوزارییەکاندا سادەکردن، رێگەی بۆ ئامادەیی ژنان لەم بەشەی ئابووریدا خۆش کرد، هەڵبەت زۆرترین رێژەی زێدەبوون لەو کارانەدا بوو کە پێیان دەگوترا "یەخەسپی" یاخود ئیداری، هەروەها لە کارەکانی وەکو فرۆشتنی دا کە زۆرترین ژنیان پەلکێش کردن[١٢٤]. لاروس بەشێوەیەکی تایبەتی داهێنانی ئامێری نووسین بە "پاڵەوانی" دروستکردنی گۆڕانکاری لە رەوشی ژناندا لە قەڵەم دەداتو بە بۆچوونی ئەو ئەم داواکارییە لەلایەن ژنانەوە نەبوو کە بە "سەرهەڵدانی ژنانی خاوەن کار" کۆتایی هات، بەڵکو لەگەڵ لە دایکبوونی ئەم داهێنانە دەرکەوت کە ژنان بە ئاسانی چوونە نێو کایەیەکەوەو کردیان بەموڵکی خۆیانو مافیان بەڕەسمی ناسرا[١٢٥] لە ئەنجامی داهێنانی ئامێری چاپو ئامێرە ئیدارییەکانی دیکە ژمارەی ئەو ژنانەی لە کارە ئیدارییەکاندا کاریان دەکرد لە کۆتایی سەدەدا گەیشتە ١٠٠,٠٠٠ کەس.[١٢٦] جگە لەم کارە ئیدارییانە، ژنان پەلکێشی نێو کاری خزمەتگوزاری دیکەش کرابوون وەکو پەرەستاری، خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتیو ئەمینداری کتێبخانەو لە سەرەتای سەدەی بیستەم رێژەی ژنان لەم بەشەدا بە لە سەدا ٧٠ی گشت ئەو هێزە کارەی لەم بەشەدا کاری دەکرد، گەیشت.[١٢٧]





ژیانی ئاڵۆزی شار، پێویستی بەهێزی کاری لێهاتوو، برەوسەندنی پسپۆرییەکانو پێویستی پێیان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی سستەمی ئابووریو کۆمەڵایەتیو ...هتد، کاریگەری لەسەر هەڵسەنگاندنی دووبارەی مافی خوێندن هەبوو و بڵاوبوونەوەی فێرکردنی لە ئاستەکانی سەرەتاییو ناوەندیدا کردبووە یەکێك لە ئامانجە گەورەکانی سەدەی نۆزدەیەم.[١٢٨] بەم شێوەیە، خوێندن هەم بۆ کچانو هەم کوڕان بەتایبەتی لە شارەکاندا، شوێنی خۆی لە نێو پرۆگرامی کۆمەڵایەتیدا کردەوە. هەڵبەت لە سەرەتادا، خوێندنی کچان هەم لە ڕووی فەزای کۆمەڵایەتییەوە سنووردار بوو و زێتریش تایبەت بوو بە چینی خۆشگوزەرانو هەمیش لە ڕووی ناوەرۆکەوە بە خوێندنی ماددەکانی وەك گولدۆزی، وێنەکێشان، زمانی فەرەنسیو ژەنینی یەکێك لە ئامێرە موسیقییەکان سنووردار دەبوو. لە ئاستەکانی بەرزتردا، خوێندن لە کایەی ئایینیو لە ڕێگەی چەند کایەیەکی زانستی[١٢٩] تایبەت بەکچان فۆرمۆلە دەبوو، لە ئەنجامدا کچان بێبەش بوون لەو خوێندنە پسپۆڕیانەی کوڕان دەیانخوێندن، بەڵام هەمان خوێندنی سنوورداریش کاریگەری هەبوو بۆ فۆرمۆلەبوونی داواکاری بۆ گۆڕانی بارودۆخ.

سەرەڕای ئەوە، لەبەرئەوەی توانای ئەوانەی لە قوتابخانەکانی تایبەت بەکچان دەرچوبوون بۆ وانەگوتنەوە سەلمێنرابوو و پیاوانیش مەیلێکی وەهایان بۆ چوونە نێو پیشەی کەم داهاتی مامۆستایی پیشان نەدەدا، بەناچاری پێویستی بەژنان بۆ وانەگوتنەوە دەبووە هۆی ئەوەی فێرکردنی ئەوان ڕەهەندێکی جیدیتر وەرگرێت. سەرباری ئەوەی ژنان خۆشیان سەبارەت بەم مەسەلەیە حەزێکی زۆریان پیشاندەداو هەوڵو تێکۆشانی تاکەکەسیان بۆ زێدەبوونی ئیمکانیاتەکانی خوێندن لە سەدەی نۆزدەیەم توندببوو، ئەوانەی بەرگریان لە خوێندنی یەکسان بۆ کچانو کوڕان دەکرد بەرەبەرە زیادیان دەکرد[١٣٠] لە ئەنجامی ئەوەشدا هەم خوێندنی سەرەتایی بۆ کچانو کوڕان تاڕادەیەك یەکسان بوو هەمیش بەرەبەرە ڕێگە لەبەردەم خوێندنی باڵای ژنان کرایەوەو دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا بەرەبەرە ژنانیان سەرەتا لە زانکۆیە جوداکانو دواتریش لە زانکۆکانی پیاوان پەسەند کردن. هەڵبەت هێشتا لەم قوتابخانانەدا



خوێندنی کچان تاڕادەیەك لەگەڵ خوێندنی کوڕان جیاواز بوو. لە ئەنجامدا ئەوانەی دەرچووبوون بەئاسانی نەیاندەتوانی لەگەڵ کوڕە هاوشانەکانیان ڕکابەری بکەن.[١٣١]

کاتێك ژنان چوونە نێو ئاستەکانی خوێندنی باڵاوە، چیدی نەیانویست تەنیا لە کایە سنووردارو دیاریکراوەکاندا بخوێنن. ئەوان بەمکووڕی هەوڵیاندا تواناکانی خوێندنی باڵا بۆ خۆیان زێدە بکەن. ژنان هەوڵیاندەدا ڕێگای بەشەکانی وەك ئیلاهیاتو فەلسەفە بگرنە بەر. خوێندن لەم بەشانەدا لەگەڵ کێشەگەلێکی تایبەتی لە ڕووی ئیمکانیاتو ئاسانکارییەکان ڕووبەڕووبوو. یەکەمین ژن ساڵی ١٨٥٠ بەشی ئیلاهیاتی تەواوکرد و، هەندێك لەو ژنانەی ئەم بەشەیان تەواوکرد بوونە ڕابەری بزاڤی ژنان.[١٣٢]

بەم شێوەیە، لە ئەنجامی پێداویستییەکانی سەرمایەدارییو هەروەها گوشارەکانی ژنان ژمارەی ئەو ژنانەی خوێندنیان تەواوکرد بێوێنە پەرەی سەند. تەنیا لە ئەمریکا لە کۆتایی دەیەی ١٨٨٠ زێتر لە٢٥٠٠ ژن بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان هەبوو[١٣٣] و دوو ساڵ دواتر ژمارەیان بە ٥٠٠٠ گەیشت. دوای دە ساڵ واتە ساڵی ١٩٠٠، ٨٥,٠٠٠ ژن لە کۆلێژەکاندا خۆیان ناونووس کردبوو و ژمارەیان لە ساڵی١٩٢٠ بە ٢٥٠,٠٠٠ گەیشت.[١٣٤] ساڵەکانی ١٩٠٠و ١٩١٠، لەسەدا بیستی دەرچووانی زانکۆکان ئافرەت بوونو ڕێژەی ئەو ژنانەی بڕوانامەی باڵاتر لە بەکالۆریۆسیان هەبوو لە ساڵی ١٩٠٠، لەسەدا شەش بوو، ساڵی ١٩٢٠ بە لەسەدا ١٥ گەیشت.[١٣٥] لەو هەلومەرجەدا کە خوێندنی گشتی پەرەی سەند، بەشێکی تاڕادەیەك بەرچاوی ژنە دەرچووەکانی کۆلێژو زانکۆکان بەرەو کاری وانەگوتنەوە پەلکێش کران. لەسەدا ٨٠ مامۆستاکان ژن بوون. لە ئەمریکا ژمارەی مامۆستا ژنەکان کە ساڵی ١٨٧٠، ٩٠,٠٠٠ بوو ساڵی ١٨٩٠ بە ٢٥٠,٠٠٠ گەیشت. زۆربەی ئەو مامۆستا ژنانەی بێ مێردو دەرچوو بوون، هەم لەڕووی فکرییەوە دڵیان بە نایەکسانی ژنانو پیاوان ناخۆش بوو و لەبەر کەمبوونی ڕێژەی دەروەستبوونیشیان دەیانتوانی لە چالاکییە کۆمەڵایەتیەکاندا بەشدارییەکی زێتریان هەبێت.[١٣٦] بەڵام لە کەرتی خزمەتگوزارییەکانیشدا ئەو کایانەی ژنان زێتر کاریان تێدا دەکرد بە بەشێك لە بازاڕی کاری لاوەکی لەقەڵەم دەدران. مامۆستایان





هەندێ کات حەقدەستێکی زۆر کەمتریان لە کرێکاران وەردەگرت. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە هەندێ کات داهاتیان یەك لە شەشی داهاتی کرێکاران بوو.[١٣٧]

هەرچۆنێك بێت، پەیوەستبوون بە بازاڕی کاری لاوەکی چ لە کەرتی خزمەتگوزارییەکانو چ لە کەرتی پیشەسازیدا بەمانای نەبوونی ئاسایشی کارو حەقدەستی لە خوارەوە بوو. ژنان زێتر لە پیاوان لەگەڵ مەترسی بێکاری ڕووبەڕووبوونو لە کاتی بێکاریشدا هیچ میکانیزمێك نەبوو بەرگریان لێ بکات، جگە لە هاوکارییەکانی ناوەندە خەیرییەکان. لەبەر ئەوەی نیشانەگەلێکی وردی بێکاری لە نێو ژناندا نابینین، چونکە تەنانەت ڕێژەی داواکاری ڕەسمی کاریش زۆری بێکاری لە نێویاندا پیشان نادات، چونکە زۆر لە ژنان تەنیا بە هاتنەوەیەکی بازاڕی کار تەنانەت لە داواکاری کاریش دوور دەخرێن. بەڵام ئاماری ئەوانەی داوای کاریان دەکردو ڕێژەی ئەو کەسانەی لە نێونیاندا کارێکیان دەستدەکەوت دیسان ئەوە پیشان دەدات بێکاری لە نێو ژناندا بەبەراورد لەگەڵ پیاوان زۆر زۆرترە.[١٣٨]

بەڵام ئەوەی پاڵی بەژنانەوە دەنا بۆ بازاڕی کاری لاوەکی تەنیا سەرمایەداریو بەرژەوەندیخوازی سەرمایەداران نەبوو. پیاوە کرێکارەکانیش لەم نێوەدا ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو. ئەندامانی سەندیکا کرێکارییەکان کە کرێکاری لێهاتوو بوون هیچ حەزیان لە ڕێکخستنی هێزی کاری نالێهاتوو، کۆچکردوو و ژنان نەبوو، هەروەها وەك مەترسییەك لەسەر هەلومەرجی تاڕادەیەك باشتری خۆیان سەیری ئەوانیان دەکرد[١٣٩] و لەو بڕوایەدا بوون نابێت ژن کاربکاتو کار شتێکە "پەیوەست بەپیاوان" و لە ئەنجامدا، دژی هاتنی ژنان بوون بۆ نێو هێزی کار. سەرەڕای ئەوە، ژنان بە ڕکابەرێك بۆ ئەوان لەقەڵەم دەدرانو لەبەرئەوەی ئامادەبوون بە حەقدەستێکی کەمتر کاربکەن، ئەگەری دۆزینەوەی کار بۆ پیاوە هاوشانەکانیان کەمدەبووەوە، پیاوە کرێکارەکان وەرگرتنی ژنانیان لە سەندیکا کرێکارییەکاندا ڕەتدەکردەوە، چونکە لەو بڕوایەدا بوون کە "ژنان بە زۆری دەسەڵاتی ئەوەیان نییە... مافی خۆیان وەرگرن"[١٤٠] و لە ئەنجامدا وەکو پێویست "ڕوحی" ململانێخوازی پێویستیان نییەو تاڕادەیەك بەو هۆیەی کە



ئەگەری ئەوە زۆر بوو ژنان بەهۆی هاوسەرێتی، منداڵبوون، منداڵ پەروەردەکردنو.. واز لەکاری خۆیان بهێنن، دواجاریش دروستبوونی ڕێکخراو لە نێوانیاندا هەم زەحمەتو هەمیش پڕگوژمەو کەم داهات بوو.[١٤١] لە ئەنجامدا سەندیکا کرێکارییەکان بەدەگمەن داوایان لە ژنان دەکرد پەیوەندی بەسەندیکاکانەوە بکەن. فیدراسیۆنی کرێکاری ئەمریکا مامەڵەیەکی دوژمنکارانەی ئاشکرای لەگەڵ ژنان دەکرد.[١٤٢] کرێکارە پیاوەکان هەندێکات لە ژێر ناوونیشانی پشتیوانی کردن لە ژنان دەچوونە نێو کارەوەو ئیمکانیاتی کاری ئەوانو داهاتەکانیان سنووردار دەکردو هەوڵیاندەدا بەکارهێنانیان بۆ خاوەنکارەکان بێ سوود بکەن.[١٤٣] لە زۆر لە پیشەکانیشدا (وەك پزیشکی و ماف) پیاوان بەجیدی دژی هاتنە ناوەوەی ژنان بوون.

لە دەستپێکی هەوڵی ژناندا بۆ گرتنەبەری ڕێگا بەرەو زانکۆکان لەگەڵ سنووردارییگەلێکی تایبەتی لە بەرامبەر چوونیان بۆ نێو هەندێك لە لقەکان کە بە چەند کارێکی تایبەتی کۆتاییان دەهات، ڕووبەڕوو دەبوونەوەو یاخود دوای خوێندن لەو بەشانەدا، کۆمەڵە پیشەییە چالاکەکان لەو لقانەدا یاخود ژێدەرە پەیوەندیدارەکان، بەڕەسمی دانیان بەکارکردنی ژنان لەو کایانەدا نەدەنا. ژنان بەدرێژایی سەدەی نۆزدە هەوڵیاندا ڕێگەیان بکەوێتە بەشەکانی پزیشکیو ماف، بەڵام بە دەگمەن پەسەندیان دەکردن، هەڵبەت سەرەنجام ژنان توانیان ڕێگەیان بکەوێتە کۆلێژەکانی پزیشکی. لە ئەمریکا ساڵی ١٨٧٠ ژمارەی ئەو ژنانەی خوێندنی پزیشکیان تەواو کردبوو بە ٥٤٤ ژنو ساڵی ١٨٩٠ بە ٤٥٠٠ گەیشت.[١٤٤] بەڵام لە بەرامبەردا کارکردنی ئەم ژنانە بە تایبەتی لەگەڵ کردە و هەوڵەکانی هاوشانە پیاوەکانیان ڕووبەڕووی کۆسپو تەگەرە دەبووەوە. سەرەڕای ئەوەی ڕێگری لە هاتنی ژنان بۆ کۆلێژەکانی ماف دەکرا، دوای هاتنیان بۆ ئەم ڕشتەیەو تەواوکردنی خوێندن، ئیجازەی کاری یاساییان پێنەدەدان. پیاوە یاسازانەکان نیگەرانی ئەوە بوون نەوەك ژنەکان "نانی خێزانەکانیان ببڕن".[١٤٥]

بەم شێوەیە، سەرمایەداری لەسەر بنچینەی پێویستی خۆی بەهێزی کاری زۆرو هەرزانو لەسەر بنچینەی گشتخوازی، بەکردەوە بازاڕی کاری ژنانی هێنایە ناوهێزی کار واتە





فەزای گشتی، و لەهەمان کاتدا بەپشت بەستن بەبیروبۆچوونە باوکسالارەکانو ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە ئامادەیی ئەوانی لەم فەزایەدا بەنابەجێ لە قەڵەمداو لە ئەنجامدا، توانی ئەوان لە"گشتخوازی" بنەڕەتی خۆی ریزپەڕکاتو لەم ڕێیەوە بیانگۆڕێت بۆ هێزی کاری پلە دوو و خاوەن پایەو حەقدەستێکی کەمترو بەگشتی، گوژمەی بەرهەمهێنانی بەرهەمەکانو سەرمایەداری کەم بکات.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە، ئامادەیی ژنان لە هێزی کاردا بەمانای گۆڕانی بنەڕەتی بوو لە شێوازی ژیانو شوێنگەی تاکەکەسیو کۆمەڵایەتی ئەوانداو تاڕادەیەکی زۆریش بۆوە هۆی سەربەخۆییان.[١٤٦] هاریت رابینسۆن لە راپۆرتی خۆیدا لەبارەی کچو ژنە کرێکارەکان بۆ نۆسینگەی ئاماری کاری ماسوچۆست لە ساڵی ١٨٨٣ نووسی : " دواجار ئەوان شوێنگەیەکیان لە جیهاندا دۆزیبووەوەو چیدی ناچار نەبوون ژیانی بێکاریگەری خۆیان بەسەپاندنی بەسەر وابەستەکانیان ببەنەسەر".[١٤٧] ئاکامەکانی ئەم سەربەخۆییەش هەم ژنان خۆیان دەرکیان دەکردو هەمیش پیاوەکان بە هەڕەشەیان دەبینی لەسەر باڵادەستی خۆیان. ئەم سەربەخۆییە تارادەیەکی زۆر بەو مانایە بوو کە ژنان چیتر گوشار لەسەر خۆیان وەکو جاران بەئاسانی ـ واتە ئەو کاتەی کە بەردەوامیدان بەژیان پەسەندکردنی ئەو هەلومەرجەی پێویست دەکرد ـ پەسەند نەکەن، هەروەها ژیانی کارکردنی بۆ زۆر ژن تاکە شێوازی ئامادەبوونیان نەبوو لە فەزای گشتیدا، ئەو ژنانەی کاریان دەکرد بایەخێکی زێتریان بەمەسەلە گشتیو سیاسییەکان دەداو دەچوونە ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەی وەکو ئامادەبوونێکی کاریگەر وابوو لە کایەی گشتیدا.[١٤٨]

سەرمایەداری بەرێگەی جیاجیا (رۆڵی لە تەکنۆلۆژیایە پەیوەستەکان بەچاپو بڵاوکردنەوەوە تاکو فۆرمۆلەبوونی کایەیەکی کار لە زانیاری گەیاندنو برەودان بەخوێندنی گشتی) رۆڵی هەبوو لە زەمینە خۆشکردن بۆ زێدەکردنی هەستیارییە کۆمەڵایەتیو سیاسییە گشتییەکانو ژنانیش، هەڵبەت هاوکات لەگەڵ زێدەبوونی ئامادەییان لە کایەی گشتیدا لەم ئیمکانیاتە هوشیارکەرەوانە سوودمەند دەبوون.



سەرمایەداری بەگشتی، ژنەکانی خستە هەلومەرجێکەوە کە دژایەتییەکانی نێوی روونو ئاشکرا بوون، ئەگەر ژنان ـ بەپێی دەکتۆرینی ڤیکتۆریایی ـ چینێکی تایبەتنو ناسنامەی رەگەزی تایبەتیان هەیە، بۆچی دەبێت ئەو پێناسانەی (ئەویتر) بۆ رۆڵەکانیان دەکات، بەبێ رەخنە پەسەند بکەن؟[١٤٩]

ئەگەر شوێنی ژن ماڵە، بۆچی سەدەها هەزار ژن پەلکێشی ناو هێزی کار کراون؟ ئەگەر گشتخوازی بناغەی سەرمایەدارییە، بۆچی بەکردەوە ژنان ناگرێتەوە؟ ئەگەر بنەمای بەخشینی پاداشت شایستەی چۆنایەتیو چەندایەتی کارە، بۆچی ژنان لە هەلومەرجی کاری یەکسان لەگەڵ پیاواندا دەبێت حەقدەستێکی کەمتر وەرگرن؟ ئەگەر لە توانای ژناندا بێت ببنە کرێکاری سادە، تایپیستو سکرتێری باش، بۆچی ناتوانن ببن بە کرێکاری لێهاتوو، یاسازان، پزیشكو...؟ ئەگەر ژنان دەتوانن ببنە مامۆستای سەرەتایی باش، بۆچی ناتوانن ببن بە مامۆستای زانکۆیی باش؟ و ئەگەر ژنان بتوانن لێهاتووییان لە کاری دەرەوەی ماڵدا بسەلمێنن بۆچی ناتوانن لە ژیانی سیاسیشدا وەکو ژیانی ئابووری بەشدارییان هەبێت؟ و... وا دەردەکەوێت ئەم دۆخە پڕ دژایەتییە دەیتوانی لە فۆرمۆلیزەبوونی هوشیاری لەمەڕ دۆخی هاوبەشی ژنان یاخود ناسنامەی ژنان وەك گروپێك کاریگەر بێت.

بەزۆری باس لەم خاڵە دەکرێت کە بەدرێژایی مێژوو، پیاوان بە بەرجەستەکردنی "ژن" وەکو "ئەویتر" ناسنامەیان بەخۆ بەخشیوە، ئێستا ئەو ژنانە، دەیانبینی سەرەڕای جیاوازییە چینایەتی، هزری، نەژادی، پیشەییەکانو.. هتد رووبەڕووی جیاکاری یەکلایەنەدەبنەوە کە لەلایەن هەموو پیاوانەوە بە چاوپۆشی لە دۆخی چینایەتی، هزری، رەگەزی، پیشەییو تایبەتمەندییە جیاوازەکانیان بەسەریاندا پیادە دەکرێتو لە ئەنجامدا ئەم شتە پیاوەکانی بە "ئەوێکی تر" گۆڕی کە سەرچاوەی پیادەکردنی ستەم، جیاکاری.. هتد بوو لەسەر ژنان.

لەلایەکی دیکەوە، پێویستە سەرنج بدەین کە سەرمایەداری ئیمکانیاتو ئاسانکاریگەلێك دەهێنێتە ئاراوە کە لە زەمینە خۆشکردن بۆ کردەی بەکۆمەڵ (چ بۆ





ژنانو چ بزاڤە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە)کاریگەر بوو. شارنشینی بەمانای زۆربوونی سەرچاوە، ئەگەری پەیوەندی زێتر، کەمکردنی کارەکانی ماڵەوەو بەگشتی ئازادبوونی کاتی ژنان بوو. ژنان بەتایبەتی لە چینی ناوەڕاست سوودمەند بوون لە کاتو پارەی زیاد بۆ چالاکییە خەیری، بەرژەوەندی گشتیو.. هتد ئەم جۆرە چالاکییانە بەو مانایە بوون کە ئەوان هونەرەکانی رێکخستنیو... فێردەبوونو دەهاتنە ناو کایەی گشتییەوە.[١٥٠]

هەروەها ئەو ژنانەی کاریان لە کەرتە جیاوازەکانی ئابووریدا دەکرد بەرەبەرە (هەرچەندە لە ئاستێکی سنووورداردا) دەهاتنە نێو سەندیکا کرێکاریو پیشەییەکان یاخود کۆمەڵەو سەندیکای تایبەت بەژنانیان دادەمەزراندن. ئامادەیی ئەم ژنانە لە مانگرتنە کرێکارییەکان، خۆپیشاندانەکان، تورە رێکخراوەییەکانو... بەمانای زێدەبوونی توانایە کۆمەڵایەتی ـ سیاسییەکانیان بوو.[١٥١]

هەروەها وەرچەرخانە تەکنەلۆژییەکانی گەیاندن لە سەدەی نۆزدە هۆکارێکی دیکە بوو لە هۆکارە ژێرخانییە زەمینەسازەکان بۆ بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان. دروستکردنی هێڵی ئاسنی سەرتاسەری، تێلەگرافو تەلەفۆن بەمانای گەیاندنی ئاسانتر، خێراترو ئەرزانتر بوو و، دەیتوانی بەمانای ئاسانکاریو خێراکردن بێت لە رێکخستن بۆ بزاڤە کۆمەڵایەتییەکانو لەوانەش بزاڤی ژنان.[١٥٢]

### دەوڵەتی مۆدێرنی لیبرالو مافەکانی ژنان

دەشێ بڵێین دەوڵەتی مۆدێرن لە دوو لاوە کاریگەری لەسەر دروستبوونی فیمنیزم هەبوو. لەلایەکەوە دەروازە یاساییەکان کە دەوڵەت زامنیان بوو (وەك بەرگریکردن لە ئازادییە مەدەنییەکان، ئازادی کۆبوونەوە، ئازادی رادەربڕین...) کاریگەرییان هەبوو لەوەی ژنان بخەنە نێو دۆخێکی پڕ لە ناکۆکیو لەلایەکی دیکەوە، بەشێك لەم تەرتیباتە یاساییانە، ژنەکانی لە رووی ئەگەری دەربڕینی خواستو بۆچوونەکانیان خستە ناو دۆخێکی گونجاوو لە ئەنجامدا، زەمینەیەکی گونجاوی دەرەخساند بۆ خستنەڕووی





بیروبۆچوونی ژنان. لەم بەشەدا ئاماژە بەم دوو جۆرە کاریگەرییەی دەوڵەتی مۆدێرن دەکرێت.

تاکگەراییو مافەکانی تاکەکەسی لە پرەنسیپە بنچینەییەکانی دەوڵەتی مۆدێرنن لە رۆژئاواو لە بنەڕەتدا فەلسەفەی وجودی دەوڵەت بەدابینکەری ئەم مافە تاکەکەسییانە پێکدەهێنێت. بەڵام بەو شێوەیەی سایپر دەڵێت، "تاك" یان "کەس" بوونەوەرێکی ئەبستراکت (رووت)ە کە خاوەنی مافگەلێکەو بە"هاووڵاتی" لە قەڵەم دەدرێت، واتە ئەو کەسەی کە دەبێت کۆمەڵگای مەدەنی کۆنترۆڵی بکاتو دەتوانێت ببێتە سۆژەی سیاسی، ئەو تاکەکەسێکی "سەربەخۆ"یە کە کۆمەڵێك "وابەستەیی شەخسی" هەیە.[١٥٣] لە ئەنجامدا، چەمکی "تاکەکەس"، "کەس"و "هاووڵاتی ئەکتیڤ" زۆر لە مرۆڤەکان ناگرێتەوە. واتە بەشێکی کۆمەڵگا لەوانەش ژنان، تەنیا "ئۆبژە یاخود بابەتی سیاسەتەکانی دەوڵەت" بوونو ئەوە "هاووڵاتییە ئەکتیڤەکان" بوون مافو ئەرکەکانی ئەوانیان دەستنیشان دەکردو ئەوان ناچاربوون پەسەندیان بکەن. لە سەدەی نۆزدەشدا وەك سەدەکانی پێشتر، ژنان لە بەشێکی سەرەکی مافە تاکەکەسییەکان لەوانەش مافی خاوەندارێتی، میراتو مافە سیاسییەکان بێبەش بوون، هەڵبەت لە ئەمریکا بەتایبەتیش لە نێو ئەنگلاند بەپێچەوانەی ئەوروپا، بەشێوەیەکی تایبەتی لەبەر بەهێزبوونی گیانی یەکسانخوازی لە نێو لەخواترسەکاندا، لە کاتی نەبوونی وەسیەتنامەش کچ لە میرات بێبەش نەدەکرا. کەسەکان لە رێکخستنی وەسیەتنامەدا ئازاد بوونو لەکاتی نەبوونی وەسیەتنامە، دوو هێندەی کچان میرات بەر کوڕان دەکەوت. بەڵام لە هەندێك ویلایەتدا تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە بنەمای "مافی کوڕی گەورەتر"[١٥٤] زاڵ بوو، بەپێی ئەو بنەمایە ئەگەر باوك بەبێ وەسیەتنامە کۆچی دوایی کردبا، زەویوزارەکانی دەگەیشتنە کوڕی گەورە، بەڵام لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە ئەم پرەنسیپە لە هەموو ویلایەتەکان هەڵگیراو جگە لە کارۆلینای باکووری کە پارەوپوولەکان بە یەکسانی لە نێوان کوڕەکاندا دابەش دەکراو لە نێوجێرسی، کە میرات

بەکوڕەکان دوو هێندەی کچان دەگەیشت، تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە لە زۆربەی ویلایەتەکانی ئەمریکا یاسای یەکسانی میرات جێبەجێکراوە.[١٥٥]

لە هەمان کاتدا، لە بارەی ئەو ژنانەی مێردیان هەبوو هەم لە ئەورووپاو هەم لە ئەمریکا، بنەمای "ئەو ژنەی سەرپەرشتی دەکرێت"[١٥٦] پیادە دەکرا. بەگوتەی میللەت، ژنانو منداڵان بەگشتی وەك "گچکەکان"[١٥٧] سەیریان دەکرا. بناغەی فەلسەفی ئەم تێگەیشتنە یاساییەش ئەوەبوو کە "ژنان لە بنەڕەتدا لە هەموو رەهەندەکانی، بەرگەگرتن، توانای ماسولکەیی، وزەی روحی، هێزی بەکارهێنانو کۆکردنەوەو سەرنجدانی هەمیشە لە پیاوان بێهێزترن".[١٥٨] بەپێی مافە عورفییەکان[١٥٩] ژنان لەگەڵ مێردکردن بە مەرگی مەدەنی دەگەیشتنو لەسەر بنچینەی ڕاڤەی بەناوبانگو زاڵی بالاك ستۆن، ژنو مێرد لەگەڵ بە هاوسەربوونیان لە رووی یاساییەوە دەبن بەیەك، واتە بوونی یاسایی ژن لەو قۆناغەدا کە مێردی هەیە هەڵدەپەسێردرێت یاخود بەلای کەمەوە پەلکێشی نێو بوونی مێرد دەکرێتو تیایدا سەقامگیر دەبێتو ژن لە ژێر سایە، پشتیوانی و سەرپەرشتی پیاودا کار دەکات...[١٦٠]

ئەمە بەو مانایە بوو کە ژنان لە دوای هاوسەرێتی نەیاندەتوانی هیچ گرێبەستێك ئیمزا بکەن، سەبارەت بە داهاتی خۆیان، سەبارەت بەپارەوپولیان (تەنانەت ئەگەر لەڕێی میرات یاخود وەك جیازی پێیان گەیشتووە) یاخود سەبارەت بەمنداڵەکانیان (لە هەلومەرجی جیابوونەوە لە هاوسەرەکانیان) هیچ مافێکیان نەبوو. لەبەرامبەردا، ئەوە مێرد بوو سەبارەت بەخاوەندارێتیو خەرجکردنی پارەوپولەکانی خێزانو بەرێوەبردنی ئەم پارەوپولانە دەسەڵاتێکی پاوانکارانەی هەبوو.[١٦١] لەگەڵ ئەوەی ڕاڤەی بالاك ستۆن بەکردەوە لە زۆر باردا بەکار نەدەهات، بەڵام بە هەرحاڵ، روونو دیار بوو بەپێی تێگەیشتنی یاسایی زاڵ، ژن وەکو مێردەکەی "کەس"ێك نییە، لە حاڵەتەکانی ناکۆکی نێوان هاوسەرەکان، یاسا بە بەرژەوەندی پیاو دەهاتە ناوەوەو "مەرگی مەدەنی" دەیتوانی ببێت بە" بارێکی گەورەی نادادپەروەری".[١٦٢]



ئەم میراتە نەریتیەی فیۆدالیزم وێڕای ئەوەی لە قۆناغی پێش پیشەسازیدا کە بەگشتی بەشی زۆری ژیانی پیاوانو ژنان هەردووکیان لە دەوروبەری ماڵ بوو نەدەبووە هۆی هیچ نارازیبوونێك، بەڵام لە سەدەی نۆزدەیەم کاتێك ژنان بەکردەوە بۆ ناو ژیانی ئابووری مۆدێرنو "کار"ی دەرەوەی ماڵو کایەی گشتی هاتبوونو دەیانتوانی بەسەربەخۆیی ئابووری رێژەیی بگەن، ئەوەی مێرد بتوانێت "حەقدەستی کاشی هاوسەری یاخود کچە کرێکارەکەی هەڵگرێت لە راستیدا بووە کێشەو ژنانی لە نایەکسانی زێتر ئاگادار دەکردەوە"[١٦٣] چاوەڕێ لە ژنان دەکرا لە رۆڵی خۆیاندا وەك کرێکارو کارمەند و... هەموو ئەرکەکانی هاوکارە پیاوەکانی خۆیان ئەنجام بدەن، ئەویش بەحەقدەستێکی کەمتر، تەنانەت سەبارەت بەهەمان حەقدەستیش ـ لەو کاتەی بەمێردبوون ـ مافێکیان نەبێت، پیاو هەرچەندیش "کەسێکی نابەرپرسو سەبارەت بەهاوسەرو منداڵەکانیش بێباك بێت" دیسانیش لە رووی یاساییەوە دەیتوانیو "مافی هەبوو" "هەر ساتێك کە بیەوێت داوای حەقدەستی ژن بکات"[١٦٤] ئەم "ماف"ەش دەوڵەت وەکو زامنی پیادەکردنی یاسا مافییەکان دابینی دەکرد: دەوڵەت وەکو رێکخەری پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دیسان بۆ کاری ژنان سنوورداری دروست دەکرد. لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە یاساگەلێکی بۆ رێگەگرتن یاخود سنووردارکردنی کاری ژنان دانا. هەندێك لەم یاسایانە وەك "پشتیوانی" لە ژنان دەنووسران ـ بۆ نموونە دوورخستنەوەیان لە کارە قورسە جەستەییەکان، یاخود سنووردارکردنی سەعاتی کار یان مەترسیدار بینینی هەندێ جۆرە کار بۆ سەلامەتی ژنان یاخود ئەخلاقیاتیان ـ و لە هەندێکی تردا سنوورداری بۆ کاری ژنان لەسەر بنچینەی پرەنسیپی "وابەستەییان بەماڵەوە" لەبەرچاو دەگیرا. لە ئەنجامدا کارکردنی ژنان لە هەندێك پیشەدا قەدەغە بوو.[١٦٥] ئەم یاسایانە بۆ ئەو ژنانەی یان هێزی خۆیان لە کاردا بەکەمتر لە هێزی پیاوان نەدەبینی، یاخود بەو داهاتەی لە کارەکە دەهاتەوە بۆ دابینکردنی ژیانی خێزانیان پێویستیان پێبوو بەمانای بوونی دژایەتی نێوان رەوشی پراکتیکیو یاساییان سەیری دەکرا.





لەلایەکی دیکەوە، ئەو ژنانەی بەکردەوە لەگەڵ چالاکییە ئابوورییەکانیان کە ئێستا ئیدی لە کایەی گشتیدا بوون ـ هاتبوونە ناو پانتایی گشتی، مافە سیاسییەکانیان لە دەستدا بوو، واتە بەکردەوە لە بەشێکی کایەی گشتی دوورخرابوونەوە. ئەوان مافی دەنگدانیان نەبوو ئەمە لە هەلومەرجێکدا بوو کە لە دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانو جاڕی سەربەخۆیدا باسی یەکسانی، ئازادیو مافەکانی مرۆڤ کرابوو، ئەو پەیڤەی وەك "پیاوەکان" ڕاڤە دەکرا، دواجار بەسەر ژندا نەدەگشتێنرا. هەڵبەت دەگوترێت ژنان دەتوانن نفووزی خۆیان بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ پیادە بکەن. زۆر لە تاکەکان پێیانوابوو دنیای سیاسەت دنیایێکی نائەخلاقییەو نابێت ژنان ئامادەییان تیادا هەبێت، بەڵام لەلایەکەوە، هەوڵدان بۆ پیادەکردنی "نفووزی ناراستەوخۆ" هەم کاتێك لە کاتەکان وەکو چالاکییەکی لێدەهات لە کایەی گشتیدا (بۆ نموونە لە خەباتدا بۆ ئازادی کۆیلەکان یاخود چالاکییە خەیرییەکان) ناچار لە زۆر حاڵەتدا، ڕەهەندی سیاسی بەخۆوە دەگرت، چونکە هەندێ جار بەمانای پێویستی بەپیادەکردنی "نفووزێکی" ڕاستەوخۆ لەسەر یاسادانەرانو بڕیاردەران بوو، لەلایەکی دیکەوە، ژنان نەیاندەتوانی پاساو بۆ ستانداردی دووانەیی ئەخلاق بۆ ژنانو پیاوان بهێننەوە. هاریت مارتینو[١٦٦] لەم بارەیەوە دەڵێت:

> لەبارەی ئەم باسە کۆنەوە ـ نفووز لەبەرامبەر بەرپرسیارێتی ـ بەبۆچوونی من، ئەگەر نفووز بۆ ئەخلاقو خووی مرۆیی باشەو بەرپەرچدانەوەی پلەوپایەو بەرپرسیارێتی خراپ، ڕەوشی ئێستای [ئەخلاقی] پیاوان هێندە خراپە کە تەنانەت بیرکردنەوە لەبارەیەوە دەتوانێت کوفرئامێز بێت، بەڵام ئەگەر لەبەرامبەر، بەرپەرچدانەوەی پلەوپایەو بەرپرسیارێتی باشەو ژیان هاوشان لەگەڵ پیادەکردنی نفوزی خراپ، ئەوا مافی ژنانە داوا بکەن دۆخی ئەوان دەبێت چاکسازی بکرێت.[١٦٧]

ئێستا، ئایا ژنان لەم بوارەدا "مافێکیان" هەبووە کە لێیان سەنرابێتەوە یاخود "داواکاریان" هەیە کە دەبێت بگۆڕێن بۆ ماف؟ بەسەرنجدان لە ڕاڤەی زاڵی دەستوورو



جاڕنامەی سەربەخۆیی، ژنان مافی سیاسییان نەبوو وەك بەشێك لە "مافە داهێنراوەکان" کەواتە داواکارییەکانیان دەیتوانی چ بنەمایەکیان هەبێت؟ بەزۆری لەبارەی ئەو مافەی کە یاسا بەرەسمی دانیپێدا نانێت دەشێ دوو جۆر بنەما لەبەرچاو بگرین، داب (عرف) و ئەقڵی مرۆیی.[١٦٨] لەبارەی ژنانەوە وادەردەکەوێت ئەم مافە وەك دابیش بوونی نەبوو، بەڵام جەخت کردنەوە لەسەر "ئەقڵی مرۆیی" وەك یەکێك لە تەوەرە سەرەکییەکانی گوتاری مۆدێرنیتە بوو کە دەکرا پەنای بۆ ببرێت.

یەکێك لە تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی دەوڵەتی لیبراڵ زامنکردنی ئازادییە تاکەکەسییەکان بوو. ئازادی دەربڕین یاخود ئازادی پێکهێنانی کۆمەڵە یان ئازادی چاپەمەنییەکان ـ وەك ئامرازی بەدیهێنانی "سەرچاوە بەدیلەکانی زانیاری"تایبەت بەکاری سیاسی، واتە کایەیەك کە ژنان بەرەسمی لێی فرێدرابوونە دەرەوە، لێنەدەهات. ئازادی دەربڕین بەو مانایە بوو کە تاکەکان دەتوانن "قسە بکەن، لەگەڵ برادەرەکانیان، وابەستەکانیان، هاوسێکانیانو تەنانەت لەگەڵ ئەو کەسانەش کە تەواو بیانین". ئازادی چاپەمەنییەکان نەك تەنیا بەمانای ئەگەری چاپی ڕۆژنامەو گۆڤار بەڵکو بەو مانایە بوو کە ئەوان دەیانتوانی "بیروڕاکانیان بەچاپ بگەیەنن... دەتوانن دەستنووسێك یاخود سیپارەیەك چاپ بکەنو لە کەناری جادە دابەشی بکەن یاخود بەپۆست بۆ ئەوانی دیکە بنێرن... دەتوانن کتێب بنووسنو بفرۆشن". ئازادی پێکهێنانی ڕێکخراو و کۆمەڵە یاخود پەیوەندیکردن بەڕێکخراو و دامەزراوە و کۆمەڵەکان بەو مانایە بوو کە تاکەکان دەیانتوانی "لەگەڵ تاکەکەسە هاوبیرەکانیان ڕێکخراوگەلێك دروست بکەن یاخود لە دەوری یەکتر کۆببنەوەو لەگەڵ هەڵگرتنی نیشانەگەلێك لە ڕێوڕەسمێك، خۆپیشاندان بە دەوری ساختومانی شارەوانی، نووسینی عەریزە بۆ حکومەت... ئەوانی دیکەش لە بیروبۆچوونیان ئاگادار بکەنەوە".[١٦٩]

ژنان دەیانتوانی بەشێوەی جۆراوجۆر سوود لەم هەموو توانایانە وەرگرن. ئەوان دەیانتوانی لەگەڵ دوستو ناسیاوەکاوەنیان یاخود کەسە بیانییەکان باسی هەڵسوکەوتی خراپی هاوسەرو منداڵەکان یان گرانیو کەمبوونی کەرەستەی خواردەمەنی یان گرفتە





کۆمەڵایەتییەکان یاخود کەمی حەقدەست یان نەبوونی مافی دەنگدان بکەن. دەیانتوانی کتێبو گۆڤار لەبارەی چێشتلێنان یانماڵداریو بەخێوکردنی منداڵ یاخود مافە ئابووریو سیاسییەکانی ژنان چاپ بکەن یان چەند سیپارەیەك لە بارەی رەوشی خراپی توانا ناوخۆییەکان یاخود کێشەکانی شار یان رەوشی ناسکی رەشپێستەکان یان مەسەلەی تایبەتی ژنان بکەن. دەیانتوانی لە دەوری یەکتر کۆببنەوەو نەخشو نیگارو بەرگدووری بکەنو چێشت لێبنێن، گوڵدوزی بکەن، ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە سوودی گشتیان هەیە، بچنە کەنیسە، لایەنگری لە مافی بێهێزەکان بکەن، بکەونە دژایەتی لەگەڵ کۆیلایەتی یاخود کۆمەڵەی بەرگریکردن لە مافەکانی کار یان مافە سیاسییەکانی ژنان پێکبهێنن. بوونی ئەم ئیمکانیاتانە بەبێ دەستنیشانکردنی ناوەڕۆکی تایبەتی بۆ ئەوانو بەشێوەیەکی هێزەکی ئامرازێکی زۆر گونجاو بوو تاکو بیروڕاکانیان دەربڕن. گوژمەکەشی بەشێوەیەکی تایبەتی زۆر، واتە لەگەڵ قەدەغەکردنێك کە پێویستی بەخۆفیداکردن یاخود خۆبەخت کردنو... بێت هاوکات نەبوو. ژنان بەشێوەیەکی هێزەکی دەیانتوانی بەبێ قەدەغەکردنی یاسایی دەست بە رێکخستنو دەربڕینی بیروڕاکانیان بکەن. بوونی ئەم ئاسانکارییانە لەتوانایاندا بوو ئەگەری دەربڕینی بیروبۆچوونەکانو کاریگەری لەسەر بیروڕا گشتییەکان بەژنان ببەخشێت.

بەم شێوەیە، دەوڵەتی لیبراڵ دیمۆکرات، لەگەڵ بوونی سنوورداری پانتاییو سەرتاپاگیری "دیمۆ"یان خەڵك بەمانای هاووڵاتییە کاراکان لە ڕووی رەخساندنی زەمینەی ستراکتووری مۆبالیزە بۆ بزاڤێکی کۆمەڵایەتی بە تایبەتی لە نێو ژناندا رۆڵێکی پۆزەتیڤو نکۆلی لێنەکراوی هەبوو، بەچاوپۆشین لە"قەدەغەکردنی ئازادی سیاسی" بۆ ژنان لەمانا تایبەتییەکەیدا واتە ئامادەبوون لە کۆمەڵگای سیاسیو کاریگەری راستەوخۆ لەسەری بەخستنەڕووی جۆرێکی ئازادی مەدەنی ـ سیاسی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بەیەکێك لە ماناکانی هەم ئیمکانی ئامادەیی ژنانی لە کایەی گشتیدا



دەرەخساندو هەم زەمینەی ستراکتووری پێویستی بۆ مۆبالیزەی سەرچاوەکان کە پێویستی کردەی بەکۆمەڵ بوون دەخستە بەردەستی ئەوان.

پێویستە سەرنج بدەین کە ئامادەیی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بەشێوەی چالاکی نواندن لە کۆمەڵەو رێکخراوە خۆبەخشەکان یاخود کارە چاپەمەنیو بڵاوکراوەییەکان لەتەك ئامادەیی زۆر لە ژنان لە هێزی کاردا بوو. واتە ژنان کە لەسەر بنچینەی زۆر لە تیۆردانەرییەکانی فیمینیستەکان خۆیان، لە قۆناغی سەرمایەداریدا لە کایەی گشتی وەدەرنرابوون، لە راستیدا بەشێوەی جیاواز ئامادەییان تیادا هەبوو. بەڵام هەمان ئەو سنوورداریانە هاوشان بوون بەم ئامادەییە رێژەییە - واتە بەگشتی بێبەشکردن لە مافی دەنگدانو جیاکاریو سنووردارییەکانی کارـ رەوشی ژنانی دەگۆڕی بۆ گرفتێك.

بەم شێوەیە، دەوڵەتی مۆدێرنی پشت ئەستوور بەرژێمی لیبراڵ ـ دیمۆکرات وێڕای ئەوەی ژنەکانی لە کایەی کۆمەڵگای سیاسی وەدەرنابوونو بەڕەسمی دانی بە زۆر مافدا نەدەنا بۆ ژنان، لەلایەکەوە لەبەر گشتیبوونی چەمکە مۆدێرنە زاڵەکان لە سەری وەك یەکسانی، ئازادی و، مافەکانی مرۆڤ و دژایەتی ئەم گشتخوازیە لەگەڵ رەوشی تایبەتی بۆ ژنان دووچاری دژایەتی دەروونی هاتبوو لەلایەکی دیکەوە، لەگەڵ بەڕەسمی ناسینی کردەیی بەشێك لە مافو ئازادییە سیاسیو مەدەنییەکان بۆ ژنان، رێگەی بۆ هاتنی ژنان بۆ نێو کۆمەڵگای مەدەنی هەموار دەکرد.





## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

1. Historical conjuncture

2. W. Chafe, *The American Women: 1920_1970*, (New York, Oxford University Press, (1972),P.ix

3. Alice Rossi

4. Chafe. *Ibid*

5. Taylor, Social Science and Revolution, (New York, st. Martin Press, 1984), J.Davies “Toward a Theory of Revolution” *American sociological Review 27* (1962) pp.1_2; T.R. Gurr, *Why Men Rebel,* (Princeton, Princeton University Press, 1970).

6. modernity

7. D. Sayer, *Capitalism and Modernity*, (New York and London, Routledge, 1991), P.114.

8. A. Giddens, *The Consequences of Modernity*, (Cambridge, Polity Press, 1990), p. 37.



9. A. Giddens, *Beyond left and Right*, Cambridge, (Press polity, 1994)p.237.

10. Lash and J. Urry, *The End of Organized Capitalism*, (Madison WI, The University of Wisconsin Press, 1987), p.13.

١١. بۆ لێکۆڵینەوە لە کاریگەری رەگەزە جیاوازەکانی گوتاری مۆدێرن لەسەر مومکینبوونی بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان، بگەرێوە بۆ: ح. مشی رزادە (تجددو زمینەسازی جنبش های اجتماعی) مجلە دانشکدە حقوقو علوم سیاسی،ش ٤٥ (١٣٧٨).

*12. SOCIAL QIVENS.*

13. D. kolb, *The critique of pure modernity*, (Chicago, University of Chicago Press, 1986),p.z.

14. Giddens, *op. cit.,* P. 150.

15. S.Rowbotham. *women, Resistance and Revolution*. (London Allenlane, 1972) p.28.

16. Constructedness

17. K.Millett,*Sexual Politics*,(London, Sphere Books, 1972),p.65.

18. E, Flexner, *Century of Struggle:the Women’s Right Movement in the United States*. (Cambridge. Belknap Preesef Harvart University, 1959) .p.14.

19. S. Rowbotham*, Womwn in Movement: feminism and social Action*. (London and New York. ̊outledge, 1992)20.

20. George Fox.





٢١. Society of Friends کۆمەڵەیەکی ئایینییە کە لە سەدەی حەڤدەیەم لە ئینگلتەرا دروست بوو. جۆرج فاکس پێیوابوو تاکەکەس هیچ پێویستی بەواسیتەی روحی نییە بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵ روحی خوایی‌و دەتوانێت سوود لە "رووناکی دەروونی" خۆی بۆ رێنماییکردنی وەرگرێت، چونکە ئەم رووناکییە تیشکێکە لە روحی قودسی. هەروەها کوئیکرەکان بڕوایان بە یەکسانی تەواوە پێویستی برەوسەندنی خۆشگوزەرانی گشتی هەبوو.

22. 1 A. Sinclair, *The Better Half*, (New York, harper and Row, 1965)p. 22; G.

23. g. Yates, *Wath Women Wont*, (Cambridge, MA, Harvand University Press, 1975), p.24.

٢٤. امیشیل، جنبش اجتماعی زنان، ترجمه ه. زنجانی زاده، (تهران، روشنگران، ١٣٧٥)

25. Personalism.

26. Self_ development.

27. Rowbotham, *Women, Resistance…, op cit.,* p.28.

28. Rowbotham, *women in movement…, op. cit.,* p. 20.

29. M.R.Beard, *Women as Force in History*, (Macmillan, New York, 1947), p. 96.97.

30. S. Mucherjee and S. Ramaswamy, “Introduction”, in M. Wolston_ craft, *The Vindication of the Rights of women*, (new Delhi, Deep & Deep, 1992 (1792),p.ixi.

31. Millett. *Op. cit.*. p. 74



32. C. Epstein, *Deceptive Distinctions: Sex, Gender and the Social Order* (New Hoven, Yale University Press, 1988).p,14.

33. V. l.bullough, *The Subordinate Sex*.(Urbana, University of I linois Press, 1973),pp. 293_94.308.9.

34. Rowbotham, *Women in Movement*, op.cit., p.22

35. Bullough,*op.cit*.

36. les philosophes.

37. self_realization.

38. David Hume.

39. William Wollaston.

40. *Ibid.*, pp.268_9

41. Tom Paine, *Paine’s Political Writings*, (London, Wattsand co., 1909),p.131.

42. Roland.

43. Olympe de Gouge.

44. de Gournay.

45. *L'Egalite des Hommes et des Femmes*.

46. Cathrine Macuuley.

47. Rowbotham*, Women in Movement,op, cit.,* pp. 20 and 37, *Women, Resistance, op. cit.,* p. 28.





48. Abigial Adams.

49. W.E. Brownlee, and M.M. Brownlee, *Women in The American Economy: A Documentary History*, 1675 to 1929. (New Havens, Yale Unversity Press, 1976).

50. Judith Sergeant Murray.

51. Flexner, *op. cit.,* p. 16.

52. Wollstoncroft. *op. cit*.

53. A. Oakley, *Subject Women*. (New York. Pantheon Book, 1981)p.4

54. Sinclair, *op. cit.,* p. 49.

55. Mukherjee and Ramaswamy, *op. cit.,* p.xx.

56. Edmond Burke

57. Rowbotham, *Women in Movement*, *op. cit.*

58. Wollstoncraft, *op cit.,* p.60.

59. *Ibid,* pp. 60, 171.

60. William Thompson

61. Amma Wheller

62. Rowbotham, *Women in Movement*, *op. cit.,* p. 37.

*63.* Hanna Mather Crocker, *Observations on the Real Rights of Women*



64. Margaret Fuller, *Women in the 19th Century*, (New York, Greenwood, 1971, (18451)

65. Sinclair, *op.cit.,* p. 51

66. Harriet Taylor

67. John Stuart Mill, "The Subjection of Women" *In Three Essays by* J.S. Mill, (Oxford University Press, 1966, (1869),pp.452_3.

68. *Ibid,* p. 532.

69. J. Mitchell, *Women's Estate*, (Harmondsworth, penguin, 1971), p.66.

70. Charles Fourier

71. Rowbotham, *Women in Movement, op. cit.,* p. 51.

72. Rowbotham, *Women, Resistance..., op.cit.,* p.51.

73. بگەڕێوە بۆ:

rowbotham, *Women in Movement, op. cit*., Mitchell, *op. cit.,* millet, *op. cit.,* Rowbotham, *Women, Resistance, op. cit.*

74. Auguste Bebel

75. Mitchell*, op. cit.,* Rowbotham*, Women, Resistance, op. cit.*

76. C. N. Degler. "*Revolution Without Ideology*: the Changing Place of Women in America" In R. j. Lifton, ed..*The Women in America* (Boton, Houghton, miffin co., 1964),p.194.





77. J. R. T. Hughes "*Industrialization: Economic Aspects*" *in International Encyclopedia of social sciences*. (New York, Macmillan, 1968), vol.7, pp.252_53.

78. S. bowles, and R. Edward, *Understanding Capitalism*. (New York, Harper and Row. 1985).p.92.

79. B. Sancier, and P. Mapp" *Who Helps Working Women Care for the Young and the Old?*" in R. Brown, ed., *Women's Issues*. (New York, Wilson comp, 1993), p. 91.

80. I. Wallerstein . *Historical Capitalism*. (London, Verso, 1983), p. 225.

81. H. Kroos, *American Economic Development*, (Englewood clifts, N, Prentice Hall. 1966), p. 349.

82. P. Armstrong, et al. *Capitalism Since world War II*. (London, Fontanan, 1984).p.31.

83. Wallerstein. *op. cit.,* p. 24.

٨٤. تەنانەت کارگەو دوکانەکانیش وەکو کێڵگەکان لەتەك خانووەکان بوونو ئەگەر لە رووی فیزیکیەوەش لێیان دووربن، کار تیایاندا بەزۆری بە بەشداری ئەندامەکانی خێزان فۆرمۆلیزە دەبوو.

85. domestic

86. Sayer, *op. cit.,* p. 36.

87. D. Kolb, *The Critique of Pure Modernity*. (Chicago, University of Chicago Press, 1986), p.22 ـ 3.



88. Oakley, *op. cit.,* p.6.

89. Sayer, *op. cit.,* p.36.

90. Oakley, *op. cit.,* p.6

91. Wallerstein, *op. cit.,* p. 25.

92. H.m. Hernes, *Welfare State and Women Power*. (Oslo, Norwegion University Press, 1987)p.53.

93. domesticity.

٩٤. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لە دەربڕینی نووسەرە جیاوازەکاندا هەندێجار ئەم دوو زاراوەیە بەیەك مانا بەکاربراونو هەندێجار بەدوو مانای جیاواز. وادەردەکەوێت لەبەرکارهێنانی زاراوەی (لەماڵدامانەوە) زێتر جەخت لەسەر جیاوازی فەزای ژنان دەکرێتو لە دەکتۆرینی "ڤیکتۆریایی" دا جەخت لەسەر رێزگرتنو ئەو پێگەیە دەکرێت کە لە پلەو پایەی جیاوازی ژنانەوە سەرچاوە دەگرێت، رێبازی شاسواریو "رێزگرتنی" پیاوان سەبارەت بەژنان (وەکو شێوەی کرانەوەی دەرگا بەرووی ژندا، هاوکاریکردنی ژن لە سواربوونو دابەزین، لە دوای ئافرەت رێکردن، دانەنیشتن تا ئەو کاتەی ئافرەت بەپێوەیەو..) لەم باسەدا بەهەردوو رەهەند سوود لە زاراوەی لەماڵدامانەوە وەرگیراوە.

95. Epstein, *op. cit.*

96. submissiveness.

97. Yates, *op. cit.,* p. 41.

98. Bullogh, *op. cit.,* pp. 283, 278.

99. compensation.

100. *Ibid.,* p. 310, Epstein, *op. cit.,* 195; Rowbothom, *Women, Resistance, op. cit.,* pp. 71—72. R. S. Gottlieb, *History and Subjeetivity*.(Philadelphia, Temple Uneversity Press, 1987). P. 131

101. Margaret Benston.

102. use value.

103. Oakley, *op. cit.*.pp.166_67.

104. Feminity

105. Epstein, *op.cit.,*p. 195.

١٠٦. پێویستە سەرنج بدەین بەڕای زۆر لە ئابووریناسان یەکێك لە رێگە چارەسەرەکییەکانی چارەکردنی ناکۆکی نێوان کرێکارو سەرمایەداران لەسەر رێژەی حەقدەستەکان ئەوەیە خستنە ڕووی کار پێش داواکردنی بکەوێت یاخود بەدەربڕینێکی دیکە (بێکارییە). مەترسی بێکاری دەبێتە هۆی لاوازبوونی پێگەی پڕبێژی کرێکاران‌و زامنی سەرەکی سوودە کارکردنی کامل تەنیا لەقۆناغە ریزپەڕەکاندا هەیە (Bowles and Edwards, *op.cit.,* pp. 10_12) سەرەڕای ئەوە بێکاری بەمانای زامنکردنیەتی کە ئەگەر داواکاری بۆ بەرهەمێك چووە سەرەوەو پێویستی کرد بەرهەمەکەی زیاد بکات. هێزی کار وەکو یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی قەبارەی بەرهەمهێنان بەگوژمەی کەم هەبێت تاکو بەرهەمهێنەر بتوانێت سوود لەدەرفەت وەرگرێت. (Wallerstein. *op. cit.,* pp21)

107. dysfunctional

108. Bullough,*op. cit.,* pp. 284_88.

109. Sinclair, *op. cit.,* ch.3.

110. S. A. Marglin."*What Do the Bosses Do*? The Origins and Functions of Hierardny in Capitalist Production." In A. Giddens and D. Held. eds.



*Classes, Power and Conflict*. (Cambridge, Cambridge University Press, 1982).pp.285.98.

111. P. Morton. "*The Evolution of Family under Capitalism*". In R. Edwards et al., eds., *The Capitalist System*. (Englewood Cliffs. NJ. prentice Hall, 1972).pp.121_23.

112. Oakley,*op. cit.,* p. 136

113. S.J. Kleinbery, ed. *Retrieving Women's History: Changing Perceptions of the Role of Women in Politics and Society*. (Paris, bery/UNESCO, 1988).

114. Flexner, *op. cit.,* p. 131

115. K. Marx. "*The Class Basic of Politics and Revolution*" (1852) In R. Collins. ed., *Three Sociological Traditions; Selected Readlings.* (New York. Oxford University Press. 1985).p. 367.

116. universalism

117. I. Wallerstein. "*The Ideological Tensions of Capitalism*." In J. Smith, et al., eds., *Racism, Sexism, and the World System*. (New York: Green wood, 1988), pp.5_6.

118. E. Garnsey, "*Women's Work and Theories of Class and Stratification.*" In Giddens and Held, eds, *op. cit.,* pp. 425_45.

119. sexism.





120. K.Amundsen, *The Silenced Majority: Women and American Democracy*. (Englewood cliffs, NJ. Prentice Hall, 1971) .p. 54.

121. Rowbotham, *Women, Resistance*, *op. cit.,* p. 13

122. Chafe, *op.cit*., p67; Oakley*, op.cit.,* pp. 143_47.

123. Chafe*, Ibid*., p. 68.

124. Morton, *op.cit.,* 121_23

125. M. Riech, "*The Evolution of the US Labor Force*" In Edwands al., eds*, op. cit.,* p. 178_179.

126. J. R. Larus, *Women in All Ages and All Centuries: Women of America.* (Philadelphia. Ritten house Press. 1907).pp. 369.70.

127. Flexner, *op. cit.,* p. 237

128. V. k. Oppenheimer."Demographic In Fluence on Female Employment and the Status of Women".In J. Huber. ed. *Changing Women in a Changing Society*. (Chicago, University of Chicago Press. 1973).p.190.

129. Millett, *op.cit.,* p. 76: Yates, *op. cit.,* p. 26.

130. seminary.

131. Yates, *Ibid.*

132. Bullough*, op.cit.,* pp. 328_29

133. Kleinbery*, op.cit.,*p. 198; Flexner, *op. cit.,* pp. 19_20.



134. Flexner*, op. cit.,* p. 178

135. R. Rapp, and E, Ross."The Twenties Blacklash: *Compulsory Hetero Sexuality*, the Consumer Family and the Waning of Feminism"In H. Lessinger and A.Swerdlow, eds., *Class, Race and Sex*. (boston, G.K.Hall & co., 1983), p.94.

136. D. Reische, ed. *Women and Society*. (New York, Wilson and co. 1972) pp.64_66.

137. Sinclair. *op. cit.,* p. 100.

138. M. Schnier,ed., *Feminism:The Essential Historical Writings*. (New York, Rondom House. 1972).p.49.

139. *Ibid.,* pp. 266_267.

140. Klienberg, *op. cit.,* p. 209.

141. Roubotham*, Women, Resistance…,op.cit.,* p.114.

142. Flexner, *op. cit.*

143. Chafe. *op.cit.,* p.7.

144. Sinclair.*op. cit.,* p. 100.

145. Flexner*, op. cit.,*p. 178.

146. Epste. *op.cit.,* p. 150.

147. M. A. Waters, (1986 [1985]) "The Capitanist Ideulogical Offnsive Against Women Today."In J. Hansen and E. Reed, eds, *Cosmetics,*





*Fashion and the Explotion of Women.* (New York, Pathfinder, 1986), p.11.

148. Millett, *op.cit.,*p.87.

149. Schnier*, op. cit*.,p. 56.

١٤٩. بۆلا ئەم مەسەلەیە دەخاتە ڕوو پێیوایە ئەمە بناغەی دروستبوونی شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژنان پێکدەهێنێت. ئەو دەنووسێت "ڤیکتۆرینیزم ژنەکانی فێرکردن خۆیان بەچینێکی تایبەتی لە قەڵەم بدەنو کاتێك لە ناسنامەی تایبەتی خۆیان وەئاگا هاتن، چیدی نەیانتوانی ئەو پێناسانەی بۆ ڕۆڵەکەیان دەکران بەبێ ڕەخنە پەسەند بکەن...)و جەخت دەکاتەوە کە ژنان لەو هزرەدابوون کە ئەگەر بەراستی ئەوان بوونەوەری ناسکتر، بێگەردترو ئەخلاقیترن، ئەم ئامادەییەی ئەوان لە کایەی سیاسەتدا کە پێویستی بەهەموو ئەوانە هەیە پێویست دەکات (89_Bullough, *op. cit*., PP. 288)

150. Flexner. *op. cit.,* P. 179: Kleinberg, *op.cit*., 208: A. Hochschild and A. Machung, "*The Working Wife as Urbanizing Peasant*"., In Brown, *op. cit*., pp. 70_85.

151. Flexner*, op. cit.,* pp. 200_41: Chafe, *op.cit*.,pp.7,66_67.

152. Kroos, *op. cit.,* PP. 292, 325, 363.

153. Sayer*, op.cit.,*p. 85.

*154. primogenture*

155. Beard. *op. cit.,* pp. 129_31

156. Fenne Couverte

157. Ninors

158. Nillett. *op.cit*.,p. 88.



159. Common Law

160. Beard, *op.cit*., pp. 78_9.

161. D. M. Stetson, *Women's Rights in the USA: Policy Debates and Gender Roles*. (pacipic Growe.Brooks/ cole, 1990),p.138.

162. Sinclair.*op. cit.,* p. 86.

163. Bullough.*op.cit.,*p. 283.

164. Nillett.*op.cit.,* p. 67.

165. Oakley*, op.cit.,* p. 7: Stetson, *op.cit.,* p. 157.

166. Hirriet Martino

167 :بەوەرگرتن لە

Sinclair, *op.cit.,* p. 40.

168. A. H. Airch, *The Concepts and Theories of Modern Democracy*. (London and New York, Routledge, 1996), p. 116.

169. W. Ebenstein, C. Pritchett, H. Turner and D. Mann. *American. Democracy in World Perspective*, (New York. Harper and Row, 1973), p.153.





## بەشی دووەم

## شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژنان (١٨٤٨-١٩٢٠) و دەستکەوتەکانی

### پێشەکی

شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژنان لە هەلومەرجێکدا دروست بوو کە لە ئەوروپاو ئەمریکا بزاڤە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەش چالاك بوون. بزاڤی ژنان بە جۆرێك لە جۆرەکان لە هەناوی ئەم بزاڤانەوە سەری دەرهێنا، چونکە ئەو ژنە چالاکانەی لەم بزاڤانەدا چالاکی گشتی کۆمەڵایەتییان ئەزموون دەکرد، لەبەر پلەوپایەی نایەکسانی خۆیان لەنێو بزاڤەکەدا (وەك کۆمەڵێکی گەورەتر) کەوتبوونە نێو رەوشێکی ناکوکئامێزەوەو ئەم شتەش دەبووە بناغەی دروستبوونی ناسنامەیەکی بەکۆمەڵ بۆیان. سەرەڕای ئەوە، بەشداریکردن لەم بزاڤانەدا کە هەموویان لە چوارچێوەی گوتاری مۆدێرنی یەکسانیدا جێگەیان گرتبوو، هەم زەمینەی گوتاریی ختنەرووی داواکارییە سەربەخۆیەکانی ئەوانی دەڕەخساندو هەم ئەزموونی کاری رێکخستراو و پەیوەندییە پێویستەکان بەو سەرچاوانەی پێویستیان پێ بوو بۆ کردەی بەکۆمەڵ دروست دەکرد.

لە ئەمریکا بەشێوەیەکی تایبەتی، بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتی رۆڵێکی گرنگو دیاریکەری لە سەرهەڵدانی شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژناندا هەبوو. بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتی یەکێك بوو لە دەرکەوتەکانی یەکسانخوازیی مۆدێرن. لایەنگرانی بەدوای بەدیهێنانی ئایدیا مۆدێرنەکانی یەکسانیو ئازادییەوە بوونو ئەو مانایەی لە مرۆڤیان دەدایە دەست هێندە فرەوان بوو کە رەشەکانیشی دەگرتەوە[١] ئەوان بەدوای



"مرۆڤایەتی هاوبەش"و "دادپەروەری" گشتییەوە بوون بۆ هەموو مرۆڤەکان.[٢] ژنان بەتایبەتی بەسەرنجدان لە تێبینیە ئەخلاقیو ئاینییەکان، لە یەکەمین ئەو گروپانە بوون کە ئامانجەکانی بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتی پەلکێشی ناوخۆی کردن. ئامادەیی ئەوان لەم بزڤەدا یەکێکە لە هۆکارە کاریگەرەکانی دروستبوونی بزاڤی ژنان.

### قۆناغی یەکەم: لە بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتییەوە تا کۆتایی شەڕە ناوخۆییەکان

ساڵی ١٨٢٩، ژنێکی سپیپێستی باشووری لە نامەیەکدا بۆ لێیدیز ماگازین[٣] گۆڤاری خاتوونەکان کە بڵاوکراوەیەکی پارێزگاریش بوو، داوای لە هاوڕەگەزەکانی کرد بۆ ئازادی کۆیلەکان کۆببنەوە. ئەو پەنای بۆ "غەریزەی چاکەی ئەخلاقی لە ژناندا" بردو بانگەشەی کرد کە ژنان تەنانەت بە تەنیاش هێندە دەسەڵاتیان هەیە بتوانن کۆتایی بەکۆیلایەتی بهێنن.[٤] لەگەڵ دەستپێکردنی بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتیو ئامادەکردنی داواکاری بۆ نەهێشتن، زێتر لە نیوەی ئەوانەی داواکارییەکانیان ئیمزاکرد ژن بوون.[٥] هەندێك لە ژنان خانووەکانی خۆیانیان کردبوو بە ئێستگەکانی گواستنەوەی کۆیلە هەڵاتووەکان. ژمارەیەکیش لە چالاکییە کەنیسەییەکاندا کە بۆ نەهێشتنی کۆیلایەتی دەیانواندن، چالاك بوون.

لە ساڵی ١٨٣٢ بەدواوە، ژنان سەرەتا لە فیلادلفیاو بۆستۆنو دواتر لە شارەکانی دیکە دەستیان بە دروستکردنی کۆمەڵەکانی دژە کۆیلایەتی کرد. ساڵی ١٨٣٣ دەستە نێردراوەکانی دژە کۆیلایەتی لە فیلادلفیا کۆبوونەوەو کۆمەڵگای دژە کۆیلایەتی ئەمریکایان دامەزراند.[٦] سێ ژن وەك چاودێر لە دانیشتنی رێکخستنی ئەم کۆمەڵەیەدا ئامادەبوونو رێگەیان پێدرا لەسەر شانووی دانیشتنەکە وتار بخوێننەوە، بەڵام داوایان لێنەکرا پەیوەندی بەکۆمەڵەکەوە بکەن یاخود جاڕنامەی پرەنسیپە بیروباوەڕییەکانی ئیمزا بکەن[٧] - یاخود بەگوتەیەك لە گوتەکان، رەنگە نەکەوتبێتە بیری ئەو ژنانە کە لەبنەڕەتدا ئەم داوایە بکەن. دواجار، لە ئەنجامی ئەم "پەراوێزکردن"و "وەلاوەنان"ە ئەم سێ ژنە لەگەڵ ژمارەیەك ژنی دیکەی چالاك لە





دژی کۆیلایەتی بڕیاریاندا کۆمەڵەیەکی دژە کۆیلایەتی سەربەخۆی تایبەت بە ژنان لە فیلادلفیا دامەزرێنن، لەوانەش دەتوانین ئاماژە بە سارا دۆگلاس،[٨] هاریت پەرویس، لوکریشیا مۆت[٩] و ساراو ئەنجلینا گریمکی[١٠] بکەین - ئەو ژنانەی دواتر لە بواری مافەکانی ژنان پەرەیان بە خەباتی خۆیاندا.[١١]

ساڵی ١٨٣٧ کۆمەڵەی بۆستۆن نامەگۆڕینەوەی لەگەڵ کۆمەڵەکانی دیکە دەست پێ کردو لە ئەنجامدا پەیوەندی نێوان کۆمەڵە دژە کۆیلایەتییەکانی ژنان لە شارە جیاوازەکاندا بەرقەراربوو، یەکەمین "کۆنڤانیسیۆنی دژە کۆیلایەتی ژنانی ئەمریکی" لە ساڵی ١٨٣٧ لە نیۆیۆرك بەبەشداری ٨١ دەستەی نێردراو لە دوازدە ویلایەت دامەزرا. لە ڕاگەیەنراوی ئەم کۆنڤانسیۆنەدا، جەخت لەسەر مافی ژنان بۆ هاتنە ناوکاری سیاسی کرایەوە. لەوەودوا کۆنڤانسیۆنە ساڵانەییەکانی کۆمەڵەکانی دژە کۆیلایەتی ژنان تاڕادەیەك بەرێکوپێکی دادەمەزران، لە ئەنجامدا، ڕێکخراوی تایبەتی ژنان لە بزاڤی نەهێشتندا، ڕەهەندێکی گشتگیری نەتەوەیی وەرگرت.[١٢]

بزاڤی نەهێشتن بەداواکارییە تەواو ئەخلاقیو مرۆڤدۆستانەییەکانو خستنەڕووی مەسەلەگەلێك کە - لە چوارچێوەی دەکتۆرینە فیکتۆریاییەکان - بۆ "سروشتی جوانو ناسکی ژنانە" بەگونجاو سەیری دەکراو لە ڕووی ڕای گشتییەوە لە کایەی ئەو بابەتانەدا جێگەی بووەوە کە بایەخدانی ژنان پێی وەك شتێکی "سروشتی" دەردەکەوت، بەپێی ڕێسا نەدەبوو چالاکی ژنان تیایدا ڕووبەڕووی ناکۆکی زۆر بێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەهەرحاڵ، ئەمە یەکەمین ئەزموونی ئامادەبوونی ژنان بوو لە کۆڕو کۆمەڵە گشتییەکانداو بەمانای دەرچوون لە ماڵو هاتنە ناو کایەی گشتی سەیری دەکرا بە ئاسانی پەسەند نەکرا. ئەو کاتەی ژنان بۆ یەکەمین جار چوونە سەر سەکۆی وتاردان، هاواری "بچو ماڵو گورەویو دەستەوانەکانت بچنە" لەلایەن ئەو پیاوانەی لە دانیشتنەکەدا ئامادەبوون بەرزبووەوە. بەڵام بە گوتەی، کوارلێز، ئێدی "شوێنی ئامێری چنین گۆڕاوە"و لە ماڵەوە گوازرابووەوە کارگەو "ژنان کاتێکی باشیان هەبوو بۆ کارگەلێکی جیا لە ماڵداری"[١٣] دەشێ بڵێین هەر لەو شوێنەوەو بەلاوەنانی ژنان لە



کۆمەڵەی سەرتاسەری دژە کۆیلایەتیدا بوو کە ژنان زێدە لە جاران بوونی "جیاوازی" لەگەڵ پیاوانو سەپاندنی سنووردارییە تایبەتییەکانیان لەسەر خۆیان وەك ژن لەسەر بنچینەی ژنبوونیان هەست پێ کرد. ئەو ژنانەی لە ڕێکخراوە خزمەتگوزارییەکانی دژە کۆیلایەتیدا کاریان دەکرد ڕووبەڕووی سووکایەتی پێکردنی پیاوە هاوخەباتەکانیانو خەڵکی عامە دەبوونەوە. کاتێك داواکارییەکانی دژە جیاکاریو کۆیلایەتیان لە ماڵێکەوە دەبردنە ماڵێکی دیکە تاکو خەڵکی ئیمزایان بۆ بکەن، زۆر لە مرۆڤەکان بەژنو پیاوەوە، بە بەڵگەی "ڕەفتارە ناژنانەییەکانیان" گاڵتەیان پێ دەکردن، چونکە ژنان "مافیان نەبوو" داوا لە خەڵك بکەن داواکاری ئیمزا بکەن، ئەمە "کارێکی سیاسی پیاوانە"[١٤] بوو.

لەو هەلومەرجەدا کە ژنان لە چالاکییەکەیاندا بۆ گەشەپێدانی بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتی ڕووبەڕووی کۆسپو تەگەرە "ئەخلاقی"یەکان ببوونەوە بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی ئەخلاقی- ئەرکێکی ئەخلاقی کە خۆی لە"ئەخلاقی خزمەتگوزارییەوە"[١٥] سەرچاوەی گرتبوو کە لەگەڵ ئەخلاقیاتی ڤیکتۆریاییو ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە بۆیان ئیلقاکرابوو[١٦] - زێتر لە جاران سەرنجی پایەی نزمی خۆیان دا. ژنانی لایەنگری نەهێشتنی کۆیلایەتی کە بەجۆرێك لە جۆرەکان کەسانێکی ئایینیو بەویقار بوون، دەیانبینی تەنانەت قسەکردنیش بۆ کۆمەڵێك "خاتوونی بەڕێز" گرفتیان بۆ دروست دەکاتو لە ئەنجامدا ئەگەری قسەکردنی گشتی ژنان بوو "بەمافێك" کە دەبوو بەرگری لێ بکەن. ساراو ئەنجلینا گریمکی کە لە لایەنگرە چالاکەکانی بزاڤی نەهێشتن بوون، زۆر زوو پەیوەندیان لە نێوان ئامانجەکانی نەهێشتنی کۆیلایەتیو مافەکانی ژناندا دروست کرد. سارا گریمکی لە ساڵی ١٨٣٧ لە نامەیەکدا بۆ برادەرەکەی نووسی "تەنیا شتێك کە لە براکانم داوادەکەم ئەوەیە پێی خۆیان لەسەر قورگی ئێمە هەڵگرنو ڕێگەمان پێبدەن لەو زەویەی خواوەند پێمانی بەخشیوە سەرمان بەرزکەینەوە"[١٧] ئەنجلینا گریمکی لە پاساو هێنانەوە بۆ ئامادەیی ژنان لە بزاڤی نەهێشتندا پێیوابوو ژنان خاوەنی مافگەلێکنو لەسەر بنچینەی ئەو مافانە دەبێت "مافی ڕادەربڕینیان لەبارەی





هەموو ئەو یاساو پرەنسیپانەوە هەبێت کە لە کەنیسە، دەوڵەتو تەرتیباتە هەنوکەییەکانی کۆمەڵگادا فەرمانڕەوان بەسەریانەوە". ئەو بەپشت بەستن بە "مافەکانی مرۆڤ"، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەو مافانە پیرۆزنو ناکرێ زەوت بکرێن،[١٨] واتە هەمان ئەو مافانەی بزاڤی نەهێشتن بۆ رزگاری کۆیلەکانی لەسەر دامەزرا بوو.

دوای کۆنفرانسی دژە کۆیلایەتی لە لەندەن (١٨٤٠) کە ژنان نەیانتوانی ئیجازەی ئامادەبوون لە دانیشتەکاندا بەدەستبێنن، بیریان لە رێکخستنێکی جیاوازو سەربەخۆ لە بزاڤی نەهێشتن بۆ بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندیو مەیلە تایبەتییەکانی ژنان کردەوەو بڕیاریاندا "سەرەڕای ئازادی کۆیلەکان بیر لە ئازادی خۆشیان بکەنەوە"[١٩] چونکە بە هەمان شێوەی سینکلەر دەڵێت "هیچ شتێك هێندەی بە پەراوێزکردنو بێبەشکردن[٢٠] نابێتە هۆی سەرهەڵدانی توڕەیی"و رەنگە بتوانین بڵێین بەپەراوێزکردن زێتر لە هەر هۆکارێکی تر رۆڵی لە دروستبوونی ئەو ناسنامانەدا هەیە کە پێشتر "کاریگەر" نەبوون.

ئەلیزابێت ستنتۆنو لۆکرشا مۆت دوای کۆنفرانسی لەندەن لە پرۆژەی رێکخستنی سەربەخۆیی ژنانیان کۆڵییەوە، بەڵام بەکردەوە لە کانوونی دووەمی ١٨٤٨دا بوو کە بەیاننامەی دامەزراندنی کۆبوونەوەی ژنان لە سنکافالزیان بڵاوکردەوەو ئەم کۆبوونەوەیە "دەسپێکی رێکخستنی سەربەخۆیی ژنان لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان" بوو.[٢١]

پێنج لەو ژنانەی پێشینەی خەباتی دژە کۆیلایەتیان هەبوو بەیاننامەی کۆبوونەوەکەیان رێکخستو لە١٤ی کانوونی دووەم بڵاویان کردەوە. هەم رێکخەرەکانی کۆبوونەوەی سنکافالزو هەمیش دەستە نێردراوەکان لە ژنە "بێ خەمو سپێپێستەکانی چینی ناوەڕاست" بوون. ئەوان تەنانەت "لەبیریان کرد" داوەتنامە بۆ کۆمەڵەی ژنانی کرێکار واتە یەکەمین سەندیکای کرێکاری ژنان لە وڵاتەیەکگرتووەکان کە بۆ مافەکانی ژنە کرێکارەکان چالاکیان دەنواند، بنێرن[٢٢] و لەو گۆشەنیگایەوە کە لەجیاتی سەرنجدان لە



پێویستییە بەپەلەکان وەك "زێدەکردنی حەقدەست"ی کرێکارە ژنەکانو "کەمکردنەوەی سەعاتەکانی کاری ماندووکەر"و "باشکردنی" رەوشیان، بە دوای مافگەلێکی ئەبستراکتو رووتەوە بوون کەوتنە بەر گلەییو گازندەی بڵاوکراوە کرێکارییەکان. هەڵبەت ژمارەیەك لەو ژنانەی بەشداریان لەم کۆبوونەوانەدا کرد لە چینی کرێکار بوون. وێڕای ئەوە، وا دەردەکەوێت کۆلەکەی سەرەکی بزاڤی ژنان لەم ماوە زەمەنییەدا بەگشتی خاتوونە بەمێردەکانی چینی ناوەڕاست بن کە بەشێکیان هەستیان دەکرد "بزاڤی دژە کۆیلایەتی خیانەتی لێ کردۆن"[٢٣]. ئەم تایبەتمەندییە، جیاوازی بزاڤی ژنان لە وڵاتە یەکگرتووەکان لە بزاڤی ژنان لە وڵاتەکانی دیکە پیشاندەدات کە کۆلەکەی سەرەکی بزاڤی ژنان تیایاندا سەندیکا کرێکارییەکان بوون یاخود بەهەرحاڵ، پەیوەندییەکی ئۆرگانیکی لە نێوان بزاڤی کرێکاریو بزاڤی ژناندا هەبوو.[٢٤]

هەرچوونێك بێت، لە کۆبوونەوەی سنکافالز بەجەخت کردن لەسەر ستەمدیتەیی مێژوویی ژنانو پێویستی سوودمەندبوونیان لە مافە یەکسانەکان لەگەڵ پیاوان لە کایەکانی ئابووریو دارایی، فێرکردن، کۆمەڵایەتیو سیاسیدا، لەلایەن ١٠٠کەس لە بەشداربووە سەرەکییەکان کە ٦٨ ژنو ٣٢ پیاو بوون بڕیار لەسەر بەیاننامەیەك درا، هەندێك لەوانەی ئیمزایان کرد لە رابەرەکانی بزاڤی نەهێشتن بوون.[٢٥]

دوای سنکافالزیش چەند کۆبوونەوەیەك بە مەبەستی جەخت کردنە سەر مافەکانی ژنان بەستراو لە هەمان کاتدا، ژنە خەباتکەرەکان لە بزاڤی نەهێشتندا بەردەوامییان بەچالاکی خۆیان دەدا. ژمارەیەکیان بەو ئەنجامە گەیشتن کە"دەبێت ژنان بێنە ناو سیاسەتەوەو بچنە کۆنگرە".[٢٦] هەندێ لە ژنان بەجەخت کردن لەسەر بەشداری خۆیان لە دەستەی ئەمیندارانی قوتابخانەکانو شورا ناوچەییەکان جەختیان لەسەر پێویستی ئامادەبوون لە کایەی گشتیدا دەکردەوە.[٢٧] ژمارەیەك ژن لە بزاڤی تازە سەرپێکەوتوووی قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکانیشدا[٢٨] چالاك بوون. رێبەرەکانی ئەم بزاڤە زێتر قەشەو پەیڕەوەکانی کەنیسە بوون. ئەم بزاڤە زۆر لە





ژنەکانیشی پەلکێش کردنو بووە هۆی ئەوەی زۆریان بێنە ناو ئەو ڕێکخراوو گروپانەوە کە کاریان بەپێچەوانەی گروپە نەریتییەکانی ژنان سنووردار نەبوو بە"دوورمانو باسکردن خەڵك"ی. هەندێ لەو ژنانەی لەم بزاڤەدا چالاك بوون ڕووبەڕووی پەرچەکرداری نێگەتیڤ ببوونەوە کە پاڵی پێوەدەنان بۆ جەخت کردنەوە لەسەر ناسنامەی سەربەخۆی ژنێتیان. زۆر لە ژنە چالاکەکانی نێو ئەم بزاڤەش بوون بەلایەنگری مافەکانی ژنان.

لە گرنگترین ژنە چالاکەکان کە لایەنگیریان لە بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم دەکرد، سوزان بی. ئەنتۆنی[٢٩] بوو کە لە چالاکییەکانیدا بەتایبەتی بەمەبەستی دروستکردنی ڕێکخراوێك لە نێو ئەو ژنانەی لایەنگری بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوەکان بوون، ڕووبەڕووی دژایەتی زۆر بووەوە. ئەزموونی چوار ساڵەی ئەنتۆنی لە بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوەکان لە ماوەی ساڵەکانی ١٨٤٨ تاکو ١٨٥٢ ئەوی کردە یەکێك لە لایەنگرە گەرموگوڕو ڕەنگە کاریگەرترین ژن لە بزاڤی مافەکانی ژناندا، ئەو لەدوای پێکدادانی نێوان لایەنگرانی مافەکانی ژنانو ڕێبەرانی بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوەکان دەستی لە ئەندامێتیەکەی کێشایەوە.[٣٠]

ئەلیزابێت ستنتۆن لە بلاوکراوەی لیلی[٣١] (نێرگز) ئۆرگانی ژنانی دژ لەگەڵ خواردنەوە ئەلکەحولییەکان بەئیمزای خوازراو وتاری دەنووسیو هەندێجار بیرو بۆچوونەکانی خۆی لە بارەی مافەکانی ژنان تیایدا دەخستنەڕوو، بەڵام کاتێك لە یەکێك لە وتارخوێنیەکانیدا ڕەخنەی لە یاساکانی تەلاق گرتنو خواردنەوەی بەردەوامی مێردی بەهۆیەکی کافی بۆ تەلاق دیاری کرد، لە ڕێبەرایەتی بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوەکان وەلانرا.[٣٢]

لەگەڵ دەسپێکردنی شەڕی ناوخۆیی (١٨٦١-١٨٦٥) لە نێو ویلایەتەکانی باکورو باشووری ئەمریکا، بەڕێکەوتنی ڕێژەیی نێوان ڕێبەرەکانی بزاڤی ژنانو ڕێبەرەکانی بزاڤی نەهێشتن، ژنان چالاکی خۆیان بەگشتی لە خەباتکردن لە دژی کۆیلایەتیدا



چڕکردەوە، بەو هیوایەی دوای شەڕو سەرهەڵدانی هەلومەرجی نوێ بۆ پلانی نەهێشتنی کۆیلایەتیو بەخشینی مافە مەدەنیو سیاسییەکان بەرەشپێستەکانو بەتایبەتی سوودمەندبوونیان لە مافی دەنگدان، ژنانیش بە پشتیوانی بزاڤی نەهێشتن لەم مافانە سوودمەند بن، هەڵبەت هەندێك لە ڕێبەرانی بزاڤی ژنان وەکو ئەلیزابێت ستنتۆنو سوزان ئەنتۆنی کە"هێندە متمانەیان بەپریزیدینت لینکولن نەبوو" بە باشتریان دەزانی مەسەلەی ژنان وەکو خۆی لەئارادا بێت.[٣٣]

ژنان بەتایبەتی لە ویلاتەیەکانی باکوور، بەدرێژایی شەڕی ناوخۆیی بەبەرزترین ڕادەی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان گەیشتن. ئەوان "کۆمەڵەی ناوەندی ژنان بۆ هاوکاری"[٣٤] یان دامەزراند کە سەرۆکایەتییەکەیشی لە ئەستۆی ئافرەتێك بوو. ئەم کۆمەڵەیە بەرەو دروستکردنی کۆمیسیۆنی تەندروستی وڵاتە یەکگرتووەکان[٣٥] پەلکێش کرا کە ڕۆڵێکی زۆر گرنگی لە سەرکەوتنی باکووردا هەبوو.[٣٦] ئەم کۆمیسیۆنە کە لە گرنگترین کۆڵەگەکانی پزیشکی یەکێتی باکوور بوو بەکردەوە لەلایەن ژنانەوە بەڕێوە دەچوو، بەڵام بەڕێوەبەرایەتییەکەی لە ئەستۆی پیاواندا بوو. ژنان میوە، جلوبەرگ، پێڵاو، سابوون.. بۆ سەربازانیان ئامادە دەکردنو بازارگەلێکی جیاجیایان دروست کردن بۆ کۆمەککردن بە بەرەکانی شەڕ. سەدان ژن بەدرێژایی جەنگ وەك پەرستار، چێشتلێنەر، جلشور، بەرگدروو و... لە خزمەتی بەرەکاندا بوون. ئەو ژنانەی بەدرێژایی جەنگو لە ڕێگەی کۆمیسیۆنی تەندروستیو دامەزراوەکانی تر وەکو پەرستار، کارگوزار، یاخود بۆ کۆکردنەوەی هاوکاری دارایی چالاکییان دەنواندو سەرەڕای ڕۆڵی دیاریکەریان، هەم ڕووبەڕووی پەرچەکرداری ناهاوکار دەبوونەوەو هەمیش لەو دامەزراوانەدا کە بە داهێنانو بەگێڕانی ڕۆڵی گرنگی ئەوان بەڕێوەدەچوون، ڕێگەیان لێدەگرا لەوەی خاوەنی لایەنگەلێکی گرنگی ڕاپەڕاندنی بن و بڕیار بدەن، زێتر لە جاران هەستیان بە "پایەی نزم و ستەمدیتەیی" خۆیان دەکرد.[٣٧]

ژنە ڕەشپێستەکانیش کە هەر لە یەکەمین کۆبوونەوەکانی ژنان- هەرچەند بە شێوەیەکی پەڕاوێز- ئامادەییان هەبوو هەندێکات جەختیان لەسەر ڕەوشی تایبەتی ژنانو





جیاوازییەکەی لەگەڵ رەوشی ژنە سپیپێستە خۆشگوزەرانەکانی لایەنگری مافەکانی ژنان دەکرد، لە میانەی شەڕی ناوخۆییدا چالاکتر بوون. هاریت تومبان،[٣٨] سۆجۆرنەر تروت[٣٩] بەدرێژایی شەڕی ناوخۆیی ژیانی خۆیان خستە مەترسییەوە. ئەوانی دیکەش گروپەکانی هاوکاریو پێشکەشکەری کۆمەکە خۆشگوزەرانییەکانیان پێکهێنان کە لەوانەش دەکرێ ئاماژە بەدامەزراوەی هاوکاری کردن بۆ دەربازکردنی قاچاغ (کۆیلە هەڵاتووەکان) بکەین کە بۆ کۆمەککردن بەکۆیلە هەڵاتووەکان دامەزرا.[٤٠]

بە دەربڕینی فلێکسنەر، ژنان لەگەڵ شەڕی ناوخۆیی "هاتنە نێو سیاسەتی نەتەوەییەوە" ئەنتۆنیو ستنتۆن دوای پرسوڕا بەهەندێك لە رێبەرانی بزاڤی نەهێشتن، ساڵی ١٨٦٣ پەیوەندیان لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی دەیانناسین لە سەرتاسەری وڵاتدا بەرقەرارکردو داوایان لێ کردن بەشداری لە دانیشتنی "ژنانی وەفاداری نەتەوە" لە ١٤ ئاداری ١٩٦٣دا بکەن. چونکە "ژنانیش وەکو پیاوان لە یەکلاییکردنەوەی دوا شێوەی حکومەتدا پەیوەندیدارو بەرپرسن، ئینجا رێگە مەدەن لە هەلومەرجی هەنووکەییدا، وەك تەماشاڤانی بێکەڵك، تەنیا بینەربن." لە پەیماننامەی ئەم دانیشتنەدا، ژنان پشتیوانی خۆیان لەم حکومەتە بەمەرجی "بەردەوامی شەڕ لە رێگەی ئازادیدا" راگەیاندو بڕیاربوو ژنان بەرپرسیاری کۆکردنەوەی ملیۆن ئیمزا بۆ داواکردنی چاکسازی سێزدەمین دەستوور پەسەند بکەن.[٤١]

بە درێژایی شەڕی ناوخۆ، سەرەڕای ئەو ژنانەی لە پشت بەرەکانی شەڕەوە بەهۆکاری دیاریکەر لە دابینکردنی پێویستییەکانو خزمەتگوزاری پزیشکیو پشتیوانی سەربازان لە قەڵەم دەدران، هەندێ لە ژنان بەناوی خوازراو و بە بەرگی پیاوانەوە خزمەتی سەربازیان دەکرد. دێبۆرا سامپسۆن[٤٢] بەناوی خوازراوی رۆبێرت شیرتلیف[٤٣] لە سوپای کونتیننتال، فرانسیس هۆك[٤٤] بەناوی خوازراوی فرانك فولەر[٤٥] لە سوپای نۆدئیلی نوێ، ئەلیزابێت کۆمپیتۆن[٤٦] لە پیادەکانی میشیگانو بەلای کەمەوە ١٠ ژنی دیکە لە سوپا جیاوازەکاندا بە ناوی پیاوانەو ئۆنیفۆرمی سەربازیی پیاوانە خزمەتیان دەکردو هەندێکیان نیشانەو مافی خانەنشینشیان وەرگرت[٤٧]. ئامادەیی



ئەم ژنانە لە سوپادا بەمانای رەتکردنەوەی باوەڕە کۆنەکان لە بارەی بێتوانایی ژنان لە بەشدار بوون لە جەنگ - واتە یەکێك لە گرنگترین پاساوەکان بۆ رەتکردنەوەی مافی هاوڵاتی سیاسی بۆ ژنان- لەقەڵەم دەدرا.

لە راستیدا ئەم چالاکییانە تەنیا ئەزموونێك لە ئامادەبوون لە کایەی گشتیو چالاکی رێکخراوەییو گروپیدا نەبوون، بەڵکو لەگەڵ دروستبوونی پەیوەندییە برادەرایەتییەکان لە نێوان ژنە هاوبیرەکان تۆڕگەلێك هاتنە ئاراوە کە لەتوانایاندا بوو لە بەرقەرارکردنی پەیوەندییەکان لە نێو بزاڤی ژنانو بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی "فیمینیستی" (کە هەڵبەت هێشتا ئەو ناوە نەبوو) کاریگەربن، و ناسنامەی ژنانەی جیاواز هاوشان بە کۆمەڵە بەهایەکی بەدیل دابهێنین کە یارمەتی ژنانیان دەدا جەخت لەسەر "جیاوازی" نێوان دوو رەگەزەکە بکەنەوەو لە هەمان کاتدا، خوازیاری یەکسانی بن.[٤٨]

**گوتاری لیبرال‌و یەکسانی ژن‌و پیاو**

گوتاری "فیمینیستی" لەم قۆناغەدا بەدەربڕینی فلێکسنەر هەم گونجاو بوو لەگەڵ "روحی سەردەم"و هەمیش کەوتبووە ژێر کاریگەری گوتاری مۆدێرن لەگەڵ چەمکەکانی ئەقڵانیەت، هیۆمانیزم، تاکخوازی، ئازادیو یەکسانی. بە گوتەی کات، "نەریتی گوزارە وابەستەکان بەمافە سروشتییەکانو ئازادی هەموو مرۆڤەکان بنچینەی داواکارییەکانی ژنانیان پێکدەهێنا لەپێناو نەهێشتنی کۆسپو تەگەرە کۆمەڵایەتییەکان کە بە شێوەیەکی "سەرەڕۆیانە" لەسەر بنچینەی رەگەز دیارکرابوون، راڤە ژینگەگەراکان جیاوازییە رەگەزییەکانیان دەوروژاندو پاساویان بۆ داواکارییەکانی وەکو ئازادیو دەرفەتی یەکسانی لەگەڵ پیاوان دەهێنایەوە".[٤٩]

لەبەرئەوەی گوتاری زاڵ لەسەر بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتیش بۆ خۆی کاریگەر بوو بە گوتاری مۆدێرنو لە راستیشدا فرەوانکردنی چەمکە سەرەکییەکانی ئەو گوتارە بۆ گروپێکی مرۆڤەکان بوو کە لەبەر رەنگی پێستو نەژادیان بەکردەوە لەم گوتارە ریزپەڕکرابوون، بزاڤی ژنان لە ژێر کاریگەری گوتاری بزاڤی نەهێشتن وەکو یەکێك لە





گوتارە لاوەکییەکان دەکەوتە نێو چوارچێوەی گوتاری مۆدێرنەوە. سەرەڕای ئەوەی کە بنەما بنەڕەتییە ئایدیۆلۆژییەکانی بزاڤی نەهێشتن پشت ئەستوور بوون بە چەمکە مۆدێرنەکانی یەکسانیو ئازادیو دەیانویست ئەم چەمکانە رەشپێستەکانیش بگرنەوە، هەندێك لە رێبەرانی بزاڤی نەهێشتنیش بەراشکاوی داوایان دەکرد ئەم چەمکانە ژنانیش بگرنەوە. فریدریك دوگلاس رێبەری رەشپێستی بزاڤی نەهێشتن لەساڵی ١٨٤٨ لە سەروتاری نورت ستاردا نووسی:[٥٠]

ئێمە باوەڕی خۆمان لەو بارەوە دەردەبڕین کە هەموو ئەو مافە سیاسیانەی پیادەکردنیان بۆ پیاوان رێگەپێدراون بۆ ژنانیش رێگە پێدراو دەبن. هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی پیاو وەکو بوونەوەرێکی ئاقڵو بەرپرس جیادەکەنەوە، لەبارەی ژنیش راستن.. دەکتۆرینی ئێمە ئەوەیە کە ماف رەگەزی نییە...[٥١]

بەسەرنجدان لەوەی زۆر لە ژنە رێبەرەکانی بزاڤی فیمینیستی لەم ماوەیەدا مەسیحییە باوەڕدارەکان بوون، کاریگەری تێگەیشتنە نوێیە ئاینییەکان لەسەر گوتاری "فیمینیستی" دەبینرێت. پروتستانتیزمی ئینجیلی لە سەدەی نۆزدەیەم جەختی لەسەر باشتری ئەخلاقی ژنان لەبەرامبەر پیاوان دەکردو دەبووە هۆی ئەوەی ژنان بەهای خۆیان بەرزتر بزانن‌و بیانەوێت لە کۆمەڵگادا رۆڵێکی زیاتریان هەبێت.

ئەوەی زێتر لە هەر شتێك لە نووسین‌و گوتەی رێبەرانی بزاڤ لەم قۆناغەدا دەبینرێت. جەخت کردنە سەر جەوهەری مرۆیی هاوبەشە کە بە چاوپۆشی لە جیاوازییە رەگەزییەکان دەبێت ببێتە بنچینەی رەفتار، کاروبار، مافو کەسایەتی تاکەکان‌و، تاڕادەیەك هەموو ئەو مافانەی کە ئەوان داوایان دەکەن لەسەر بنچینەی هەمان ئەو مافانەیەو بەتایبەتیش یەکسانی. ئەم جەخت کردنە لەسەر یەکسانی تاڕادەیەك پشت ئەستوور بوو بە دەکتۆرینە ئایینەیەکانی پرۆتستان لە سەدەی نۆزدەیەمدا.[٥٢]

بەسەرنجدان لە سنووورداری بەرچاوی بەرهەمە رەسمییە نووسراوەکان لە شێوەی کتێب‌و وتاردا، یەکێك لە گرنگترین بەڵگەنامەکان کە لەم قۆناغەی بزاڤدا ماوەتەوە، نامە

تاکەکەسیو وتارەکانی ڕێبەرانی بزواڤ و هەروەها ئەو جاڕنامەو بەیاننامانەن کە لە کۆبوونەوەکانی ژناندا بڕیاران لەسەر دەدرێت. لەو بەرهەمانەی ماونەتەوە دەشێ ئاماژە بەو نامانە بکەین کە سارا گریمکی ساڵی ١٨٣٧ بۆ برادەرەکەی نووسیون. ئەو چەخت دەکاتەوە کە".. خواوەند ئێمەی بە یەکسانی دروست کرد؛...ئەو ئێمەی بەکارگوزاری ئازاد دروست کرد،.. ئەو یاسادانەری ئێمە، پاشای ئێمەو دادوەری ئێمەیەو تەنیا لە بەرامبەر ئەودایە کە دەبێت ژن ملکەچ بێت" ئەو بەجەخت کردنەوە لەسەر ئەوەی مافەکانی ژن شتێك نین پێویستیان بەسەلماندن بێت دەڵێت، ".. من بڕوام بەوە هێناوە کە مافەکانی ژنان وەکو مافەکانی کۆیلەکان دەبێت تەنیا لێیان بکۆڵرێتەوە تاکو یەکسەر بتوانین لێیان تێبگەینو جەختیان لەسەر بکەینەوە..".[٥٣]

فرانسس رایت پێیوابوو یەکسانی ئەو بنەمایەیە کە دەبێت بە فەرمی بناسرێت، هەرچەند بەکردەوە نایەکسانی فەرمانڕەوایەو بۆتە هۆی ئەوەی تاکگەلێك لە شوێنگە لاوازەکاندا جێگەیان بێتەوە. ئەو لە یەکێك لە وتارەکانی خۆیدا گوتی:

> ئەگەر بنەمای ژیانی یەکسانی مرۆیی بەشێوەیەکی جیهانگیر بەفەرمی بناسرێت، حەزم دەکرد لە قسەکردن بۆ هاوچەشنەکانم بەبێ سەرنجدان لە نەتەوە، چین، ئاین یان رەگەز قسە بکەم. بەڵام تا ئەو کاتەی یەکسانی لە هەلومەرج، دەرفەتەکانو فێربووندا زاڵ نەبووە حەزدەکەم بەشێوەیەکی تایبەتی... بپەرژێمە سەر ئەو کەسانەی لە ناهەموارترین هەلومەرجدان.[٥٤]

مارگرێت فولەر ساڵی ١٨٤٥ لە کتێبەکەیدا ژن لە سەدەی نۆزدەیەم، بە جەختکردن لەسەر یەکسانی مرۆیی ژنانو پیاوان تەئکیدی لەسەر پێویستی بوونی ئەو هەلومەرجە کردەوە کە بۆ بەدیهاتنی "تاکایەتی" مرۆیی ژن پێویستەو نووسی:

> ئێمە هەموو رێگرە سەرەڕۆیەکان دوور دەخەینەوە. هەموو ئەو رێگایانەش کە بەڕووی پیاواندا کراوەن بەهەمان شێوە بەرووی ژناندا دەکەینەوە. کاتێك وای لێدێت، بەرجەستەبوونی جوانی بەشێوەیەکی بێگەردترو جۆراوجۆرتر دەبینین. ئەگەر ئەو بیرو هەستەی تا ئێستا خراوەتەڕووو لەسەر بنچینەکەی دەبێت پیاو خۆی بە دۆستو برای ژن بزانێت نەك گەورە یاخود مامۆستاکەی-و [تێبگات کە] بەراستی لە پەرستندا لەگەڵ ژن یەکسانە- رێکخستنی وەزیفەو کارەکان مانای نابێت.. [ژن دەیەوێت] سروشتێك بێت گەشە بکات، زەینێك بێت جیابکاتەوە، روحێك بێت بەئازادی بژیتو لە گەشانەوەی هێزەکانیدا هیچ کوسپێکی لەسەر رێگا نەبێت.[٥٥]

لە راگەیاندنی سنکافالزدا بەڕاشکاوی هاتبوو "ژن لەگەڵ پیاو یەکسانە"و یەکسانی مرۆڤەکان "ئەنجامی زەروری راستی یەکسانبوونی وەچەیە [مرۆڤ] لە تواناو بەرپرسیاریەتییەکاندا." کەواتە "هەموو ئەو یاسایانەی دەبنە رێگری ئەوەی ژن پایەیەك لە کۆمەڵگادا بەدەست بهێنێت کە ویژدانەکەی بەپێویستی دەزانێت، یاخود ئەو یاسایانەی شوێنگەیەك بۆ ژن دیار دەکەن کە نزمترە لە شوێنگەی پیاو، پێچەوانەی بنەمای گەورەی سروشتنو هەر بۆیەش هیچ هێزو باڵادەستیەکیان نییە".[٥٦] بەهەمان شێوە، ئەگەر ژنو مێرد یەکسان دروستکراونو ژنان لە پیاوان جیاواز یاخود کەمتر نین، کەواتە جیاوازی نێوان "کایەکانی ژنانەو پیاوانە" مانای نییەو پێویستە ژنان بتوانن لە هەموو ئەو کایانەدا ئامادەبن کە رێگە دەدرێت پیاوان تیایاندا ئامادەبن..[٥٧]

پێشتر، ئاماژە کرا بەوەی ژنان بەرەبەرە لە ماوەی ململانێکانی قۆناغی پێش جەنگی ناوخۆییو لە میانەیدا بەسەرنجدان لەو گوشارانەی دەکرانە سەریانو چالاکییەکانیان، بەجۆرێك لە هاوشێوەیی نێوان رەوشی خۆیانو هەلومەرجی کۆیلەکان گەیشتبوون. ئەنجلینا گریمکی لە نامەیەکدا بۆ کاترین بیچەر ئاماژە دەکات بە کاریگەری ئامانجەکانی بزاڤی دژە کۆیلایەتی لە دەرککردنی نوێی ئەو لە مافەکانی ژنانو دەنووسێت، "لێکۆڵینەوەی مافەکانی کۆیلەکان بووە هۆی ئەوەی تێگەیشتنێکی باشترم لە مافەکانی خۆم هەبێت. تێگەیشتم کە ئامانجی دژە کۆیلایەتی، قوتابخانەی باڵای ئەخلاق لە وڵاتی ئێمەدا، ئەو قوتابخانەیەی تیایدا مافەکانی مرۆڤ بە بەراورد لەگەڵ قوتابخانەکانی دیکە بەشێوەیەکی تەواوتر لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکرێتو لێی

تێدەگەینرێن‌و فێردەکرێن...) ئەو بنچینەی ئەم قوتابخانەیە لەوەدا دەبینێت کە "مرۆڤەکان لەبەرئەوەی بوونەوەری ئەخلاقین مافگەلێکیان هەیە" کەواتە بەهەمان شێوە نابێت ڕەنگی پێستی ڕەشەکان ببێتە ڕێگر لە بەردەم ئەوەی ئەوان بە مرۆڤ - واتە بوونەوەری ئەخلاقی - دواجار بەخاوەن مافی یەکسان لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکە سەیر بکرێن، هەروەها ژنان وەك بوونەوەرگەلێکی مرۆیی‌و ئەخلاقی خاوەن مافگەلێکی یەکسانن لەگەڵ پیاوان. فولەریش پێیوابوو "ناکرێ مرۆڤێك ملکەچ بکرێت بۆ مرۆڤێکی دیکە"و بەهەمان شێوەی کە ئەم پرەنسیپە سەبارەت بە ڕەشەکان ڕاستە، سەبارەت بە ژنانیش ڕاستەو هیچ مرۆڤێك مافی ئەوەی نییە تەنانەت لەسەر بنچینەی "نیەتباشی" سنووردارێگەلێك بەسەر ژناندا بسەپێنێت، چونکە ژنانیش وەکو ڕەشپێستەکان "روح" یان هەیە.[٥٨]

ئەلیزابێت ستنتون لە دەسپێکی شەڕی ناوخۆدا بەهێنانەوەی نموونەیەك لە ڕەوشی کۆیلەیەك بۆ نموونە بەناوی کافی[٥٩] و لە بەراورددا بە هەلومەرجی ژنێکی سپیپێست بۆ نموونە بەناوی خاتوو ڕۆ،[٦٠] نووسی ئەم دوو کەسە کەم تا زۆر بەهەمان ڕادە مافە "سروشتی"یەکانیان لێ زەوت کراون‌و دەبێت بگەڕێنرێنەوە.[٦١]

جەخت کردن لەسەر یەکسانی هاوکات بوو بە ڕەتکردنەوەی جیاوازی کایە تایبەتییەکانی ژنانەو پیاوانە. لۆسی ستۆن لەساڵی ١٨٥٥ لە وتارەکەیدا لە کۆبوونەوەی نەتەوەیی مافەکانی ژنان لە سینسیناتی ئۆهایۆ بە ئاماژەکردن بە دروستکراویی جیاوازی نێوان کایەکانی ژنانەو پیاوانەو سروشتی کۆمەڵایەتی پەیوەست بەکات‌و شوێنەکەی گوتی:

> لەبارەی کایەی ژن تاکو ئێستا زۆر گوتراوەو نووسراوە. بەدوای سەرچاوەی هەموو ئەم دەکتۆرینانەدا بچوو ئەو کات تێدەگەی کە هیچ بناغەیەکیان جگە لە دەمارگیرییەکانی سەردەم نییە. دەتوانین ئەمە لەو ڕاستیەدا ببینین کە ئەوەی لەبارەی ژنانی وڵاتێکەوە تەحەموول دەکرێت لە وڵاتێکی دیکەدا تەحەموول ناکرێت.[٦٢]



لە تەك گوتاری مۆدێرن‌و جەختکردنەوەی لەسەر یەکسانی‌و ئازادی تاکە مرۆییەکان، بەهەمان شێوەی لە بەشی پێشتردا ئاماژەی پێکرا، گوتاری ڤیکتۆریایی هەبوو کە جەختی لەسەر شوێنگەی نەریتی ژنان لە ماڵ‌و چاکییە تایبەتییەکانی ژنان کە نابێت تێکەڵی پیسیەکانی جیهانی پیاوان بن، دەکردەوە. لەلایەکەوە، زۆر لە ژنان کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەم گوتارەوەو لەلایەکی دیکەوە، ناساندنی ژنان وەك بوونەوەری باشتر، ئەخلاقیترو، خاوێنتر خۆی لە خۆیدا دەیتوانی ببێت بەپاساوێك بۆ بوونی مافەکان‌و سوودەمەندی لە ئاسنکارییەکان، جەختکردنەوە لەسەر پێویستی گۆڕانی خەسڵەتەکانی ئەو پیاوانەی تایبەتمەندیگەلێکی خوارتر لە ژنانیان هەیەو لە سەرووی هەمووشییەوە، بە شێوەیەکی ناکوکانەو پاساوی پێویستی ئامادەیی ژنان لە کایەی گشتیدا بەمەبەستی پالاوتنی.

بە بۆچوونی سینکلەر "هەموو فیمینیستەکان" باوەڕیان بە باشتری سروشتی ژنان لە پیاوان هەبوو. وێڕای ئەوەی تیۆریستە سەرەکییەکانی ئەم گوزارەیە کە ئەگەر ژنان لە سیاسەت دوورخرابنەوە لەبەر باشتری ئەوان بووە نەك ژێردەستییان، پیاوانێك بوون دەیانەویست لەم ڕێیەوە پاساو بۆ پێویستی نەچوونی ژنان بۆ نێو کایەی پیسی ژیانی پیاوان بهێننەوە، بەڵام بە کردەوە ئەمە "تاکتیکێکی" مەترسیدار بوو کە دەیتوانی بگۆڕێت بۆ دژی خۆی کە گۆڕاش بەتایبەتی لە قۆناغی دواتری بزاڤەکە- بەڵام لەو قۆناغەشدا پشتی پێ دەبەسترا، ئەلیزابێت ستنتۆن ساڵی ١٨٤٨ ڕایگەیاند، پیاو "لە ڕووی هەموو چاکییە ئەخلاقییەکانەوە لە ژن نزمترە، ئەویش نەك لەبەر سروشتەکەی، بەڵکو فێرکردنی هەڵە بۆتە هۆی ئەوە. پیاوان بەپێی خۆویستییەکانی خۆیان، سروشتی ئەخلاقی ژنانیان پەروەردە کردووە، بەڵام هیچ سەرنجێکیان لە کەمایەتییەکانی خۆیان نەداوەتەوە. [لە ئەنجامدا] ئێستا ژنان لە چاکەی باشتر.... بەهرەمەندن".[٦٣] هەروەها جین فرۆهاك[٦٤] یەکێك لە هاوسەردەمەکانی ستنتۆن لە "لیلی"دا نووسی "ئەم ژنایەتیەی ژن، ژنایەتی غەریزی ئەو، بەرزترین ئەخلاقیاتی ئەوە کە کۆمەڵگا





ئێستا پێویستی پێیەتی تاکو بەهۆیەوە رووبەرووی زیادەڕۆییە پیاوانەییەکان بێتەوە کە هەمیشە لە یاسا نادادپەروەرو نایەکسانەکاندا دەبینرێت".[٦٥]

وێڕای ئەوە، لەم قۆناغەی شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژناندا، بەڕوونی دیارە ئەوە گوتاری یەکسانیە لەسەر بنچینەی گوزارە لیبرالەکان لە بزاڤدا لە هەڵوێستێکی هەژموونیدا جێگەی گرتووەو داواکاری هەموو مافەکان لەسەر بنچینەی ئەو گوتارە پاساو دەدرێت. بەهەمان شێوەی کە دەبینین لە قۆناغی دواتری بزاڤەکەدایە چەمکی جیاوازی یاخود تەنانەت باشتری ژنان لە بزاڤدا زۆر بەهێزتر دەبێت.

**خواستە سەرەکییەکانی ژنانو تەوەرەکانی خەبات**

بزاڤی ژنان لەم قۆناغەدا خواستگەلێکی تاڕادەیەك جۆراوجۆرو رادیکالی هەبوون کە دەشێ ئەوان بەدیارترین شێوە لە راگەیاندنی بنەماکانی بیروباوەڕی سنکافالزو هەروەها لە بەرهەمە بەجێماوەکانی رێبەرانی بزاڤی ژنان لەم قۆناغەدا بەشێوەی کتێب، وتار نامەشەخسییەکان، داواکارییە فەرمیو نووسینەکانی دیکە ببینین. ژنان لەم قۆناغەدا خوازیاری گۆڕان بوون لە زۆر لە دامەزراوەکان، لە جۆری جلوبەرگی ژنانەوە بگرە تا مافە تاکەکەسییەکان، مافە سیاسییەکان، خێزانو هاوسەرێتیو ئایین. دوا ئامانج بەدەربڕینی مارگرێت فولەر ئەوە بوو کە "هەموو رێگرە چەوسێنەرەکان لەسەر رێگای پەرەسەندنی ژنان" هەڵگیرێن.[٦٦] ژنە چالاکەکان لەم ماوەیەدا دەیانویست ئەو مافو جیاوکانەی پیاوان پێیان گەیشتوون وەدەستخەنو ئەمە بناغەی داواکارییە یاساییەکانی ئەوانیان پێکدەهێنا، لەلایەکی دیکەوە، ئەوان لە هەندێك لە داواکارییەکاندا بەدوای "رزگاربوون" لە ستراکتوورەکان، دابەکانو ئەو بۆچوونانەدا بوون کە ئەوانیان سنووردار دەکرد.[٦٧]

لە خوارەوە ئاماژە بەگرنگترین خواستەکانی بزاڤ لەم ماوەیەدا دەکرێت.

١- ***چاکسازی جلوبەرگ:*** ژنانی سەدەی نۆزدەیەم بەتایبەتی ژنە شارنشینەکانی چینی ناوەند بەپەیڕەویکردن لە شێوازی مۆدی ژنانە لە ئەورووپاو بەتایبەتی دەربارە



ئەورووپییەکان قەمیسگەلێکی تەسکی زۆر درێژیان لەگەڵ تەنوورەگەلێکی جۆراوجۆر دەپۆشی کە رێگەی لێدەگرتن لە هەر جۆرە جوڵەیەکی ئازاد. کێشی جلوبەرگی ژنانە لەم ماوەیەدا بەپانزە پاوەند دەگەیشت.[٦٨] مۆدێلی جلەکان بەجۆرێك بوو کە رێگەی جوڵەو هەناسەی ئازادی بە ژن نەدەداو لە ئەنجامدا رێگەی لە توانای ماسولکەکان دەگرت بەهۆی جوڵەوەو وەك هۆکاری "بەرهەمهێنانەوەی" لاوازی جەستەیی ژنان سەیری دەکرا. سەرەڕای ئەوە ئەو ژنانەی باوەڕیان بە یەکسانی هەبوو ئەوەیان دووپات کردەوە کەوا شێوەی جلوبەرگی باو بە جۆرێکە کە بەشێوەیەکی بەردەوام "جیاوازی" دوو رەگەزەکە پیشاندەداتو بەدەربڕینی ئۆکلی، جلوبەرگ وەك "پێداویستییە *ناسنامە بەخشەکان*"[٦٩] کاری دەکرد.[٧٠] هەروەها هەندێ لەوانەی لە بزاڤەکەدا چالاك بوون پێیانوابوو کە شێوازی جلوبەرگی ژنان بەجۆرێك لە جۆرەکان پیاوان هوشیار دەکاتەوە سەبارەت بەغەریزەکانی خۆیان. زۆربەیان بڕوایان بە پێویستی چاکسازی جلوبەرگی ژنان هەبوو و شێوازی جلوبەرگی تەسك لەو ماوەیەدا وەك سیمبولێکی "ملکەچی" ژنان دەژمێردرا. ئەوان لەو باوەڕەدابوون جلوبەرگی ژنان بایەخی لە رزگاری فیزیکی ژناندا هەیەو ژنان تا ئەوکاتەی جلێکی راحەت نەپۆشن ناتوانن بە باشی کاربکەنو جەستەی خۆیان بەسەلامەتی بهێڵنەوەو لە ئەنجامدا چاکسازی جلوبەرگی ژنان یەکێك بوو لەو تەوەرانەی جێی بایەخی فیمینیستەکان بوو لەو ماوەیەدا.[٧١]

لەم نێوەدا، ئامیلیا بلۆمەر[٧٢] لە دەیەی ١٨٥٠ بەخستنەڕووی پرۆژەیەکی نوێ بۆ جلی ژنانە بەشێوەی کراسێك تا ژێر چۆکو شەلوارێکی درێژو کراوە کە لە گوزینگ، هەوڵیدا کێشەی ژنان چارەبکات. وێڕای پشتیوانی سەرەتایی رێبەرانی بزاڤی ژنان وەك ئەلیزابێت ستنتۆنو هاریت هانت[٧٣] لەم مۆدەیەی جلوبەرگو ئەو کارە کە هەزاران ژن لە سەرەتادا ئەویان پۆشی، بەڵام بەگشتی پێشوازییەکی بەربڵاوی لێنەکراو بڵاوکراوەکان بەگاڵتەپێکردنی بۆنە هۆی ئەوەی شوێنی لە ناو ژناندا نەبێتەوەو زۆر لەو ژنانەی لە سەرەتادا پەسەندیان کرد بوو دواجار وازیان لێ هێنا.[٧٤] بەم شێوەیە، پرۆژەی چاکسازی جلی ژنانی لە دەیەی ١٨٥٠ شکستی هێنا.





**٢- *چاکسازییە یاساییەکان:*** چاکسازییە یاساییەکان لەم قۆناغەدا بۆ فیمینیستەکان زۆر سەرنجراکێش بوون. بەبۆچوونی ئەوان مەسەلەی گرنگ، ئەو چەمکە بوو کە لە پشت یاسایەکەوە بوو کە کەسایەتی یاسایی ژنی لە دوای هاوسەرێتی ڕەتدەکردەوە. بەبۆچوونی ڕێبەرانی بزاڤی ژنان لە بنەڕەتدا ئەو هزرەی کە ژن بوونی یاسایی خۆی لە دوای هاوسەرێتی لە دەست بدات پەسەند نەدەکرا. ئارنستین ڕۆز[٧٥] ئەو مەسەلەیەی خستە ڕوو کەوا:

> دەڵێن بوونی ژن تێکەڵ بەهاوسەرەکەی بووە. ئایا سروشت ئەم کارەی کردووە؟ ئایا چیدی ژن بوونی نییەو چیدی [دوای هاوسەرێتی] هەست بەچێژو ئازار ناکات؟ ئایا ئەگەر ژن یاسا پەیوەستەکان بەسروشتی خۆی ببەزێنێت؟ پیاو باجی ئەوە دەدات؟[٧٦]

ژنان دەیانزانی بەپێی بنەمای ڕاستیو دروستی، بەکردەوە یاسا پەیوەستەکان بەرەتکردنەوەی مافی خاوەندارێتی ژنان لە زۆربەی بارەکاندا پیادە ناکرێن. بەڵام بەبڕوای ئەوان ناوەڕۆکی یاسا کە ژنەکانی سووک دەکرد. ئەوان لەوەی یاسا بەگشتی "زەمانەتی" ژنی خستبووە ئەستۆی مێرد ناڕازی بوون. سەرەڕای تێبینییە تیۆرییەکان لە هەوڵدان بۆ چاکسازییە یاساییەکان، ژنان دەیانزانی یاسا لە بنەڕەتدا دیاردەیەکە شیاوی گۆڕانو، گۆڕانی یاسا ئاسانترە لە دروستکردنی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیو ڕوحی. لە ئەنجامدا ژنان لەم قۆناغەی بزاڤدا بە مەبەستی گۆڕینی یاسا جیاوازەکان کە ئەوانیان بە زیانی ژنەکان دەدیت زۆر چالاك بوون.[٧٧]

هەڵبەت یەکەم هەنگاوی پراکتیکی بە مەبەستی گۆڕان بەتەواوی بە داهێنانی ژنان شێوەی وەرنەگرتو ئەوە ئەو پیاوانەی ئەندام بوون لە ئەنجومەنی ویلایەتی نیۆیۆرك کە لە ساڵی ١٨٣٦ مەسەلەی گۆڕینی ئەو یاسایانەی پەیوەستبوون بە وەرگرتنی خاوەندارێتی لە ژنە بەمێردەکان خستەڕوو. وێڕای ئەوەی دەنگدان لەسەر ئەم یاسایە لەلایەن ئەو خێزانە دەوڵەمەندانەوە پشتگیری لێکرا کە حەزیان لە پاراستنی مافی کچو هاوسەرەکانیان بوو، بەڵام تا ساڵی ١٨٤٨ پلانی ناوبراو دەنگی لە سەر نەدرا.[٧٨]



هەڵبەت لە پرۆسەی دارشتنو لێکۆڵینەوەو دەنگدانیدا، خودی ژنان چالاکییان نواند. ئەلیزابێت ستنتۆن، ئارنستین ڕۆزو پائولین ڕایت داڤیس[٧٩] لە ژنە چالاکەکان بوون لەم بوارەدا.[٨٠] سەرەڕای ئەوە ژنان لە داواکارییە جۆراوجۆرە ساڵانییەکانیاندا داوای نەهێشتنی گشت ئەو یاسایانەیان دەکرد کە "بەرپرسیارەتی ژنە بەمێردەکانیان لە بەرامبەر کارەکانیان" بەرزتر دانانێت تەنانەت لە "بەرپرسیارێتی منداڵ، ساویلکەو شێتەکان". بەپێی یاسای دەنگ لەسەردراو، داراییو موڵکی ئەو ژنەی لەوە بەدوا مێرد بکاتو لەکاتی مێردکردندا ئەو داراییانەی هەبێت و، ئەو کرێو قازانجەی لێیەوە دێت نابێتە موڵکی مێردەکەیو لە بەرامبەر قەرزەکانی مێرددا تۆمار ناکرێتو وەکو ژنێکی بێمێرد لە شێوەی دارایی جیاوازو شەخسی خودی ژنەکە لەقەڵەم دەدرێت". بەهەر شێوەیەك بێت، بەدانانی یاسا، ژنانی بەمێرد سەبارەت بە دارایی شەخسی خۆیان کۆنترۆڵی تەواویان بەدەستهێنا، بەڵام حەقدەستی ژنان وەکو خۆی پەیوەست بوو بە مێردەکانو دواجار ئەم یاسایە زێتر مافی ژنەکانی چینی دەوڵەمەندی دابین کرد نەك ژنانی کرێکار کە دیسان هیچ مافێکیان سەبارەت بەداهاتیان نەبوو.[٨١] بەرەبەرە لە ویلایەتە جیاوازەکانی ئەمریکا ریفۆرمە یاساییەکان لە بواری خاوەندارێتی ژناندا شێوەیان وەرگرتو لە هەندێك باردا مافی تەڵاق بۆ ژنان بەفەرمی ناسرا.

سەرەڕای ریفۆرمی یاساکانی خاوەندارێتی، ژنان خوازیاری ریفۆرمی یاساکان لە بوارەکانی دیکەشدا بوون. ئەوان دەیانەویست ژنان مافی تەڵاقیان هەبێت، لەکاتی تەڵاقدا بتوانن مافی بەخێوکردنی منداڵەکانیان لەو بارەدا کە پیاوەکە لە تەڵاقدا خەتای هەبێت بەدەست بهێنن، ژنە کرێکارەکان لەڕووی هەلومەرجی کار لەوانەش سەعاتەکانی کارو حەقدەستو، هەروەها پشتیوانی لەوە بکەن کە ژنان مافی حەقدەستی خۆیان هەبێت، و تەمەنی باڵقی[٨٢] بۆ شانزدە ساڵ بەرزبکەنەوە. ئەوان تارادەیەك لە هەموو ئەم بوارانەدا توانیان یاساگەلێك دانێن لە زۆر لە ویلایەتەکانداو لە ویلایەتەکانی دیکەشدا بەرەبەر ئەم مافانە دەنگیان لەسەردرا.





کێشەی نایەکسانی ئەو ژنو پیاوانەی کاریان دەکرد لە ڕووی ڕێژەی حەقدەستەو پێویستی ریفۆرمە یاساییەکان کە ئەم نایەکسانیە نەهێڵن، جێگەی سەرنجی زۆربەی لایەنگرانی مافەکانی ژنان بوو. سارا گریمکی ساڵی ١٨٣٧ لە نامەیەکدا بۆ برادەرەکەی نووسی:

> من لەو بڕوایەدام پیاوێك کە وانە دەڵێتەوە هەمیشە دەتوانێت حەقدەستێکی زێتر لە ژنێك بۆ وانەگوتنەوە وەرگرێت تەنانەت ئەگەر هەمان لق [وانە] بلێتەوەو لە هیچ ڕوویێکەوە لە ژن باشتر نەبێت.... پیاوێك بۆ دورمانی هێلەکێك یان شەلوارێك دوو تاکو سێ هێندەی ژنێك حەقدەست وەردەگرێت، تەنانەت ئەگەر کاری هەردووکیان وەك یەك باش بێت. لەو کارانەی تایبەتن بە ژنان نرخی کاتی ئەوان تەنیا نیوەی نرخی کاتی پیاوانە.[٨٣]

بەم شێوەیە، دیارە کە وێڕای ئەوەی زۆربەی ئەو ژنانەی لایەنگری بزاڤی ژنان بوون لەم قۆناغەدا، لە چینەکانی ناوەڕاستو ناوەڕاستیی سەرووی کۆمەڵگا بوون بە پێویست سەرنجیان دەدایە ریفۆرمە یاساییەکان بۆ هێورکردنەوەی ڕەوشی ژنانی چینەکانی خوارەوە- لەسەر بنچینەی گوزارەی یەکسانی نێوان دوو ڕەگەز لە هەلومەرجی هاوشێوەدا- لە تەك ئەو ریفۆرمانەی زێتر لە بەرژەوەندی ژنانی چینی ناوەندا بوون.

سەرەڕای ئەوە، ژنان بەدوای ریفۆرمگەلێکی یاساییەوە بوون کە دەرفەتگەلێکی خوێندنی یەکسانیان بۆ ژنان بەدواوە بێت.[٨٤] هەندێکیان بایەخێکی ئەوتۆیان بەخوێندنی ژنان دەدا کە وای بۆدەچوون خوێندنی باڵا ڕێگەچارەی هەموو گیروگرفتەکانی ژنانە.[٨٥]

**٣- *ریفۆرمە سیاسییەکان:*** لەم قۆناغەدا یەکێك لە گرنگترین ئەو مافانەی بزاڤی ژنان بایەخی پێدەدا، بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بوو، وێڕای ئەوەی کە خستنەڕووی ئەم مافە لە سنکافالزدا یەکێك بوو لەو کێشانەی زۆرترین مشتومڕی دروست کرد، بەڵام بەرەبەرە گۆڕان بۆ تەوەری سەرەکی ململانێکان. ئەو کاتەی لە سنکافالزدا دەیانویست



ماددەیەك تایبەت بکەن بە مافی دەنگدان بۆ ژنان، داواکارییەکە هێندە رادیکاڵ دەهاتە بەرچاو کە لەگەڵ دژایەتی هاوشان بە ترسی زۆر لە بەشداربووان ڕووبەڕووبووەوە. لە ڕاستیدا، ئەوە فریدریك دوگلاس، ڕەشپێستی چالاکی بزاڤی دژە کۆیلایەتی بوو کە بەجەخت کردن لەسەر پێویستی بەهرەمەندبوونی ژنان لە مافی دەنگدان، دوودڵی ژنانی ڕەواندەوەو لەم بوارەوە بڕوای پێ هێنان. دواجار بەندێك بەم ناوەڕۆکەوە بۆ ڕاگەیاندنی پرەنسیپەکانی بیروباوەڕی کۆبوونەوەی سنکافالز زیادکرا کە"ئەوە ئەرکی پیرۆزی ژنانی ئەم وڵاتەیە کە بۆ خۆیان مافی دەنگدان بەدەست بهێنن." ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەم بەندە تاکە حاڵەتێك بوو کە بە ئیجماعی دەنگەکان بڕیاری لەسەر نەدراو بە دەنگی زۆرینە بڕیاری لەسەر درا.[٨٦]

بەگشتی، وادێتەبەرچاو لەم قۆناغەدا بەدەستهێنانی مافی دەنگدان لەلایەن هەموویانەوە لە بزاڤی ژناندا پشتیوانی لێنەدەکرا، زۆر لە ژنانی چالاك لە بزاڤەکەدا ئەویان بە گرنگ نەدەزانی. مارگرێت فولەر پێیوابوو هیوای سەرەکی ژنان ئەوە نییە "فەرمانڕەوایی" بکەن، بەڵکو دەبێت بتوانن بە"گەشەسەندنو بەرزیی" بگەن. بەڵام ئەلیزابێت ستنتۆن ئەوەی بەمایەی بایەخێکی زۆر لە قەڵەم دەدا.[٨٧]

سۆزان ئەنتۆنی لەو بڕوایەدا بوو بەسەرنجدان لە داهێنانی ئامێر کە بووە هۆی ئەوەی ژنان بتوانن بەوردی هەمان چالاکییەکانی پیاوان لە کاردا ئەنجام بدەنو ئەو مەسەلەیەی کە"لە هەر شوێنێك پیاوێك بتوانێت دۆلارێکی ڕاستەقینە بەدەست بهێنێت ژنێکیش دەتوانێت" پاشان "نکۆڵی لەو ئەنجامە ناکرێت کە دەبێت ئەویش بەهرەمەند بێت لە دەسەڵاتێکی یەکسان بۆ بەرگریکردن لە خۆی. ئەم دەسەڵاتە مافی دەنگدانە، سیمبولی ئازادیو یەکسانی کە بەبێ ئەو هیچ هاوڵاتییەك دڵنیا نییە بتوانێت تەنانەت ئەوەی هەیەتی بپارێزێت، چ بگات بەوەی بتوانێت ئەوەی نییەتی بە دەست بهێنێت".[٨٨]

ستنتۆن ساڵی ١٨٥٤ ڕایگەیاند "ئێمە تاکەکەسین، هاوڵاتیگەلێکی ڕەسەنو ئازاد، خاوەن موڵکینو باج دەدەین، بەڵام نکۆڵی لە مافی دەنگدان دەکرێت بۆ ئێمە... ئێمە هەموو تایبەتمەندیگەلێکی پێویستمان بۆ دەنگدەرێکی یاسایی هەیە جگە لە





یەکێکیان، ئەویش رەگەزە". بەبۆچوونی لایەنگرانی مافی دەنگدان، نەمانی مافی دەنگدان وەك "نەبوونی توانا لە دروستکردن، فۆرمۆلیزەکردنو کۆنترۆڵی رەوشی خۆیان" دەبێت چونکە"ئەو تاکەکەسانەی مافی دەنگدانیان نییە دەبێت هەمیشە کاربکەن، حەقدەستەکان پەسەند بکەن و، پێگەیەك قەبوولْ بکەن کە ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەیە بۆیان دەستنیشان کردووە".[٨٩]

***٤- دژە پیاوی، رەخنە گرتن لە خێزانو هاوسەرێتی:*** پەیوەندی لەگەڵ بزاڤی نەهێشتن یەکێك بوو لەو هۆکارانەی بۆوە هۆی ئەوەی جۆرە هاوشێوەییەك لە نێوان پەیوەندییەکانی کۆیلەو گەورەی ستەمکارو ژنو پیاوی ستەمکاردا ببینن. لە راگەیاندنی سنکافالزدا بە روونی وەك "ئەو زۆردارانەی" بەدرێژایی مێژوو ژنەکانیان خستووتە کوتو بەندەوەو مافەکانی ئەوانیان پێشێل کردوون، باس لە پیاوان کرابوو. لە هەندێك کۆبوونەوەی ژنانیشدا بەیاننامەگەلێك بڕیاریان لەسەر دەدرا کە باسیان لە جۆرێك لە راگەیاندنی "شەڕی سێکسی"[٩٠] دەکرد. بەڵام لەم بوارەوە رێکەوتنێك لە نێو بیروڕاکاندا نەبوو. ژنانی رێبەری بزاڤ بەدرێژایی خەباتی دژە کۆیلایەتی لەگەڵ پیاوە هاوبیرەکانیان هاوکاریان هەبوو و توانیبوویان پشتیوانی زۆر لە پیاوان بۆ ئامانجەکانی بزاڤی ژنان زامن بکەن. لە راستیدا لەم ماوەیەی خەباتدا، ژنان بەزۆری بەدوای ئەوەوە بوون کە "تاکی مۆدێرن" بەهەموو مافو بەرپرسیاریەتییەکانیو ئەو پێناسەیەی کە لێی دەکرا لەسەر بنچینەیەکی تاڕادەیەك پیاوانە بەسەر ژنانیشدا بگشتێنن، نەك ئەوەی بیر لە وەلانانی پیاوان بکەنەوە یاخود پەیوەندیان لەگەڵدا بپچڕێنن. ئەوان وێڕای پشتیوانی کردن لەو کەمایەتیانەی لە پیاواندا هەن، ئەوانیان وا دەبینی کە دەکرێ چاك بکرێنو پێیانوابوو بەگۆڕانکاریکردن لە شێوازەکانی بەکۆمەڵایەتیبوونو پەروەردەو فێرکردن، هەم ژنانو هەم پیاوان، دەبنە خاوەن خەسڵەتێکی مرۆیی گونجاوتر. بێلکڤول توانی تەنانەت باوەڕ بە لوسی ستۆنی "بێزار لە پیاوان"یش بهێنێت کە "زۆرینەی پیاوەکان بە ئەنقەست ستەم لە ژنان ناکەن". کاتێك ئەلیزابێت بێلکڤول راپۆرتی یەکێك لە یەکەمین کۆبوونەوەکانی ژنانو ئاوازی توندی دژە پیاوانەکەی بینی، گوتی "ناتوانم



هاودڵییەکی تەواوم هەبێت لەگەڵ بزاڤی دژە پیاوی. من هێندە خۆشەویستی، هاوکاریو توانای دەستنیشانکردنم لە پیاوان بینیوە کە ئەم تێڕوانینەی ژنان بەناراحەتکەر لەقەڵەم بدەمو پێموایە دوا ئامانجی ئازادی لە رێگەی ترەوە بەدەست دێت".[٩١]

لەبارەی هاوسەرێتیو خێزانیشەوە بیروبۆچوونێکی کوكو تەبا نەبوو، زۆر لە لایەنگرانی مافەکانی ژنان لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم باسیان لە"هاوسەرێتی" دەکرد وەك "ئامرازێکی سەرەکی ستەم لەسەر ژنان". هەندێکیان بە تەواوی دامەزراوەی خێزانیان نادادپەروەرانەو بەمەبەستی ملکەچی ژنان دەبینیو هەندێکی دیکە سەرنجیان لە رەوشی ژێردەستی ژنان لە ناو خێزاندا دەدایەوە، بەڵام حەزیان لە نەهێشتنی خێزان نەبوو، چاکسازییەکەی پەیوەست بەچاکسازی پیاوانو پەیوەندی نێوان دوو رەگەزەکە دەبینی. ئیزا دۆرا دوەنکان[٩٢] هەر لە گەنجییەوە بڕیاری دابوو "دژی هاوسەرێتی بجەنگێت"و ئەم جەنگەی بەهاوواتا لەگەڵ خەبات لە رێگەی "رزگاری" ژناندا دەبینی.[٩٣] فراسیس رایت[٩٤] ژنە توندڕەوی بە رەگەز سکۆتلەندی بەتوندی رەخنەی لە دامەزراوەی هاوسەرێتی دەگرتو ئەوی بەدامەزراوەی ملکەچکردنی رەگەزی ژن لەقەڵەم دەدا.[٩٥]

هەڵبەت هەموو ئەوانەی پشتیوانی مافەکانی ژنان بوون لەم شوێنەوە رەخنەیان لە هاوسەرێتی نەدەگرت. سارا گریمکی وێڕای رەخنەگرتنیش لە رەفتاری "ستەمکارانە"و "زۆردارانە"ی هەندێك لە مێردان، خۆی مەسیحییێکی باوەڕدار بوو، شووی کردو دژی هاوسەرێتی نەبوو وەك دامەزراوەیەك. بەهەمان شێوە، وێڕای ئەوەی لۆسی ستۆن لە رەخنەگرەکانی هاوسەرێتی بوو لەو رووەوە کە ژنان لەگەڵ شووکردن مافە ئابوورییەکانیانو تەنانەت ناسنامەی خۆیان وەك تاکەکەسێك لە دەست دەدەن، بەشیاوی رەخنەی دەزانی، خۆی مێردی بە هێنری بێلکڤول کرد. هەڵبەت هاوسەرێتی ئەم دووانە هاوشان بوو بە بەڵگەنامەیەك کە بەپێی ئەو لۆسی ستۆن ناوی خێزانی سەردەمی کچێتی خۆی دەپاراست، پارەو پولەکانی پەیوەست بوون بەخۆیەوەو لە مافە





تاکەکەسییەکانی و مافی بڕیاردانو... بێبەش نەدەبوو. تەنانەت بێلکڤول، ستۆن، خوشکانی گریمکیو... لەوە دەترسان کە خەباتیان لە پێناو "مافە دادپەروەرەکان"ی ژنان لەگەڵ گوزارەکانی وەك ئەشقی ئازاد کە بەتوندی لە ڕای گشتی خەڵکدا ناشرین دەکرا، پەیوەندی بەرقەرار بکاتو بە"پیلانێك لە دژی پاکیزەیی"و دامەزراوەی پیرۆزی هاوسەرێتی" لەقەڵەم بدرێت.(٩٦)

***٥- خستنەڕووی تێگەیشتنگەلێکی نوێ لە مەسیحییەت:*** بەدرێژایی مێژووی مەسیحییەت، تارادەیەك زۆربەی بەرپرسانی کەنیسە بەچاوێکی نەرێنی مامەڵەیان لەگەڵ ژناندا دەکرد. ئەوان لەلایەکەوە، لە بنەرەتدا ژنیان بەبوونەوەرێکی فریودەرو گوناهکار دەبینی و لەلایەکی دیکەوە، ملکەچی ڕەهای ئەو بۆ پیاو وەك ئەرکێکی ئایینیو خوایی دەخستەڕوو. لە ئەنجامدا، یەکێك لەو بابەتانەی جێگەی سەرنجی ژنان بوو لەو ماوەیەدا- کە لە قۆناغەکانی دواتری بزاڤی ژناندا ڕەهەندی بەربڵاوتری بەخۆوە بینین- دووبارە ڕاڤەکردنەوەی ئایینی مەسیحییەت بوو بەجۆرێك کە پشتیوانی مافەکانی ژنان بێت. مارگرێت فولەر لەو بڕوایەدا بوو مەرجی نفووز و زاڵبوونی "هێزی خوایی" بەسەر سروشتدا ئەوەیە "ئازادی دەروونیو دەرەکی بۆ ژن بەهەمان شێوەی کە بۆ پیاوان وەك ماف دەناسرێت، بۆ ئافرەتانیش وەك مافێك بە فەرمی بناسرێت نەك جیاوکێك".

سارا گریمکی لە نامەیەکدا بۆ دوستەکەی ئاماژە بەم خاڵە دەکات کە ڕکابەرانی مافەکانی ژنان بۆ داکۆکی کردن لە دژایەتی خۆیان پشت بەپەیمانی نوێ (العهد الجدید) دەبەستن، بەڵام بە ڕای ئەو، دەبێت دەقە ئایینییەکان لەو گومانانەی لە وەرگێڕانەکانو ڕاڤە ناڕاستەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە، بپاڵێورێن:

منیش پەرۆشم مل بۆ دادوەرییەکانی ئەو [کتێبە ئاسمانییە] کەچ بکەم، بەڵام دەبێت ڕەخنەی خۆم سەبارەت بەوەرگێڕانی ناڕاستی هەندێ دەستەواژە لەلایەن کەسانێکەوە کە ئەم کارەیان ئەنجامداوەو هەروەها لە دژی ئەو ڕاڤە تەحریفکراوەی پیاوە موفەسیرەکان کردۆیانە، بخەمەڕوو. دەمەوێت وا



بیربکەمەوە کاتێك ڕێگەمان پێدەدەن شانازی بەفێربوونی زمانەکانی یۆنانیو عیبرییەوە بکەین، خوێندنەوەگەلێکی جیاواز لە ئینجیل دەخەینەڕوو کە تارادەیەك لەگەڵ ئەوانەی ئەمڕۆ هەمانە جیاوازن.(٩٧)

هەندێ ژن لە ڕێبەرانی بزاڤ پێیانوابوو لە بنەڕەتدا دەقە پیرۆزەکانو ئینجیل پاڵپشتو پارێزەری بزاڤی ژنانن. گەرموگوڕترینی ئەم کەسانەش ئەنتوانێت براون(٩٨) بوو کە لەو بڕوایەدابوو دەبێت دووبارە ئینجیل بنووسرێتەوەو ئەو خاڵانەی پشتیوانی لە سووکی یاخود ژێردەستە لە قەڵەمدانی ژنان دەکەن بسڕنەوەو ئەم کتێبە ببێتە پشتیوانی مافەکانی ژنانو ئامانجیان.(٩٩)

ساڵی ١٨٥٤، لۆکرشۆت ئەو بابەتەی خستەڕوو کە ئەوە "ئینجیل نییە ژن دەکاتە پاشکۆی مێرد" بەڵکو "یاساو ڕای گشتی"ن ئەم جۆرە تێگەیشتنانە دەهێننە ئاراوە.(١٠٠)

یەکێك لەو خاڵانەی جێی سەرنجی ئەو ژنانە بوو کە خوازیاری یەکسانی بوون لەگەڵ پیاوان ئەگەری گەیشتن بە یەکسانی بوو لە هیرارکییەتی کەنیسەییو هەروەها ئەگەری بەدەستهێنانی خوێندنی ئایینیو گەیشتن بوو بەپلەوپایە ئایینییەکان. ژنان خوازیاری ئەوە بوون بتوانن ئامۆژگاری بکەن. هەڵبەت لە هەندێك تاییفەی مەسیحییەتدا ئەو ئەگەرە بۆ ژنان لەئارادا بوو، بەڵام ژنان خوازیاری فرەوانکردنی بوون لە نێو هەموو تاییفەو ئایینزاکاندا.(١٠١)

**ڕێکخستنو ئامرازەکانی خەبات**

وێڕای ئەوەی ژنان لە ڕێکخراوە جیاوازەکاندا لە ڕێگەی قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکان، نەهێشتنی کۆیلایەتیو خستنەڕووی خزمەتگوزارییەکان لە شەڕی ناوخۆو بەتەریبی لەگەڵیدا لە یانە نەریتییەکانی ژناندا چالاك بوون، بەڵام بەکردەوە لەم قۆناغەدا ڕێکخراوی تایبەتیی بزاڤی ژنان بەشێوەیەکی ڕێکخراو لە ئارادا نەبوون.





هەڵبەت دوای سنکافالز، کۆبوونەوەگەلێکی جیاجیا لەلایەن لایەنگرانی مافەکانی ژنان لە شارە جیاوازەکاندا دەبەستران، بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بە کۆبوونەوەکانی رۆچستەر، فلادلفیا، سیلیمو... بکەین هەروەها ساڵێك دوای سنکافالز "کۆمەڵەی نەتەوەیی مافەکانی ژن"[١٠٢] کە لەسەر ئاستی نەتەوەییو هەروەها ئاستی ویلایەتدا دانیشتنی هەبوون، بەڵام بەمانای وردی وشەکە بەرێکخراوێکی شێلگیرو رێکخستوو لە قەڵەم نەدەدرا.[١٠٣] لە راستیدا لە دەیەی ١٨٥٠ هیچ رێکخراوێکی هەمیشەیی تایبەتی بە مەبەستی بەرەو پێش بردنی بزاڤی مافەکانی ژنان دروست نەبوو جگە لە کۆمیتەیەك کە نەگونجاو بوو بەناوی "کۆمیتەی ناوەندی" کە لەو ویلایەتانەی ژنە لایەنگرەکانی مافەکانی ژنان چالاك بوون، دانیشتنیان رێکدەخست. لە ئاستی نەتەوەیشدا تەنیا شتێك کە هەبوو کۆبوونەوەگەلێکی پەرتوبڵاوبوون، ئەوانیش زۆری بەپشتیوانیو هاوکاری لایەنگرانی گاریسۆن[١٠٤] لە بزاڤی نەهێشتن دەبەستران. یەکەمین کۆبوونەوەی نەتەوەیی مافەکانی ژنان لە ساڵی ١٨٥٠ وۆسێتەر[١٠٥] ماسوچۆست بەسترا. لە ساڵی ١٨٥٠ تا ١٨٦٠ جگە لە ساڵی ١٨٥٧ ئەم کۆبوونەوانە ساڵانە دەبەستران. لە ماسوچۆست ساڵانە کۆبوونەوەیەك دەبەسترا، هەندێجاریش ئەم کۆبوونەوانە لە نیۆیۆرك، پەنسەلڤانیاو ئۆهایۆو جارێکیش لە ئیندیانا بەسترا.[١٠٦]

وا دەردەکەوێت ژنان لەم قۆناغەدا دەترسان لەوەی بوونی رێکخراوەکان ببێتە رێگر لەبەردەم فرەوانبوونی چالاکیو هەوڵە تاکەکەسییەکانو داهێنانو هەروەها دەسکەوتەکانیان سنووردار بکەن. ئەم بۆچوونە تارادەیەك تاکۆتایی شەڕی ناوخۆ زاڵ بوو. هەڵبەت بەهەمان شێوەی گوترا، ژنان رێکخراوگەلێکیان لە ئاستی نەتەوەییو ویلایەتی بەئامانجی تایبەتو سنوورداروەوە- وەك هاوکاریکردنی بەرەکانی شەڕ، یارمەتیدانی بەرەوپێش چوونی بزاڤی نەهێشتن، کۆمەڵەگەلێك بۆ بەسەراگەیشتنی گیروگرفتە تایبەتییەکانی کچانی گەنجو رێکخراوە پیشەییەکان- هەبوو[١٠٧] کە وەك رێگە خۆشکردنێك بۆ ئەزموونی کاری رێکخراوەییو هەروەها بەرقەراری پەیوەندییەکان لە قۆناغی دواتری بزاڤەکەدا بە هۆکارێکی کاریگەر دادەنرا.



لەم ماوەیەدا، گرنگترین هۆکاری پەیوەندی نێوان ناوچە جیاوازەکان، نامەنووسیو سەفەرە شەخسییەکان بوون، سۆزان ئەنتۆنی پڕ سەفەرترین رێبەری بزاڤی ژنان بوو کە بە شەمەندەفەر، گالیسکە،...هتد دەچووە شوێنی جیاواز، وتاری دەخوێندنەوە، ئیمزای بۆ دادگاییکردنەکان کۆکردنەوەو پرۆپاگەندەی بۆ بەرژەوەندی بزاڤ دەکرد.[١٠٨]

بە بۆچوونی فلێکسنەر، لەم قۆناغەی بزاڤدا "ژنان چەکێکیان نەبوو بتوانن بەهۆیەوە بۆ بەدیهێنانی خواستەکانیان گوشار بهێننو ئەمە تا شەڕی یەکەمی جیهانی بەردەوام بوو، تاکە ئامرازیان وتاردان، بڕیارنامەو کۆبوونەوە بوو، ئەگەر بەدەستهێنانی پشتیوانی گشتی لە رێگەی خستنەڕووی پرۆگرامە حزبیەکان یاخود بڵاوکراوەکان سنووردار بوو... بەبێ مافی دەنگدان ئەگەری دانانی یاسا لەئارادانەبوو"[١٠٩] هەڵبەت راستە ژنان لەو ماوەیەدا ئەگەری هەنگاونانی ڕاستەوخۆی سیاسییان نەبوو بەشێوەی دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی دەیانەوێت لە ئەنجومەنی یاسادانانو بەدواداچوون بۆ دانانی ئەو یاسایانەی مەبەستیانن، بەڵام سستەمی سیاسی هەیی (موجود) رێی ئەوەی دەدا ئەوان سوود لە ئامرازە هەییەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا وەرگرن بۆ خستنەڕووی ئەو کێشانەی بایەخیان پێدەداو گواستنەوەیان بۆ ڕای گشتیو ژێدەرە سیاسییەکانو هەروەها بە رێگەی جیاواز کاریگەری لە گۆڕینی بیروباوەڕی گشتیو کاربەدەستە بەرپرسیارەکان بەتایبەتی لە کوڕو کۆمەڵەکانی یاسادانانداا بنوێنن.

ژنان لەو ماوەیەی خەباتی خۆیاندا تارادەیەکی زۆر- سەرەڕای گردبوونەوەکانیان لە ئاستی ناوچەیی، ویلایەتی و نەتەوەیی- پشتیان بە وتاردان لە نێو خەڵکیدا دەبەست. ئەم کارە زێتر لەو کۆڕو کۆمەڵانەدا کە جیاواز بوون لەو کۆڕو کۆمەڵانەی پەیوەست بوون بە مافەکانی ژنان ئەنجام دەدران. وێڕای ئەوەی زۆر لە پیاوان دژی وتاردانەکانی ژنان بوون، بەڵام ستایشی توانای ئەوان لە وتاردانو هەندێجاریش ناوەڕۆکی گوتەکانیان دەکرد، بەم شێوەیە، لە رێگەی وتاردانەوە نەك تەنیا بیروڕای ئەوانەی پشتیوانیان لە مافەکانی ژنان دەکرد دەگوازرانەوە بۆ ڕای گشتی، بەڵکو بەکردەوە مافی ئەوان بۆ ئامادەبوونیان لە کایەی گشتیدا زێتر لە جاران بەفەرمی دەناسرا.[١١٠]





بڵاوکراوەکان، لەوانەش ڕۆژنامە خەبەرییەکان، بڵاوکراوە تایبەتییەکانی ژنان یاخود بڵاوکراوە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان، هەروەها کتێب ئامرازێکی دیکەی گواستنەوەی هەواڵەکانی بزاڤ و بیروڕای ژنە ڕێبەرەکانی بوو. بڵاوکراوەکان هەواڵی ڕووداوەکانی وەك کۆبوونەوەی سنکافالزو کۆبوونەوە هاوشێوەکانی بڵاودەکردنەوە، لە ئەنجامدا، خەڵك نە تەنیا ئاگاداری هەواڵی ئامادەیی ژنان لەم کۆبونەوانەدا دەبوو، بەڵکو لە داواکارییەکانیشیان ئاگادار دەبوون. هەڵبەت پەرچەکرداری ڕۆژنامەکان سەبارەت بە بزاڤ لە زۆر بواردا نێگەتیڤ بوو بەڵام بە هەرحاڵ، بەچاوپۆشین لەو ڕاڤەیەی لە بزاڤ دەکرا، تەنیا بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانیش بۆ بزاڤ بایەخی خۆی هەبوو. هەندێ ژن لە بڵاوکراوەکاندا دەیانووسیو کتێبەکانی خۆیان کە بۆچوونو بیروباوەڕەکانی بزاڤی ژنانیان لە خۆگرتبوو بڵاودەکردنەوە. دەشێ لەوانیش ئاماژە بە مارگرێت فولەر بکەین کە نە تەنیا نووسەری کتێبی ژن لە سەدەی نۆزدەدا بوو، بەڵکو سەرنووسەری گۆڤاری "دایل"[111]ی لە نیوئینگلاندیش لە ئەستۆ بوو.[112] هەڵبەت ژنان لەم قۆناغەدا ئۆرگانێکی تایبەتیان بۆ بزاڤی ژنان نەبوو، بەڵام بەرەبەرە بەکارکردن لە گۆڤارە جیاوازەکانی ژنانو هەروەها ئەو بڵاوکراوانەی پشتیوانی بزاڤی نەهێشتنیان دەکرد ئەزموونی کاری ڕۆژنامەنووسیان بەدەست دەهێنا.

ژنان بۆ ئاگادارکردنەوەی گشتی پەنایان بۆ هەوڵەکانی وەك ئامادەکردن و هەڵواسینی پۆستەریش دەبرد. لۆسی ستۆن خۆی بۆ ڕاگەیاندنی دانیشتنەکان، پۆستەرە ئامادەکراوەکانی بەدارەکانەوە دەچەسپاندن و هەڵبەت لە هەمان کاتدا تاکەکەسە ڕکابەرەکانو لاوان بەدوایدا دەڕۆیشتن بە بەرد لەسەری ئەویان دەداو ئەو پۆستەرانەیان لێ دەکردنەوە کە هەڵیدەواسین.[113]

یەکێکی تر لەو ئامرازانەی ژنان بەتایبەتی بەپشت بەستن بەئەزموونەکانیان لە بزاڤی نەهێشتندا پەنایان بۆ دەبرد، کۆکردنەوەی ئیمزا بوو بۆ ئەو داواکارییانەی کە بە مەبەستی پێشکەشکردنی بۆ ژێدەرە یاسادانەرییەکان ئامادەدەکران. خاتوو فەرین بە



مەبەستی کۆکردنەوەی ئیمزای داواکاری بۆ مافی خاوەندارێتی ژنان لە ویلایەتی ماساچوست٦٠٠ میل ڕێگەی بڕی کە ٤٠٠ لەو میلانەی بەپێ بڕین.[114]

پیادەکردنی نفووز لە کۆڕو کۆمەڵەکانی یاسادانانداا چ بەشێوەی بە لۆبکردن[115] و سوود وەرگرتن لە نفووزی شەخسی لەسەر تاکەکان- لە شێوەی نفووزی هۆکەر لە "زەینو دڵی" نوێنەراندا- و چ بەشێوەی ئامادەبوون لە دانیشتنەکانی.[116] کۆمیتەکانی ئەم کۆڕو کۆمەڵانە بەتایبەتی لە ئاستی ویلایەتدا لەو ئامرازە دامەزراویانە بوو کە سوودیان لێ دەبینرا بۆ نموونە کلارینا نیکۆلاس لە بەرامبەر نوێنەرانی ویلایەت ئامادە بوو و بەرگری لە لایحەیەك کرد کە مافی دەنگدانی لە دانیشتنەکانی قوتابخانە ناوچەییەکاندا بە ژنان دەبەخشی[117]. ئەلیزابێت ستنتۆن چەند جارێك لەبەرامبەر کۆمیتەکانی ئەنجومەنی یاسادانان ئامادەبوو هەوڵیدا بەگوتەکانی خۆی نوێنەران بخاتە ژێر کاریگەرییەوە. ئەو لە ساڵی ١٨٦٠ لە یەکێك لەم دانیشتنانەدا بەجەخت کردنەوە لەسەر "بەرپرسیارێتی تاکەکەسی" و پێویستی "ناسینی فەرمانڕەوایی شەخسی تاکەکەس" لەسەرخۆی، پەنای بردە بەر بنەمای مافی هەڵبژاردنی تاکەکەسیو داوای لە نوێنەران کرد دەرفەت بۆ ژنان بە مەبەستی پەرەدان بەکەسایەتی خۆیان بڕەخسێنن.

لەوکاتەدا دروستکردنی هۆشیاری لە ژنان خۆشیاندا تاڕادەیەك شیاوی سەرنجدان بوو. واتە هەمان ئەو شتەی کە لە شەپۆلی دووەمی فیمنیزمدا لە ژێر ناوی "بەرزبوونەوەی هۆشیاری"[118] بەشێوەیەکی هۆشیارانە گۆڕا بۆ تەوەری سەرەکی خەباتکردن. ئارنستین ڕۆز بەم دەستەواژانە جەختی لەسەر پێویستی ئەم پرۆسەیە کرد:

> پێویستە ئێمە سوود لەو شێوازە وەرگرین کە هەندێ کات پزیشکان دەیگرنە بەرو بەو نەخۆشانەیان کە زۆر نەخۆشن دەڵێن ئەو ئاگای لە دەردو زەحمەتی خۆی نییە. دەبێت ئێمەش ڕەوشی ژنان بۆ ئەوان خۆیان ڕاڤە بکەینو روونکردنەوە پێشکەش بکەین لەبارەی ئەو بارە قورسەی لەسەر شانیانە.[119]





بەم شێوەیە، لەم قۆناغەی بزاڤی ژناندا وێڕای ئەوەی چالاکیو پانتایی بزاڤەکە سنوردار بوو، سوود لە ئامرازە جیاوازەکان- تاڕادەیەك هەموو ئامرازە بەردەستەکان- بۆ گواستنەوەی هەواڵو پەیامەکانی بزاڤ وەردەگیرا. وێڕای ئەوەی کە بۆ یەکەمجار ئەوە لە ئەمریکا بوو مەسەلەی ژنان وەك بزاڤێکی ڕێکخراو سەریهەڵدا نەك لە ئاستی بابەتی باسەکانی کۆڕو کۆمەڵە ئەدەبیو هونەرییەکان، بەڵکو لە ڕاستیدا لەم قۆناغە، بزاڤی ژنان گرووپێکی پەراوێزی، گۆشەگیر هەروەها خاوەنی ڕێبەرایەتییەکی وابوو کە تاڕادەیەك سازشی نەدەکرد، خاوەنی داواکاری رادیکال بوو و مافی دەنگدانیش یەکێك بوو لەو داوایانە، لە ئەنجامدا ناتوانین بزاڤ لەم قۆناغەدا بە "بزاڤی مافی دەنگدان" سنووردار بکەین. بزاڤ لەم قۆناغەدا وەها ئاوێتەی داواکارییە رادیکالەکان ببوو کە نەیدەتوانی ڕووبەڕووی پێشوازی گشتی ببێتەوە. بەگوتەی کۆولی زۆر لە قەشەکان بە دژە ئایینی لە قەڵەمیان دەداو زۆر لە پیاوانیش پێی پێدەکەنین.[١٢٠] ژنانی دیکەش هێندە نەیاندەتوانی ئەو داواکارییە رادیکالانەی بزاڤ کە پێچەوانەی ژیانێك بوون کە زۆربەیان حەزیان لێ دەکرد، پەسەند بکەن. ئەم ڕەوشە تاکو ماوەیەك دواتریش بەهەمان شێوە بەردەوام بوو، بەڵام گۆڕان لە ڕێکخراو و خواستەکانی بزاڤ لە قۆناغی دواتردا ڕێگای بۆ سەرکەوتنی ئەوان لە بەدەستهێنانی داواکارییەکانیان خۆش کرد.

### قۆناغی دووەم: لەکۆتایی شەڕی ناوخۆوە تابەدەستهێنانی مافی دەنگدان

بەکۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆییو هاتنی "ساعەتی ڕەشەکان" ژنان لە هەوڵی ئەوەدا بوون بەپشتیوانی بزاڤی نەهێشتن، زەمەنیش بگۆڕن بۆ "ساتێکی مێژوویی بۆ ژنان".(١٢١) بەڵام هەڵسەنگاندنی جیاوازی ڕێبەرانی بزاڤی نەهێشتن لەمەڕ هەلومەرجو پەرچەکرداری نێگەتیڤی ژێدەرەکانی دەوڵەتی لەبەرامبەر خواستەکانی ژناندا نەتەنیا کۆتایی بە یەکێتی پەنجا ساڵەی نێوان دوو بزاڤەکە هێنا، بەڵکو جارێکی دیکە بووە هۆی کە ئەوەی بزاڤی نەهێشتن، ژنان هەنگاوێکی دیکە لە خەباتەکەیان بباتە پێشەوە.



ژنان جەختیان کردەوە کە هاوکات بەخستنەڕووی مافی دەنگدانی کۆیلەکان، پێویستە باس لە مافی دەنگدانی ژنانیش بکرێتو دەنگی لەسەر بدرێت. بەڵام ڕێبەرانی بزاڤی نەهێشتن لەو بڕوایەدا بوون هەلومەرج بەو شێوەیەی ئەوان بۆی دەچن تەنانەت بۆ بەخشینی مافی دەنگدان بە ڕەشەکانیش گونجاو نییەو ئەگەر خواستێکی دیکەش بخەنە سەر کە بەشێکی زۆری کۆمەڵگا بە نەخوازراو سەیری کات، [مافی دەنگدان بۆ ژنان] ئەوا ئەگەری شکستی هەوڵەکان زێتر دەبێت.[١٢٢].

تاکو پێش چاکسازی چواردەیەم (یاسا بڕیار لەسەردراوەکانی کۆنگرە لە ساڵی ١٨٦٦و یاسا بڕیار لەسەردراوەکانی ویلایەت لە ساڵی ١٨٦٦) کە لەسەر بنچینەکەی ڕەچاوکردنی مافی هاوڵاتیانی هەموو ئەتباعەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە فەرمی ناسرا، لە هیچ یەکێك لە بنەماو چاکسازییەکانی دەستووری ئەمریکادا ئاماژە بە نێربوونی دەنگدان وەك مەرجێك نەکرابوو و لە ئەنجامدا ژنان بەپێی تێگەیشتن لە دەستوور، دەنگدانیان بە مافی خۆیان دەزانیو تەنانەت لە هەندێ حاڵەتدا لەسەر بنچینەی بڕیارێکی تاکەکەسی یاخود بەکۆمەڵ بەرەو سندووقەکانی دەنگدان دەچوونو لەم ڕێگەیەوە بەشێوەیەکی سیمبولی جەختیان لەسەر مافی خۆیان دەکردەوە؛ بەڵام لە دەقی ئەم چاکسازییەدا بەڕاشکاوی ناوی "دەنگدەرە نێرەکان"هاتو دواجار لەوە بەدوا، بەخشینی مافی دەنگدان بە ژنان پێویستی دەکرد لە دەستووردا چاکسازی بکرێت. ژنان ئەم چاکسازییەیان بە "خیانەتێك لەگەڵ هاوکارییەکانی ژنان بۆ بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتی" لەقەڵەمدا[١٢٣]. لەم قۆناغەماندا لەبەرئەوەی حزبی دیموکرات دژی مافی دەنگدانی ڕەشەکان بوو، بەقسە پشتیوانی لە خواستی ژنان بۆ مافی دەنگدان دەکرد، بەڵام بەکردەوە نە.

لەساڵی ١٨٦٨ کۆماریخوازە رادیکالەکان پرۆژەی ریفۆرمی پازدەمیان بۆ "مافی دەنگدان" بردە کۆنگرە کە بەپێی ئەو پرۆژەیە "نەژاد، ڕەنگ یاخود ڕەوشی پێشتری کۆیلایەتی" مافی هاوڵاتیانی بۆ دەنگدان نەدەهێشت. ژنان لەو بڕوایەدا بوون دەبێت ڕێبەرانی نەهێشتنو نوێنەرانی کۆنگرە هەر ئێستا وشەی "ڕەگەز"یش بۆ ئەو وشانەی





سەرەوە زیاد بکەن تاکو داواکاری ژنان زامن ببێت. بەڵام لێرەدا لەگەڵ دژایەتی ڕێبەرانی نەهێشتن کە زیادکردنی ئەم وشەیەیان وەك شکستێکی پرۆژەکە دەبینیو هەروەها ڕووبەڕووی دژایەتی توندی ئەندامانی کۆنگرە بوونەوە. ڕەشەکانو ڕێبەرانی بزاڤی نەهێشتن وێڕای ئەوەی دەیانگوت بزاڤی مافەکانی ژنانیان قبووڵە، بەڵام بۆ بەخشینی مافی دەنگدان بەژنان کارێکیان نەدەکرد[١٢٤]. نوێنەرانی کۆنگرە بە تەواوی دژی ئەم پرۆژەیە بوونو لەو بڕوایەدا بوون بەخشینی مافی دەنگدان بەژنان "هەموو ڕەگەزە هەماهەنگە هەنوکەییەکانی کۆمەڵگا [لەناو دەبات و هەلومەرج] دەگۆڕێت بۆ ڕەوشێکی شەڕاویو هەر خانوویەکیش دەکات بەدۆزەخێکی سەر ڕووی زەوی"و "بۆ ئەم وڵاتە، ئەو کاتەی بڵێسەی ڕۆشنی عەشقو داوێنپاکی" لەگەڵ بەخشینی مافی دەنگدان بە ژنان بکوژێتەوە، "ڕۆژێك دەبێت شیاوی داخ بۆ خواردن"[١٢٥]

کاتێك بەشێك لە ڕێبەرانی بزاڤی ژنان بەئاشکرا مافی دەنگدانیان بۆ ڕەشەکان لە هەلومەرجێکدا کە ژنانی سپیپێست مافی دەنگدانیان نەبوو، ڕەتکردەوەو تەنانەت پشتیان بەست بە پشتیوانی تاکە ڕەگەزپەرستەکانو ئەوانەی دژی بزاڤی نەهێشتنی کۆیلایەتیو مافەکانی ڕەشپێستەکان بوون، ڕێبەرانی بزاڤی لایەنگری لە مافی ڕەشەکان ژنی بەپیس لەقەڵەمداو پشتیوانیان لە چاکسازی پازدەیەم بەو شێوەیەی کە تەنیا مافی دەنگدانی پیاوانی دەگرتەوە کردو، لێرەدا ئیئتلافی نێوان دوو بزاڤەکە بەکۆتایی هات.

لەو نێوەدا، لە نێوان ڕێبەرانی بزاڤی ژنان لەو بارەوە کە ئایا دابینکردنی مافی ڕەشپێستەکان ئەولەویەتی زەمەنی هەیە یاخود دەبێت ژنان هەوڵی خۆیان تەنیا بۆ دابینکردنی مافەکانیان بخەنەگەڕ، ناکۆکی بیروبۆچوونەکان سەریهەڵدا. لە کۆبوونەوەی کۆمەڵەی ئەمریکی مافە یەکسانەکان[١٢٦] لەساڵی ١٨٦٩، زۆرینە لەگەڵ جولیا واردهۆ[١٢٧] و لۆسی ستۆن باڵی نەهێشتنیان گرتو لە ئەنجامدا جیابوونەوە لە بزاڤی ژناندا دروست بوو. دوو ڕێکخراوی جیاواز بۆ پشتیوانیکردنی مافەکانی ژنان بە ستراتیژیگەلێکی تاڕادەیەك جیاوازەوە دروست بوون.



"کۆمەڵەی ئەمریکی مافی دەنگدانی ژنان"[١٢٨]- کە لەم کتێبەدا لەوە بەدوا بە ناوی کۆمەڵەی ئەمریکی ناوزەد دەکرێت- بەڕێبەری لۆسی ستۆن لە نۆڤمبەری ساڵی ١٨٦٩ لە کلیولاند دروست بوو، "کۆمەڵەی نەتەوەیی مافی ژنان"[١٢٩]- کە لەم کتێبەدا لەوەو دوا بە کۆمەڵەی نەتەوەیی ناودەبرێت- بە ڕێبەرایەتی ئەلیزابێت ستنتونو سۆزان ئەنتۆنی ڕاستەوخۆ لە دوای کۆبوونەوەی کۆمەڵەی مافە یەکسانەکان دروست بوو، ئەم دووە بۆ ماوەی بیست ساڵ نوێنەرایەتی دوو باڵەکەیان لە ئەستۆدا بوو.[١٣٠]

دوو کۆمەڵەی لایەنگری ژنان ستراتیژیگەلێکی جیاوازیان گرتنەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانجی سەرەکی خۆیان، واتە مافی دەنگدان. کۆمەڵەی نەتەوەیی پێیوابوو خاڵی سەرەکی بۆ چالاکییەکان دەبێت لە ناوەندو بە مەبەستی بڕیاردان بێت لەسەر چاکسازی فیدرالی و لە ئەنجامدا هەوڵێدەدا ساڵانە مەسەلەی مافی دەنگدانی ژنان لە کۆنگرەدا بخرێتەڕوو. لەبەرامبەردا، کۆمەڵەی ئەمریکی ویلایەتەکانی کردە کایەی سەرەکی چالاکییەکانی خۆیو هەوڵیدا بەگوشار خستنە سەر ئەنجومەنی یاسادانانی ویلایەتی سەرەتا مافی دەنگدان بۆ ژنان لە ویلایەتە جیاوازەکان بە دەست بهێنێت. کۆمەڵەی نەتەوەیی ڕۆژنامەی لیبەرەیشن[١٣١]ی بڵاوکردەوەو کۆمەڵەی ئەمریکی بە هاوکاری ستۆن، بلکڤولو لیڤی مۆر[١٣٢] بڵاوکراوەی "وۆمێنز جۆرنال"[١٣٣]یان هەبوو بۆ بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانیان. دەوروبەری ساڵی ١٨٧٠ ستنتۆنو ئەنتۆنی بڵاوکراوەی حەفتانەی ریڤۆلیۆشن[١٣٤] (شۆڕش)یان بەهاوکاری سەڕافێك بەناوی جۆرج ترین[١٣٥] کە بەخاوەنی بیروباوەڕی دژە ڕەشەکان بەناوبانگ بوو دامەزراند بەو درۆشمەی "پیاوان، مافەکانیانو نەشتێکی زێتر، ژنان، مافەکانیانو نەشتێکی کەمتر "ۆومێنز جۆڕنال" بەسەرنجدان لەوەی لە بزاڤی نەهێشتن نزیك بوو، سەرچاوە داراییەکانی زێتر بوونو ریڤۆلیۆشن تەنیا پشت ئەستوور بوو بە هاوکاری ترین. لە ئەنجامدا، کاتێك ترین هەوڵیدا گۆڤارەکە بگۆڕێت بۆ شوێنێك بۆ خستنەڕووی مەیلەکانی خۆی لە بوارە داراییو ئابوورییەکانو، ڕووبەڕووی دژایەتی ژنان بووەوەو هاوکاری داراییەکانی خۆی





برین، گۆڤارەکە نەیتوانی کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێتو دوو ساڵ دوای دەسپێکردنی کار، لە بڵاوکردنەوە کەوت.

وێڕای ئەوەی خاڵی جەخت کردنەوەی کۆمەڵەی نەتەوەیی، چاکسازیی فیدراڵ بوو بەڵام لەو بارانەدا کە لە ویلایەت باسی مەسەلەی مافی دەنگدان دەکرا، لە ویلایەتەکان پەرەی بەچالاکی خۆی دەدا، بۆ نموونە لە ساڵی ١٨٦٧ لە کینزاسو ساڵی ١٨٧٤ لە میشیگان چالاکی نواند[١٣٦]. ساڵی ١٨٦٨ بەهەوڵی ستنتۆنو ئەنتۆنیو بەهاوکاری یەکێك لە سیناتۆرەکان بەناوی سارجێنت[١٣٧] لە کالیفۆرنیا کە هاوڕێی ئەنتۆنی بوو، چاکسازی دەستوور کە بە "چاکسازی ئەنتۆنی" ناسرا، خرایەڕوو و تا چل ساڵ دواتر- کە بڕیاری لەسەردرا- هیچ گۆڕانکارییەك لە دەستەواژەکانیدا روونەدا. ژنان هەوڵیان دەدا رەزامەندی نوێنەران بە دەست بێننو ساڵی ١٨٨٢ هەردوو ئەنجومەن "کۆمیتەی مافی دەنگدانی ژنان" یان پێکهێناو لە ساڵەکانی ١٨٨٤و ١٨٨٦ "سەنا"ش کۆمیتەی هەڵبژێردراوی بۆ مافی دەنگدانی ژنان پێکهێناو لە دیسامبەری ساڵی ١٨٨٦و دوای ئەوەش چەند جارێك تا ساڵی ١٨٩٦، چاکسازییەکە لە ئەنجومەنو هەروەها لە کۆمیتەکاندا باسکرا.[١٣٨]

سەرەڕای جیاوازی لە ستراتیژەکانی دوو کۆمەڵەکەدا، لە رووی کایەی چالاکیشەوە جیاوازی لە نێوانیاندا هەبوو. کۆمەڵەی نەتەوەیی، مافەکانی ژنانی بە ئامانجێکی فراوان لەقەڵەمدا کە مافی دەنگدان تەنیا بە یەکێك لەو مافانە دەژمێردراو لەبەرامبەردا، کۆمەڵەی ئەمریکی لەو بڕوایەدا بوو کە تاکە ڕێگەی سەرکەوتن، خۆ دوورگرتنە لە مەسەلە ناپەیوەستەکانو چەقبەستنە لەسەر مەسەلەی مافی دەنگدانو دەبێت واز لە خستنەڕووی کێشەگەلێك بهێنرێت کە بزاڤی ژنان لە پشتیوانی چەند بەشێکی کۆمەڵگا بێبەش دەکات و، لە ئەنجامدا ئەم کۆمەڵەیە حەزێکی لە خۆیدا سەبارەت بەکێشەکانی وەك تەڵاق، رەخنەگرتن لە کەنیسە یاخود رێکخستنی ژنانی چینی کرێکار پیشان نەدەدا. لە ڕاستیدا، کۆمەڵەی ئەمریکی بوو بە نوێنەری بەشێکی بزاڤی ژنان کە لەو بڕوایەدا بوون رێکخستنێکی جەماوەری پێگەی دەسەڵاتێکیان



پێدەدات کە لە ڕێگەیەوە دەتوانن بۆ گۆڕان، گوشار پیادەبکەنو واز لە گوزارەگەلێك بهێنن کە بەشێوەیەکی هێزەکی جیاوازی دروست دەکەن وەك تەڵاق، رەخنەگرتن لە هاوسەرێتیو رەتکردنەوەی... بۆ بەرژەوەندی تاکە کێشەی دەنگدان. ئەو بڕوایە هەبوو کە لە کۆمارێکی دیموکراتیدا بەدەستهێنانی مافی دەنگدان، ئەو توانایە بە ژنان دەبەخشێت ژمارەیەکی زۆری کێشەکان چارەسەر بکەن.[١٣٩] لە بەرامبەردا، کۆمەڵەی نەتەوەیی پێیوابوو مافی دەنگدان تەنیا یەکێکە لە خواستەکانی بزاڤ، لەبەر ئەوە لە وتارەکانی ریڤۆلیۆشندا بایەخ بەمەسەلەکانی ژنانی کرێکارو کۆچەر دەدرا نەك ئەوەی تەنیا بەدوای مافی دەنگدان واتە خواستی ژنە خۆشگوزەرانەکانی چینی ناوەڕاستەوە بن.[١٤٠]

لەرووی تەکتیکیشەوە جیاوازی لە نێوان دوو کۆمەڵەکەدا هەبوو. ستۆنو کۆمەڵەی ئەمریکی زێتر سوودیان لەو شێوازانە وەردەگرت کە باو و شیاوی پەسەند کردن بوون، بەڵام ئەنتۆنیو ستنتۆن خاوەنی تەکتیکگەلێکی توند بوون و هەوڵیاندەدا هەموو کێشەیەك بکەن بەکێشەیەکی نەتەوەییو راگەیاندنی.[١٤١]

لەم نێوەدا، سەرەڕای ئەوەی بەرەبەرە هەموو ویلایەتەکان، بەفەرمی دانیان بە مافەکانی ژناندا نا لە بواری خاوەندارێتیو هەندێك حاڵەتی تەڵاق و منداڵ بەخێوکردن- لە هەندێك ویلایەتدا ژنان مافی دەنگدانیشیان بەدەستهێنا. یەکەمین ئەو شوێنانەی مافی دەنگدانیان بە ژنان بەخشی ڤایومینگو یوتا بوون- لەو کاتەدا، ئەم دوو ناوچەیە هێشتا وەك ویلایەت پەلکێشی نێو کۆماری فیدراڵی نەکرابوون. ڤایومینگ ساڵی ١٨٦٩و لە هەلومەرجێکدا کە هێشتا ئەندامی یەکێتی ویلایەتەکان نەبوو، شوێنێك بوو ژمارەی دانیشتوانی کەم و پەراگەندەو بەگشتی مەڕداربوون و بزاڤی ژنانیش تیایدا چالاك نەبوو، مافی دەنگدانی بە ژنان. هۆی سەرەکی لەم نێوەدا بەوە دادەنێن کە ژمارەی ژنان لەم سەرزەمینەدا کەم بوو و لەم ڕێگەیەوە دەکرا ژنەکانی بۆ راکێشن. سەرەڕای ئەوە، لەبەر ئەوەی لەم سەرزەمینەدا ژمارەی قومارچیو فێڵبازان کەم نەبوو، لە ڕێگەی بەخشینی مافی دەنگدان بە ژنە "بەڕێز"ەکان





و"سیپیپێستە دێهاتییەکانی چینی ناوەڕاست" دەکرا هاوسەنگییەك لە بەرژەوەندی چینە "بەڕێز"ەکاندا بەرقەرارکەن. هەڵبەت ئەو کاتەی ژنان هەستیان کرد هەلومەرجەکان بۆ بەدەستهێنانی مافی دەنگدان ئامادەیە خۆیانیش چوونە نێو کارەوە. لە یۆتاش لەبەرئەوەی مۆرمۆنەکان لەبەر فرەژنی رەخنەیان لێدەگیرا، هەوڵدرا لە رێگەی بەخشینی مافی دەنگدان بە ژنان، هەم رەوشی ژنانی ئەو سەرزەمینە بە باشتر لە ویلایەتەکانی دیکە وێنە بکرێتو هەم پێگەی کەنیسەی مۆرمۆن بەپێشاندانی دژایەتی نەکردنی ژنان لەگەڵ ئەو رێورەسمانەی جێگەی بایەخی کەنیسە بوون بەهێز ببێت[١٤٢]. بەرەبەرە لە ماوەی دەیەکانی دواتر کانزاس، میشیگان کلۆرادۆ، نبراسکاو... لەسەر ئاستی ویلایەت مافی دەنگدانیان بە ژنان بەخشی کە کۆی ژمارەیان تاکو ساڵی ١٩١٠ بە ١٧ ویلایەت گەیشت.[١٤٣]

لە دەیەکانی ١٨٧٠و ١٨٨٠ ژنان، بەردەوامیان دەدایە چالاکییەکانیان بۆ بڵاوکردنەوەی گوزارەکانیانو هەروەها گوشار هێنانە سەر کوڕو کۆمەڵە یاسادانەرەکان بۆ پەسەندکردنی مافی دەنگدانو هەندێك کاتیش مافەکانی دیکە. بەڵام بزاڤەکە لەو کاتەدا هێشتا بچووكو پارچە پارچە بوو، هەرچەند چالاکییەکانی تاڕادەیەك فراوان بوون. تا کۆتایی دەیەی ١٨٧٠ زێتر چالاکییەکان ڕەهەندی یاسایی، سیاسیو نمایشی [بە شێوەی خۆپیشاندان]یان هەبوو، بەڵام بەرەبەرە چالاکییەکان زێتر بەلای ڕەهەندە سیاسییەکاندا شکانەوە: کۆمەڵەی نەتەوەیی سەرەڕای بەردەوامیدان بە میراتی سنکافالز لە وتارەکانی ریڤۆلیۆشندا، بە شێوەی دیکەش هەوڵیدەدا ئەم میراتە بەزیندوویی بهێڵێتەوە، لەوانەش تێکدانی کوڕو کۆمەڵە گشتییەکان...تد. لەو کاتەدا، وێڕای ئەوەی هێشتا لایەنگری گشتی لە مافی دەنگدانو بزاڤی ژنان نەدەکرا، بەڵام چیدی وەکو جاران چالاکییەکانی ژنان رووبەڕووی پەرچەکردارە توندو گشتییەکان نەدەبوونەوە، هەندێ لە نوێنەرو سیناتۆرەکان لایەنگیریان لێ دەکردنو لە کۆشکی سپیشدا وتووێژیان لەبارەوە دەکرا.



لە ساڵەکانی ١٨٧١و ١٨٧٢ ڤیکتۆریا وۆدهاڵ[١٤٤] لەو بزاڤەدا بایەخی پەیدا کرد، سەرەڕای ئەوەی پەیوەندیگەلێکی لەگەڵ بزاڤی نێو نەتەوەیی سۆشیالیستی هەبوو[١٤٥]ـ ئەو پەیوەندییەی کە خۆی بۆ کۆمەڵگەی ئەمریکا تا ڕادەیەکی باش تەکاندەربوو- لە گۆڤارەکەیدا لایەنگری لە ئەشقی ئازادیش دەکرد. کاتێك کێشەی مافی دەنگدانی بۆ یەکێك لە کۆمیتەکانی کۆنگرەی ئەمریکا برد و لەوێ بەرگری لە مافی ژن لەو بوارەدا کرد بۆ بە "پاڵەوانی بزاڤی مافەکانی ژنان". لەم هەلومەرجەدا، ستنتۆن (سەرەڕای دژایەتی ئەنتۆنی)، وۆدهال و بەشێك لەو ژنانەی لایەنگری بوون هێنانە ناو رێکخراوی کۆمەڵەی نەتەوەیی بەڵام لایەنگری ئەو لە ئەشقی ئازاد رووبەڕووی پەرچەکردارگەلێکی نێگەتیڤی توند بووەوە و ئەوە ئەنتۆنی بوو کە شێلگیرانە لە بەرامبەر هەوڵی وۆدهاڵ بۆ بەدەستهێنانی رێبەرایەتی کۆمەڵەی نەتەوەیی ڕاوەستا.[١٤٦] لە ئەنجامدا، وۆدهاڵ حزبی خۆی دامەزراندو خۆی بۆ سەرۆك کۆماری کاندید کرد.[١٤٧]

لە نیوەی دەیەی ١٨٨٠ لە هەلومەرجێکدا کە لەلایەکەوە، هەندێك لە ویلایەتەکان مافی دەنگدانیان بە ژنان بەخشی بوو و کۆمەڵەی ئەمریکی تاڕادەیەك بە ئامانجەکانی خۆی گەیشتبوو و لەهەمانکاتدا، پرۆسەی هێواشی بەدەستهێنانی مافی دەنگدان لە ویلایەتەکانی لە رووی ژمارەی پشتیوانانی رووبەڕووی گرفت کردبووەوەو لەلایەکی دیکەوە، کۆمەڵەی نەتەوەییش دوای ئیئتیلافی لەگەڵ ئەو هێزانەی تەوەری سەرەکی خەباتیان لە پێناو مافەکانی ژنان، مەسەلەکانی وەك ئەشقی ئازاد و ئەو بۆچوونانە بوون کە زێدەڕوو و شیاوی پەسەندکردن نەبوون، ئەزموونێکی نەخوازراوی تێپەڕاندبوو و هەروەها ڕووبەڕووی گیروگرفتی داراییش ببووەوە، وا دەردەکەوێت کە بوار بۆ دووبارە یەکگرتنەوەی دوو کۆمەڵەکە رەخسابوو. لەو هەلوومەرجەدا کە بزاڤ لە هەردوو باڵەکەدا زۆر لە لایەنگرانی خۆی لە دەست دابوو، هەموو بزاڤەکە بۆ دە هەزار کەس کەم ببوو و زۆر لە ڕاڤەکان ئەم لاوازییەیان بە ئەنجامی رادیکالیزمی باڵی کۆمەڵەی نەتەوەیی لەقەڵەمدەدا. باڵی رادیکال ناچار بوو بەسەرنجدان لە دژایەتییە توندەکانی لەگەڵ خواستە زیادەڕەوەکانیان، هەڵوێستەکانیان هەموار بکەن؛ و لە ئەنجامدا ساڵی





١٨٩٠ دوو باڵی بزاڤەکە لە ڕێکخراوێکی یەکگرتوودا لە ژێر ناوی "کۆمەڵەی ئەمریکی مافی دەنگدانی ژنان"[١٤٨]- کە دواتر بەناوی کورتکراوەی ناسا دەخوێنینەوە- تێکەڵبوون کە ئامانجە سەرەکییەکەی بە دەستهێنانی مافی دەنگدا بوو، واتە داواکاریەکی سنووردار کە "بەڕێزانە" سەیری دەکرا.

کۆمەڵەی نەتەوەیی ئەمریکی مافی دەنگدانی ژنان یاخود ناسا بەڕێبەرایەتی ستنتۆن‌و ئەنتۆنی تاکو ساڵی ١٩٠٠ بەردەوامی بەچالاکییەکانی دەدا. دوای دەست لەکارکێشانەوەی ئەنتۆنی، کاری چاپمان کات[١٤٩] بۆ بەڕێبەری کۆمەڵە، بەڵام لە ساڵی ١٩٠٤ بەهۆی گوشاری باشوورییەکان‌و ڕۆژئاواییەکان کە پارێزگارتربوون، دەستی لەکارکێشایەوەو ئانا شاو[١٥٠] کە زانا بوو لە بواری ئیلاهیاتدا جێگەی گرتەوە. لە قۆناغی ئەودا دەسەڵاتێکی زێتر بەگروپە ویلایەتیەکان دراو چیدی باس لە گوشار خستنە سەر کۆنگرە نەکرا.[١٥١]

لە دەیەی ١٨٩٠ بەرەبەرە لە تەك بزاڤی ژناندا بزاڤێکی ریفۆرمخواز دروست بوو کە سەرەڕای بایەخدانی ڕێژەیی هەندێ لە مێژوونووسان و ڕاڤەکارانی شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژنان، کاریگەرییەکی زێدە زۆری هەم لەسەر فرەوانبوونی کایەی چالاکییەکان‌و پێگەی بزاڤی ژنان و هەم لەسەر گوتاری هەژموونی بزاڤی ژنان لەم قۆناغەدا هەبوو. ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دەیەی ١٨٩٠ دوو بزاڤی جەماوەری[١٥٢]و پێشکەوتنخوازی بەخۆوە بینین. بزاڤی یەکەم تا ڕادەیەك ئەنجامی نەمانی ژیانی جوتیاران بوو. بەدرێژایی چالاکی بزاڤەکە، ژمارەیەکی زۆری ژنان پەیوەندیان پێوەکرد و ئەم بزاڤە بەدەربڕینی سینکلەر "یەکەمین ژنە دەسەڵاتدارە سیاسەتمەدارەکانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان پەروەردەکردن". بەپێچەوانەی بزاڤی جەماوەری کە نەیتوانی شارەکان بگرێتەوە، سیمای دیاری بزاڤی پێشکەوتنخواز[١٥٣] زۆری ژمارەی پشتیوانەکانی بوو.

یەکەمین دەیەکانی سەدەی بیست، بە گشتی ساڵەکانی گەشەسەندن‌و بوژانەوەی ئابووری بوون. بەڵام داهات بەشێوەیەکی زۆر نادادپەروەرانە دابەش دەکراو ئەو ئەمریکیانەی لەگەڵ گوزارەکانی یەکسانیخوازی "باوکە دامەزرێنەرەکان" نەشونمایان



کردبوو، گەیشتنە ئەو باوەڕەی "ئەمریکای نوێ چاوەڕوانییەکانی باوکە دامەزرێنەرەکان ناهێنێتەدی". هەشتا لە سەدەی دانیشتوان لە هەژاری ڕێژەییدا دەژیان‌و سامان لە دەستی بیست لە سەدای کۆمەڵگەدا بوو. چەند بەشێکی کۆمەڵگە کە هەستیان دەکرد نەتەنیا بێبەشکردنی ئابووری بەڵکو زێتر لەو کەمبوونی پلەوپایە، ئاکامی ماوەی دوای جەنگی ناوخۆ بووە لە هەوڵی دووبارەکردنەوەی سیمبوڵە ئەخلاقییە نەریتییەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکادا بوون. ڕێبەرانی ئەم بزاڤە بەردەوام جەختیان لەسەر "مرۆڤی باش" و "کردەی چاك" دەکردەوە.[١٥٤] لە ئەنجامدا پێشکەوتنخوازان ئەرکی خۆیان بەدووبارەکردنەوەی ئامانجە چاکسازی و ئەخلاقییە نەریتییەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکی لەقەڵەم دەدا. بەبۆچوونی پێشکەوتنخوازان، هۆکارە سیاسییەکان لەبەرامبەر گرفتە نوێیەکانی شارەکان، حکومەتی ئامێرەکانی گەندەڵی سیاسی، ناکۆکییە توندە ئایینی، نەتەوەیی و چینایەتییەکان، ناپسپۆری خۆیان پیشانداو ئێستا پێشکەوتنخوازان دەیانویست لە ڕێگەی کۆمەڵە خۆبەخشەکانەوە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان کار بکەن.[١٥٥]

بزاڤی پێشکەوتنخوازی بەپشتبەستن بەڕیفۆمە کۆمەڵایەتییەکان و سەرنجدان لە ڕەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کە پێش ئەمە لە کایەی "ماڵ"و "فەزای تایبەتی" دا جێگەیان گرتبوو، بەڵام لەگەڵ سەرمایەداری‌و مۆدێرنیتە بۆ کایەی گشتی گوازرابوونەوە.- مەسەلەکانی وەك خوێندن، تەندروستی، پاراستنی ئەخلاقیاتەکان‌و... - بەجۆرێك لە جۆرەکان سنوورەکانی گشتی‌و تایبەتی تێکدەشکاندن‌و ڕێگای خۆشدەکرد بۆ چالاکییەکانی ژنان لەو کایانەدا کە لە کۆنەوە تایبەت بەوان لە قەڵەم دەدران، بەڵام ئێستا لەپانتایی گشتیدا بوون. پێشکەوتنخوازان ئەو گوزارەیەیان بڵاودەکردەوە کە بەهەمان شێوەی کە پێویستە ژنان پاسەوانی ئەخلاقی پیاوان و منداڵان بن لە ماڵدا، دەبێت لە کۆمەڵگەشدا ئەوکارە بکەن[١٥٦]: "شوێنی ژن ماڵە ... بەڵام... ماڵ بریتییە لە کۆمەڵ. شاری پڕ خەڵك خێزانێکە... و ماڵ‌و خێزان





پێویستییەکی زۆریان بەدایك هەیە". بەڵام ئەم ماڵە هێندەی گشت کۆمەڵگە فراوانە، چونکە "هەرشوێنێك ژنو منداڵی لێ بن، ئەوێ ماڵە"[١٥٧]

لەو هەلومەرجەدا کەوا دەردەکەوێت ئەوە پیاوان بوون وەك ڕێبەری کۆمەڵگەی ئەمریکا ئەویان بەرەو نشێوی لەناوچوونی ئەخلاقی ڕێنمایی کردووە، جەخت کردنە سەر "چالاکییە ژنانەییەکان" وەك جێگرەوەیەك بۆ "خراپییەکانی پیاوان" یەکێك بوو لە تەوەرەکانی بزاڤی پێشکەوتنخوازی. لەم ڕەوشەدا بوو ژنان بەو ئەنجامە گەیشتن کە "تەنیا ڕەگەزی ئەوان هەڵگری بنەما پیرۆزە کۆنەکانە"[١٥٨] و نەمانی "چاکییە ژنانەییەکان لە سیاسەتدا" دەبێتە هۆی بەردەوامی گرفتە کۆمەڵایەتییەکان.[١٥٩] بەم شێوەیە، پێشکەوتنخوازی، گۆڕا بۆ ئامرازێك لەپێناو کاریگەربوونی ملیۆنان ژنی چینی ناوەڕاست کە تا ئەوکات بەشدارییەکی وایان لە ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیدا نەبوو و ئێستا لە چوارچێوەی یانەکانی ژناندا چالاك ببوون.

بەبۆچوونی گرایمەز هۆی سەرکەوتنی بزاڤی دەنگدان لەم قۆناغەدا ئەوەبوو کە توانی ئەم مافە بگۆڕێت بۆ بەشێك لە بزاڤی فراوانتری پێشکەوتنخوازیو پشت ببەستێت بە سەرمایەکانی[١٦٠]. لەو هەلومەرجەدا کە بزاڤی ژنان پشتی بە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی سنووردار بەستبوو، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم — ئەوکاتەی بەکردەوە زێتر ببوو بە بزاڤی مافی دەنگدان- فیدراسیۆنی یانەکانی ژنان پشتیوانی لێکردو "بۆ یەکەم جار لە مێژووی بزاڤی ژناندا، پێگەی پشتیوانییەکی فراوانی لە نێو ژنان خۆیاندا بەدەستهێنا"[١٦١].

بەم شێوەیە، ژنان لە دەسپێکی سەدەی بیستدا هاتنە نێو خەباتێکی کۆمەڵایەتییەوە کە پێویستی دەکرد لە ماڵەوە بیانهێنێتە دەرەوەو لە ڕێی ئەم ئەرکەدا بەشێوەیەکی تەواو ژنانەو دایکانە کاریان دەکردو لە ئەنجامدا، تەنانەت پارێزگارانیش نەیاندەتوانی دژایەتی ئامادەبوونی ژنان لە کایەی گشتیدا بکەن.



بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکان کە لە سەرەتادا تاڕادەیەك بزاڤێکی ژنانە بوو، لەنیوەی دەیەی ١٨٧٠ کەم تا زۆر لەگەڵ دروستبوونی یەکێتی مەسیحی ژنانی دژەخواردنەوە ئەلکەحولییەکان[١٦٢] لەلایەن ژنانەوە پاوان کرا. ئەم بزاڤەش سەرەڕای مۆبالیزەو ئامادەسازی سەدان هەزار ژن- بەتایبەتی ژنانی سپیپێستی چینی ناوەڕاست-[١٦٣] و خستنەڕووی دەرفەتێك بۆ ژنان لەپێناو ناسینی تواناکانیان، کاریگەری لەسەر فراوانبوونی پێگەی کۆمەڵایەتی بزاڤی مافی دەنگدانو گوتاری فەرمانڕەوا لەسەری هەبوو، ئەو بەڵگەیەی پەیوەندی لە نێوان بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوەو مافی دەنگدانی ژنان دروست دەکرد ئەوە بوو کە ئەگەر بڕیارە ژنان قەدەغەکردنی خواردنەوەکان بکەنە شتێکی یاسایی دەبێت بەهرەمەندبن لە ئامرازی یاسادانان، واتە مافی دەنگدان و هەڵبژاردن.

زیندووکردنەوەی بزاڤی دژەخواردنەوە ئەلکەحولییەکان کە بە یەکێك لە نیشانەکانی پێکەوەبەستنی ماڵو سیاسەت لەقەڵەم دەدرێت لەساڵی ١٨٧٣و بەهۆی ژنان خۆیان فۆرمۆلیزە بوو. ژنان لە هیلزبۆرو ئوهایۆ ڕۆژی بەر لە کریسمس بڕیاریاندا لە دژی خراپ مەستبوونەکانی پیاوان — کە لە هەموویان زیاتر زیان بە ژن و منداڵەکانیان دەکەوێت- کاربکەن. ئەوان چوونە یەکە یەکەی مەیخانەکان و لەپێش دەرگای مەیخانە ڕێوڕەسمی دوعاکردنیان بەجێ گەیاندو دوعاو نزایان کرد خاوەن مەیخانەکان کاری خۆیان بگۆڕن. بە بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامەکاندا، هەنگاوگەلێکی هاوشێوە سەرانسەری وڵاتیان گرتەوەو کەنیسەش پشتیوانی لێکردن- واتە لە کارێکی ئەخلاقی کە پێویستی بە هاتنەدەر لەماڵەو چوونە ناو کایەی گشتی بوو؛ بە دەربڕینی کەنیسە لەو کاتەدا، "کارێکی ژنانە" بەڵام "بەدڵنیاییەوە، خۆپارێزانەو خاکەڕایانە". ئەوەی بڵاوکراوەکان بە "جەنگی ژنانە" ناویان نا بەداخستنی سێ هەزار مەیخانە کۆتایی هات. ژنان توانیان دەسەڵاتی خۆیان لە مۆبالیزەو گۆڕانی هەلومەرجدا ببینن‌و لە هەمان کاتدا ڕووبەڕووی پەرچەکرداری نێگەتیڤیش نەبنەوە[١٦٤].





بەبۆچوونی فلێکسنەر، یەکێتی مەسیحی لە بنەڕەتدا بۆ لە خۆگرتنی ژنانو دواتر ڕێنماییکردنیان بەرەو خستنەڕووی مافە زێترەکان دامەزرابوو. یەکێتی دوو باڵی هەبوو یەکێکیان رادیکال بەڕێبەرایەتی فرانسیس ویلارد[١٦٥] و ئەویتر پارێزگار بەڕێبەرایەتی ئانی ویتێنمیێر[١٦٦]. ویلارد لە بنەڕەتدا لەگەڵ هاندانی مافەکانی ژنان بۆ بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوەکان هاتبووە ناویەوە. بە سەرکەوتنی باڵی رادیکاڵیو ڕێبەرایەتی ویلارد لەسەر یەکێتی لەساڵی ١٨٧٩، مەسەلەی مافی دەنگدان لە ساڵی ١٨٨٣ گۆڕا بۆ یەکێك لە ئامانجەکانی. کایەی چالاکیو پێگەی کۆمەڵایەتی یەکێتی تاڕادەیەك فراوان بوو و پەیوەندی لەگەڵ کێشەکانی وەك رەوشی ژنانی چینی کرێکار، رەشپێستەکان، دروستکردنی دایانگە، رەوشی زیندانەکان، نەخۆشەکان، مەسەلەکانی تەندروستیو .... هتد. یەکێتی، ژنەکانی بردە نێو جۆرێك لە چالاکییەکان و تەنانەت تاکە رادیکالەکانی بزاڤی ژنانیش هێندە خوویان بە پەنابردنە بەریانەوە نەگرتووە. ئەو ژنانەی لایەنگری یەکێتی بوون لە دەرەوەی مەیخانەکان کۆدەبوونەوەو هەندێجار دەچوونە نێو مەیخانەکانەوەو بە تەورو چەکوچ شوشەکانی مەشروبو پەرداخەکانیان دەشکاندن[١٦٧].

دروشمی ویلارد لە خەباتدا، "لەپێناو خوا وماڵو سەرزەمینی نەتەوەیی" دا بوو کە بۆ هەموویان سەرنج راکێش بوو. بە باسکردنی "بەرگری کردن لەماڵ"[١٦٨] ژنەکانی لە ماڵ هێنانە دەرەوە. بەبۆچوونی ویلارد ماڵ ڕەهەندگەلێکی فراوانی هەبوو و بۆ بەرگریکردن لێی ریفۆرمگەلێکی هەمەلایەنە پێویست بوونو لەوانەش مافی دەنگدان: "ئێمە خوازیاری مافی دەنگدانین بۆ بەرگریکردن لە ماڵ" دروشمی ئەوان بوو. ئەوکاتەی ویلارد کە ئەم بەندەی خستەناو پەیماننامەی دانیشتنی یەکێتی لە شیکاگۆ کە "ئێمە بۆ رۆژێك دوعا دەکەینو چالاکی دەنوێنیین کە دایکانو کچان لە ئەمریکا لە بڕیاردان لەبارەی دەرگای مەیخانە لە تەك خانوویاندا کراوە بێت یان داخراو بەشداری بکەن"، رستەیەك کە لە ڕاستیدا رووی لە مافی دەنگدانی ژنان بوو، بەڵام کەمتر کەسێك دەیتوانی لەم دەستەواژەیەی سەرەوە تێبگات[١٦٩].



بزاڤی قەدەغەکردنی خواردنەوەکان بە یەکەمین بزاڤی جەماوەری ژنان لە ئەمریکا لە قەڵەم دەدرێت. ئەم بزاڤە بۆ زۆر لە ژنانی شارو لادێ سەرنجراکێش بوو و بە دەربڕینی چیل، ژنانی لایەنگری قەدەغەکردنی خواردنەوەکان، بوون بەفاکتەری "پتەوکردنی" بزاڤی ژنان، هەرچەند کە ئەوان زێتر دەیانویست "سوود لە هێزی ژنانە بەکاملترین شێوە لە رۆڵە ژنانەییەکاندا کە پێشتر پەسەند کرابوون وەرگرن"[١٧٠].

ژنانی لایەنگری بزاڤی ژنان کە لە چالاکییە ریفۆرمیەکانیشداـ بە شێوەیەکی سەربەخۆ یاخود لە چوارچێوەی پێشکەوتنخوازیو یەکێتی قەدەغەکردنی خواردنەوەکان یاخود ئەو رێکخراوانەی راستەوخۆ پەیوەندیان بە بزاڤی ژنانەوە هەبوو —ئامادەبوون، چوونە نێو کایەیەکەوە کە پێش ئەو- هەڵبەت دەشێ بەجۆرێك لە جۆرەکان جگە لە ماوەی شەڕی ناوخۆیی- کەمتر بەشدارییان تێداکردبوو. ئەو ژنانەی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی بوون وەك جین ئادەمز[١٧١]، لیلیان والد[١٧٢]، ماری ماکدۆوێل[١٧٣] لەو کەسانە بوون لە گەڕەکە کەلاوەکانی نیویۆرکو شیکاگۆ هەوڵیان دەدا هاوکاری ژنە کرێکارەکان بکەن[١٧٤] ئەوە لە دۆخێکدا بوو کە پێش ئەو پەیوەندی بزاڤی ژنان بە ژنە کۆچەرو کرێکارنەکانەوە تاڕادەیەك بڕابوو. ژنەکانی وەکو ئادەمز پێیانوابوو پێویستە ژنانو پیاوانی چینی خوارەوە پەلکێشی ناو بزاڤی مافی دەنگدانی ژنان بکرێن. ئادەمز لەو بڕوایەدا بوو بەگۆڕانی هەلومەرجی ژینگەیی دەکرێ کەمووکوڕییە شەخسیەکان لەنێوان چینەکانی خوارەوە نەهێڵنو ئەوان چاکساز بکەن[١٧٥]. بەم شێوەیە، جۆرێکی نوێی فیمنیزم سەریهەڵدا کە بە "فیمنیزمی کۆمەڵایەتی"[١٧٦] ناسرا. ئەم گروپەی فیمینیستەکان بەدوای ئەوەوە بوون کە مافو پێداویستییەکانی ژنان ببەستنەوە بەدەروەستبوون بە کۆمەڵەیەکی گشتی لە ریفۆرمە کۆمەڵایەتییەکان - لە ئیدارەی شار، رێکخستنی کاری منداڵان و ژنان، هەنگاونانە تەندروستی و دابینکاریەکان-. ئەوان کۆمەڵیان بە ماڵێك لەقەڵەم دەدا کە ئەو کەسانەی گونجاون بۆ بەڕێوەبردنی تەنیا ژنانن[١٧٧].





لەلایەکی دیکەوە، لە بزاڤی ژناندا گۆڕانکاریگەلێکی دیکەش دروست بوون. سەرەڕای ئەوەی ژینگەکە بۆ چالاکی بزاڤی ژنان بەهۆی هەندێ لە توندڕەوییەکانی بزاڤەکانی ئانارشیستیو سۆشیالیستی- لەوانەش تەقینەوەی بۆمب لە شیکاگۆ لە ساڵی ١٨٨٦- ناگونجاو ببوو، لەگەڵ خانەنشینیو مردنی ئەنتۆنیو ستنتۆن بزاڤەکە تا ڕادەیەکی زۆر لەناوچوو. ئانا شاوی جێگرەوەی ستنتۆن لە ژێر گوشاری لایەنگرەکانی چەقبەستنی چالاکییەکان لە ویلایات، گوشار لەسەر ریفۆرمی فیدراڵ نەماو چالاکییەکان گوێزرانەوە بۆ ئاستە ناوخۆییو ویلایەتییەکان. کاری کات جێگرەوەی شاو وێڕای ئەوەی کەسایەتییەکی چالاکتری هەبوو، بەڵام وابەستەبوو بەشێوازە کۆنەکانەوە[١٧٨].

لە هەمان ماوەدا بەرەبەرە هێزە نوێکان دەچوونە نێو بزاڤەوە کە لە ڕووی تاکتیکییەوەش تاڕادەیەك لەگەڵ ڕێبەرانی پێشووی بزاڤەکە جیاوازیان هەبوو. هریت ستنتۆن بلاچ[١٧٩] کچی ستنتۆن کە لە ئینگلتەراوە هاتبوو، تاڕادەیەك لەژێر کاریگەری بزاڤی ژنان لەو وڵاتەدا لە هەوڵی ئەوەدابوو ژنانی کرێکار بۆ ناو بزاڤی ژنان پەلکێش بکرێن. ئەو بەم مەبەستە "یەکێتی سیاسی ژنان"[١٨٠]ی پێکهێنا. ئەو لەژێر کاریگەری بزاڤی ژنانی ئینگلتەرا، ڕێگەی بەکردە رادیکالەکان دەدا. لە ساڵی ١٩١٠ داوای لە ڕێبەرانی ناسا کرد لە ڕێپێوانێکی گەورەدا کە لە جادەی پێنجی نیویۆرك بەرگوزار دەکرێت، بەشداری بکەن. ئەم هەنگاوە فۆرمۆلیزەبوو و بۆ بەیەکێك لە نەریتە جێگیرەکانی بزاڤی ژنان. سەرەڕای ئەوە، ئەو لە هەمان ساڵدا داواکاری مەسەلەی مافی دەنگدانی ژنانی لە کۆنگرەدا باسکرد کە هەڵبەت لە هەردوو ئەنجوومەنەکەدا دەنگی پێویستی بەدەست نەهێنان، بەڵام لەوەودوا هەموو ساڵێك ئەو مەسەلەیە لە دوو ئەنجومەندا باسکرا[١٨١].

بزاڤی ژنان لەو ساڵانە دوو ڕێبەری رادیکالی دیکەشی پەیداکردن، ئالیس پول[١٨٢] و لوسی بورنس[١٨٣] کە هەردووکیان لە ئینگلتەراو لە بزاڤی ژناندا چالاکییان دەنواند لە گەڕانەوە بۆ ئەمریکا ململانێخوازیو تەکتیکەکانی "ڕاگەیاندنی"[١٨٤] کە لە بزاڤی ژنانی ئینگلتەرادا هەبوون لەگەڵ خۆیدا گواستنەوە ئەمریکا. پۆل بەدەستهێنانی مافی



دەنگدانی کردە ئامانج، ساڵی ١٩١٣ یەکێتی کۆنگرە بۆ بەدەستهێنانی مافی دەنگدانی ژنان[١٨٥] دامەزرا کە لە راستیدا جێگرەوەی لەنێو ڕێکخراوی ناسادا، بەڵام دیسانیش لە ڕووی ڕێکخراوەیی پەیوەندی لەگەڵ ئەم کۆمەڵەیە هەبوو[١٨٦]. یەکێتی دواتر لە ساڵی ١٩١٦ گۆڕا بۆ حزبی نەتەوەیی ژنان[١٨٧]. حزبی ژنان وەکو ئەنتۆنیو ستنتۆن بە دوای ریفۆرمی فیدراڵەوە بوو و گوشاری هاوبەش لەسەر کۆنگرە دووبارە سەریهەڵدا. سەرەڕای ئەوە، لەو ماوەیەدا لەلایەکەوە ئێدی ڕێگە بۆ فراوانبوونی پایەی کۆمەڵایەتیی بزاڤی ژنان خۆش بوو: ململانێخوازی زاڵ لەسەر تەکتیکەکانی ڕێبەرانی نوێ بۆ ژنانی کرێکار کە ململانێخوازییان بە "واقعی ژیان" لە قەڵەم دەدا زۆر سەرنج ڕاکێش بوو.

لەم ساڵانەدا لە ئەنجامی چالاکی بەرفرەوانی ژنان لە ویلایەتەکاندا ژمارەیەکی دیکەی ویلایەتەکانیش مافی دەنگدانیان بە ژنان بەخشی: واشنتۆن لە ساڵی ١٩١٠، کالیفۆرنیا لە ساڵی ١٩١١، ئۆرگان، ئەریزۆناو کانزاس لە ساڵی ١٩١٢، نواداو مۆنتانا لە ساڵی ١٩١٤[١٨٨]- و هەڵبەت لە هەندێ ویلایەتدا وەکو میشیگانو ئۆهایۆ سەرەڕای چالاکی ژنانو ناساندنی بزاڤەکە بەڕای گشتی، مافی دەنگدان بە دەست نەهاتو لە هۆکارەکانی ئەوەش چالاکی دژی بزاڤی خاوەن مەیخانەکانو کارگەکانی بەرهەمهێنانی مەشروباتە ئەلکەحولییەکان لە قەڵەم دەدەن، کە دەترسان مافی دەنگدانی ژنان بە مانای بڕیاردان بێت لەسەر چاکسازی دەستوور لە بارەی قەدەغەکردنی بەکاربردنی ئەم خواردنەوانەو لە ئەنجامدا تەنانەت پەنایان بردە بەر تەزویر لە هەڵبژاردندا.

لەم ساڵانەدا، بەبۆچوونی ڕێبەرانی یەکێتیو دواتر حزبی ژنان ئەوەی بایەخی هەبوو چاکسازی فیدراڵ بوو. پول لە واشنتۆن دی. سی. جێگیربوو و لە دوای ئەوە گوشار لەسەر دەوڵەتو نەك تەنیا لەسەر کۆنگرە رەهەندگەلێکی فرەوانی پەیداکرد. لە دوای ئەوە بزاڤی ژنان سوودی لە هەر ڕێگەیەك وەردەگرت بۆ وروژاندنی رای گشتی و، دروستکردنی حاڵەتی ناچاری لە سیاسەتمەداران[١٨٩].





لە كۆنگرەدا، هەم لە نێو كەمایەتی كۆماریخوازو هەم زۆرینەی دیمۆكراتەكان هەندێكیان ناكۆكو هەندێكیش كۆكو تەبابوون لەگەڵ چاكسازی مافی دەنگدان، بەڵام یەكێتیی و جێگرەوەكەی حزبی ژنان- بەپاشكۆیی لە هەڵوێستی ژنان لە بەریتانیا- حزبی زۆرینەو كەسی سەرۆك كۆماریان بە موقەسیر لەقەڵەمدان. ساڵی ١٩١٧ بزاڤی ژنان لە ئەمریكا لە ژێر كاریگەری بزاڤی دەنگدان لە بەریتانیا بەرەو ململانێیەكی زێتر پەلكێش كراو پەنای دەبردە بەر تەكتیككگەلێكی توندتر[١٩٠].

بە سەرنجدان لەوەی هێزە سیاسییەكان و لەوانەش هێزە كاریگەرەكان لە بزاڤی ژناندا، دەیانزانی سستەمی سیاسی دیمۆكراتی ئەمریكا خاوەنی میكانیزمگەلێكە كە ئەگەری سەركەوتنی بزاڤە كۆمەڵایەتییەكان بەپەلكێش كردنی داواكارییەكانیان بۆناو سستەمەكە — لە كاتی پشت بەستن بە پشتیوانی جێ پەسەندی خەڵكی- دەرەخسێنێت، هەم حزبی ژنانو هەم كۆمەڵەی نەتەوەیی ئەمریكی مافی دەنگدان (ناسا) لەم بارەوە بیروڕایان كوكو تەبابوون كە ڕێگەی گەیشتن بە خواستەكانیان لەوانەش لە بواری مافی دەنگدان، باوەڕپێهێنانی كۆنگرەو سەرۆك كۆمارە بە پەسەندكردنی داواكارییەكانیان. بەڵام دوو بەشی بزاڤی ژنان لەبارەی تەكتیكی پێویست بۆ پەسەندكردنی بۆچوونەكانیان بۆ كۆنگرە جیاوازی بیروڕایان هەبوو. حزبی ژنان پێیوابوو دەبێت لەگەڵ بزاڤە درامیو بەرچاوەكان (خۆپیشاندان، مانگرتن، ڕێپێوانی بەردەوام لە دەوری كۆشكی سپیو...) سەرنجی ڕای گشتی بۆ خۆی ڕاكێشێتو سەرنجی كاربەدەستە حكومییەكان بۆ شێلگیریو بەپەلبوونی خواستەكانی ژنان ڕاكێشێتو بۆ تەركیزكردنی ڕاگەیاندن لەسەر سەندنەوەی متمانەی سیاسەتمەدارە ركابەرەكان، لە ڕێگەی گوشارەوە بگات بەخواستی خۆی. لەبەرامبەریدا، كۆمەڵەی نەتەوەیی ئەمریكی پێیوابوو ڕێگەی گونجاو بۆ بەدەستهێنانی مافی دەنگدان، باوەڕهێنانە بەكۆنگرەو لەویش گرنگتر باوەڕهێنانە بەسەرۆك كۆمار تاكو ئەویش گوشار بهێنێتە سەر كۆنگرە بۆ ئەوەی دەنگ لەسەر چاكسازییەكە بدرێت. لە ئەنجامدا، هەوڵی كۆمەڵە بۆ ئەوە بوو لەلایەنی جیاوازەوە بە شێوەی ئیجابی سەرۆك كۆمار لە "گوتارو بزاڤی دەنگدان"



نزیك بكاتەوە. لە ساڵەكانی ١٩١٣ تاكو ١٩١٩، دوو لقی بزاڤ لە دوو لاوەو بەدوو شێوەی جیاواز (یاسا تەوەرانەو رادیكال) گوشاریان خستە سەر دەوڵەتو توانیان هەم سەرنجی بژارەكانو هەمیش رای گشتی بۆ خۆیان راكێشن.[١٩١]

وێڕای ئەوەی لە ساڵی ١٩١٧ یەكێك لە نوێنەرەكانی كۆنگرە لە ویلایەتێكی باشوور، رایگەیاند بەخشینی مافی دەنگدان بە ژنان "دەبێتە هۆی دابڕانی خێزان وەك یەكەیەكی بونیاتنەری كۆمەڵگا؛ خێزان لەبەریەك دەترازێنێتو ماڵ كە بەردی بناغەی كۆمارە تێكوپێكدەدات"، بەڵام لەو ماوەیەدا ئەم بەڵگانە هێندە بە پەسەند لە قەڵەم نەدەدران[١٩٢] و كەشوهەوای ناو كۆنگرەش گۆڕابوو. لەم كاتەدا، چالاكی ناسا بۆ دروستكردنی لوب لە كۆنگرەدا زێدەبوو. بەوەی گوشارەكان هەمە لایەنە بوون "ویلسۆنیش لایەنگری لە مافی دەنگدان كردو لە دەی كانوونی دووەم ١٩١٨ چاكسازی دەستوور لەبارەی بەخشینی مافی دەنگدانی ژنان لە ئەنجوومەنی نوێنەران دەنگی لەسەردراو وێڕای ئەوەی لە خولی یەكەمدا پرۆژەكە لە سینادا دەنگی نەهێنا، بەڵام دووبارە لەگەڵ دروستبوونی كۆنگرەی نوێ لە ساڵی ١٩١٩، چاكسازی فیدراڵ بە ٣٠٤ دەنگ رەزامەندی بەرامبەر ٩٠ دەنگی دژ لە ئەنجوومەنی نوێنەرانو لە ئەنجومەنی سنادا بە ٥٦ دەنگ رەزامەندی بەرامبەر ٢٥ دەنگ دژ دەنگی لەسەر درا و ویلایەتەكانیش تا ساڵی ١٩٢٠ دەنگیان لەسەردا[١٩٣].

بەم شێوەیە، بەشێكی گرنگ لە مێژووی بزاڤی ژنان كۆتایی پێ هاتو ژنان لە دوای حەفتاو یەك ساڵ چالاكی بەردەوام توانیان بگەن بە یەكێك لە تەوەرەیترین خواستەكانی خۆیان واتە مافی دەنگدان، بەو هیوایەی كە ئەم مافە بتوانێت نە تەنیا زەمینە بۆ پێشكەوتنو ئارامبوونی رەوشی ژنان برەخسێنێت، بەڵكو بەرای هەندێ كەس رێگا بۆ گەیشتن بە یەكسانی لەگەڵ پیاوان لە هەموو كایەكانی ژیاندا بكاتەوەو بە گوتەی هەندێكیش دەبێتە هۆی گۆڕانێكی بنەڕەتی لە هەموو ژیانی كۆمەڵایەتیو سیاسیداو فەرمانڕەوایی بنەما ئەخلاقیو روحییەكان لەسەر پەیوەندی مرۆڤەكان.





## گوتاری چاکسازیو "باشتری" ئەخلاقی ژنان: یەکسانی یان جیاوازی؟

بێتس پێیوایە ئایدۆلۆژیای یەکسانی لەگەڵ پیاوان لە پرۆسەی بەدیهێنانی مافی دەنگدانی ژناندا، بەسەر بزاڤی مافەکانی ژناندا زاڵبوو. بەهاکانی وەك مافی خاوەندارێتی، مافی جیابوونەوە، مافی سەرپەرشتیی منداڵان، دەرفەتە خوێندنیو پیشەییەکان، مافی کارکردنو مافی دەنگدان، هەموویان ئەو بەها، جیاوك و دەرفەتانە بوون کە لە بەردەستی پیاواندا بوونو ژنانیش دەیانویست وەك پیاوان بەدەستیان بێنن، ئەم تێگەیشتنە لەسەر ئەوە وەستابوو کە هەڵوێستی پیاوان لە نرخدانانەکانیانو بەدەستەواژەیەکی دیکە، "رێگەی پیاوانەی کارەکان رێگایەکی دروستە. لە ئەنجامدا فیمنیزمی یەکسانیخوازانە، بەدەربڕینی بێتس، بە شۆڕشێك دانەدەنرا چونکە دواجار پشتیوانی لەوە دەکرد کە دەیسویت رەتی بکاتەوە[١٩٤].

هەڵوێستی یەکسانیخوازانە کە لە قۆناغی یەکەمدا بەسەر ئەم شەپۆلەی بزاڤی ژناندا زاڵبوو، لە قۆناغی دووەمیش بەشێکی بزاڤەکە بەدوای ئەم هەڵوێستەوە بوو، دەتوانین نموونەکانی لە نووسینو وتارەکانو هەروەها لە داواکاری و داخوازییەکانی بزاڤدا ببینین. ڤیکتۆریا وۆدهال ساڵی ١٨٧٠ رێبەرایەتی خۆپیشاندانگەلێکی لە ئەستۆبوو کە دروشمیان: "یەکسانی تەواوی سیاسیو کۆمەڵایەتی بۆ هەردوو رەگەز" بوو[١٩٥].

بەڵام لە هەمان کاتدا، ئەو خاڵەی لە خەباتی ئەم قۆناغەی بزاڤی ژناندا دیارە، جوڵەیە لە "گوتاری یەکسانی"یەوە بەرەو "گوتاری جیاوازی". ژنان لە زۆر هەڵوێستو بەڵگەهێنانەوەکانیاندا بەرەبەرە بەرەو ئەو لایە دەچوون کە ژنان بوونەوەری جیاوازن لە پیاوان، ئەم گۆڕانە هێواشە ـ هەڵبەت لە هەڵوێستی رێبەرانی بزاڤ لە قۆناغی سەرەتاشدا ریشەگەلێکی ئەم هەڵوێستە دەبینرێت- هاوشان بوو لەگەڵ دوو گۆڕانی دیکە. لەلایەکەوە، گوتارە چاکسازییەکانی ئەم ماوەیە لە پشتیوانیکردن لە بزاڤی ژنان پەنایان دەبردە بەر ئەم بەڵگەیەو، هەڵبەت ئەمە دەتوانێت بەیەکێك لە دەستەواژەکان، تاڕادەیەك کاریگەری گوتارە نزیکەکان لەسەر بزاڤی ژنان پیشان بدات، لەلایەکی دیکەوە، لەگەڵ جوڵەی بزاڤ بەرەو دەستنیشانکردنی خواستەکانی لە مافی دەنگداندا



گونجاو بوو. هەندێك وا بەڵگەیان هێنایەوە کە ئەم پێویستیەی بزاڤ بە سنووردارکردنی خواستەکانی بۆ زامنکردنی سەرکەوتنو پەنابردنە بەر گوتاری جیاوازی وەك هۆکارێك بۆ گەیشتن بە ئامانج، بووە هۆی ئەوەی بزاڤ ئەم هەڵوێستە وەرگرێت، بەدەستەواژەیەکی دیکە، بزاڤی ژنان ئەوکاتەی سەرنجیدا خواستو تێگەیشتنە رادیکاڵەکانی لەگەڵ پەرچەکردارگەلێکی توند رووبەڕوو دەبنەوە، هەم داواکارییەکانی سنووردارکردنو هەم بەپەنابردنە بەر گوتارێك کە زێتر دەیتوانی باوەڕ بەرای گشتی بهێنێت سەبارەت بەمافی دەنگدانی ژنان، رووی لەم گوتارە کرد وەك ئامرازێك.

بەڵام وا دەردەکەوێت ئەم تێگەیشتنە ئامرازێکی هێندە دروست نییە. چونکە نەتەنیا هەندێ رەگوریشەی ئەم تێگەیشتنە لە قۆناغی یەکەمی ئەم شەپۆلەی بزاڤیشدا دەبینرێن، بەڵکو لە ساڵەکانی دواتریش زەمینەی درزکەوتنە نێو بزاڤی ژنان دەرەخسێنێت. لەبەرامبەردا، دەشێ ئەو بەڵگەیە بهێنینەوە کە لەگەڵ گەشەکردنی بزاڤی ریفۆرمخوازەکانو ئەو پەیوەندیانەی لەنێوان ئەندامانی ئەم بزاڤانەو بزاڤی ژناندا دروست بوون، هێزە نوێکان لە بزاڤدا گوتار یاخود رەنگە چوارچێوە ژێدەرییەکەیان بۆ بزاڤی ژنان گواستبێتەوەو لەو رووەوە بەرەبەرە، ئەم گوتارە نوێیە کەم تا زۆر لایەنی هەژموونی وەرگرت. ئەم هەژموونەش دەشێ تاڕادەیەك لەو رووەوە بێ گرفت - بەڵام هەڵبەت بەدرێژایی زەمەن- دروست بێت کە لەم ماوەیەدا بزاڤی ژنان لە بنەڕەتدا پشتی بە کارێکی تیۆری فرەوان نەدەبەست. ژنان لەسەر بنچینەی ئەزموونەکانیان تێگەیشتنێکیان لەمەڕ رەوشی خۆیانو پێویستی دروستبوونی گۆڕان تیایدا هەبوو کە لە چوارچێوەی چەند گۆڕانکارییەکدا دەخرایەڕوو؛ بەڵام کارێکی رێکخراوو فراوان بۆ روونکردنەوەی پێگەو هەروەها خواستەکانی ژنان وەك گروپێکی کۆمەڵایەتی ئەنجام نەدرابوو.

رەنگە سەرەڕای ئەم دوو هۆکارە، بتوانین ئاماژە بەم دوو خاڵەش بکەین کە هەڵسوکەوتەکانی پیاوان بەتایبەتی رێبەرانی بزاڤی نەهێشتن کە پشتیوانیان لە ژنان نەکرد، بۆ بەهۆی جۆرێك لە هەستی بەدبینی سەبارەت بەپیاوان کە لەبەرامبەردا،

هەستی باشتربوونی ژنانیان ئیلقادەکرد. هەڵبەت دەبێت سەرنج بدەین بزاڤی ژنان تەنانەت لەو کاتەدا کە تارادەیەك هەژموونی گوتاری جیاوازی پەسەندکربوو و ئەو گوتارەیان هێندە جیاواز لەگەڵ یەکسانی لە دەرفەتەکاندا بۆ ژنانو پیاوانو نەدەبینیو زۆرتر خوازیاری هەندێ جیاوکی تایبەتی بوو بۆ ژنان. ئەو جیاوازیانەی هەندێ جار "باشتری" ژنان پاساوی بۆیان دەهێنایەوەو هەندێجار لەسەر بنچینەی پێشینەیەکی پڕ لە ستەم کە ژنی خستبووە پایەیەکی نزمترەوە پاساو دەدا. یەکێك لە بەڵگەهێنانەوە سەرنج راکێشەکان لەم چوارچێوەیەدا، بەڵگەهێنانەوەی "هەریت بۆرتۆن"[196]ە لەبارەی مافی دەنگدان بۆ ژنان. ئەو گوتی تا ئەو شوێنەی ژنان هاوشێوەی پیاوانن شایستەی هەمان ئەو مافانەن کە پیاوان خاوەنیانن‌و تا ئەو شوێنەی لە پیاوان جیاوازن دەبێت نوێنەری خۆیان بن نەك ئەوەی پیاوان نوێنەرایەتی ئەوان بکەن[197].

دیارترین نوێنەرانی ئەم گوتارە نوێیە ئەو ژنانە بوون کە بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندیان لەگەڵ بزاڤە ریفۆرمخوازەکان هەبوو. فرانسیس ویلارد پێیوابوو "ماڵ" وەك کایەیەك کە هەر لە کۆنەوە لە ژێر دەسەلاتی ژناندا بووە، خاوەنی بەهاگەلێکە کە دەبێت بەسەر هەموو کۆمەڵگادا بگشتێنرێت‌و جۆرێك لە "دایکایەتی گشتی" دروست ببێت، بەڵام چوونە نێو کایەی سیاسەت پێویستییەکی ئەم دایکایەتیە گشتییە بوو. بەڕای ویلارد پێویستی چارەسەرکردنی گرفتەکانو ئەنجامدانی ریفۆرمەکان، بوونی تواناگەلێکی پێویستی سیاسی بوون. ئەو ئامانجی دژەخواردنەوە ئەلکەحولییەکانی بەوە لەقەڵەم دەدا کە "هەموو جیهان وەکو ماڵ لێبکات، ژنان دەچنە نێو حکومەتەوەو خاوێنی دەکەنەوە؛ دەچنە نێو سیاسەتەوەو دەیپالێون ... چونکە ژنان بچنە نێو هەر شوێنێك؛ وەکو ماڵی لێدەکەنو دەچنە هەموو شوێنێك لە سەرتاسەری زەویدا"[198] خاڵی سەرنجراکێش لە بەڵگەهێنانەوەی ویلارددا ئەوەیە کە ئەو وێڕای پەسەندکردنی بەهاکانی کایەی ماڵو رەخنەگرتن لە پەیوەندییە زاڵەکان لەسەر ژیانی گشتی "پیاوانە"دا، شوێنی ژنان لە کایەی گشتیدا دادەنێت، واتە سوود وەردەگرێت لە بەڵگەهێنانەوەیەکی نەریتی کە بریتییە لە جەختکردنەوە لەسەر سروشتی روحیی ژنو



پیسبوونی ژیانی گشتی تاکو بگات بە ئەنجامێکی تەواو پێچەوانەی ئەو ئەنجامەی کە لەبنەڕەتدا پێیدەگەیشت: ژنان دەبێت بچنە نێو کایەی گشتییەوە تاکو هێوری بکەنەوە، کەواتە ژنان دەتوانن لەسەر ئەم بنەمایە داوای دەسەڵاتی سیاسیو ریفۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بکەن.

ئادەمزو جۆلیا وارد هۆ جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە بە "چاکییە ژنانەییەکان" ناودەنران‌و ستایشی خەسڵەتەکانی وەك راستگۆیی، سۆزباویو، هەروەها سەرنجدان لە ڕەفتاری ئەخلاقی وەك تایبەتمەندییە ژنانەییەکان دەکرد. وا بەڵگە دەهێنرایەوە کە ئەگەر ژنان دەسەڵات بگرنەدەست، حکومەتی باشو ئاشتی بەدیاری بۆ هەمووان دێنن. کلێشە ژنانەییەکان یارمەتی بزاڤی مافی دەنگدانیان دەداو لۆجیکی بەشداریکردن لە ژیانی سیاسیدا دەرەخساند. زۆر لە ژنان دەیانویست مافی دەنگدان بە دەست بێنن تاکو لەم رێیەوە ئەنجامدانی ریفۆرمە ژنانەییەکان مومکین بێت.[199]

بەم شێوەیەو بەرەبەرە لە بزاڤدا جەخت دەکرایە سەر رەهەندەکانی دایکایەتی. بەبۆچوونی بۆلا، پێداویستی سەرکەوتنی بزاڤ ئەوە بوو کە لەگەڵ تێڕوانینە زاڵەکان لە بارەی دایکایەتیو رەگەزی ناسك بەجەختکردن لەسەر ڕەهەندی دایکایەتی، داوای گۆڕانگەلێکی رادیکاڵ لە کۆمەڵگاو سیاسەتدا دەکرا. لەسەر بنچینەی ئەم هزرە، لەبەر ئەوەی ژنان وەکو دایك زێتر لە هەمووان لە جەنگدا زیانیان پێدەکەوێت، ئەوا دەبن بە بانگەوازکەری ئاشتیو دۆستایەتی[200].

هەروەها تەنانەت شارلۆت گیلمەن سەرەڕای جەختکردنی لەسەر یەکسانی ژنو پیاو، پێیوابوو بە هاتنی ژنان بۆ ناو کایەی کار- گەرمی و پشتیوانی ماڵیش دەچێتە دەرەوە. لە کتێبی "جیهانی دروستکراوی پیاوان"دا[201]، پیشاندەدات ئەوە پیاوان بوون لە سەرتاسەری مێژوودا گرفتە مرۆییەکانی وەکو جەنگیان هێناوەتە ئاراوە: "ئێمە لە جەنگەکانی پیاوانو ئەو دەردو رەنجانەی بەسەرماندا دەسەپێنن، ماندوو بووینە" دەیگوت "هەموو گرفتە سیاسییەکان تەنیا کاتێك چارەسەر دەبن کە بەهاکانی ژنان

کۆمەڵگا فۆرمۆلیزەبکەن"[٢٠٢]. ماری لیڤەرمۆر[٢٠٣] ساڵی ١٨٩٤، لە کتێبی "لە بارەی کایەو کاریگەری ژنان"[٢٠٤]دا نووسی:

> ژن بەو تێگەیشتنەی من لە بارەیەوە هەمە، وەك نیوەی باشتری مرۆڤایەتی هاوشان بەسروشتێکی جوانترو هەستیارتر لە پیاو و بەرێکخستنێکی پاڵاوتوترو مەعنەویتر- دەبێت پاسەوانی ئەخلاقی گشتی بێت!
>
> دەتوانین ئەمە بە بەشێك لە پەیامی خوایی ئەو لەقەڵەم بدەین.
>
> ئەخلاقی گشتی تاڕادەیەکی زۆر ئەو شتە دەبێت کە ژن دروستی دەکات[٢٠٥].

بەگوتەی ئایلین کرادیتۆر[٢٠٦]، بەڵگەهێنانەوەی رێبەرانی بزاڤی ژنان لە هەڵوێستی "دادپەروەرییەوە" بەرەو هەڵوێستی "پێویستی" پەلکێش دەکرا. پشت بەهاوشێوەیی ژنو پیاو نەدەبەسترا، بەڵکو جەخت لەسەر جیاوازییەکانی ئەو دووانە دەکرایەوە کە شیاوی گۆڕان نەبوونو لەسەر ئەم بنچینەیە پێویستی بوونی هەردووکیان لە کایەی سیاسەتدا ئەنجامگیری دەکرا. بەیەکێك لە دەستەواژەکان "چوارچێوەی ژێدەری رێبەرانی بزاڤیش گۆڕابوو. لە جیاتی خستنەڕووی داواکاریگەلێکی رادیکالی پشت ئەستوور بە یەکسانی، جەخت لەسەر تێگەیشتنە نەریتیترەکانی جیاوازییەکان دەکراو لە مەعنەوییبوون، ئەخلاقیبوون، ناسکیو مرۆڤدۆستی ژنانەوە بەو ئەنجامە دەگەیشت کە ئامادەیی ژنان لە سیاسەتدا، ئاستی ئەخلاقی حکومەت دەباتە سەرەوە. پیاوەکان مادینو بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانیش هزرە ماتریالیستییەکانیان زاڵن، لە کاتێکدا ژنان رێگاگەلێکی جیاوازییان هەیە بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ گرفتەکان. کەواتە ئەم دووە تەواوکەری یەکترن، نە نەگونجاوو نە تەواو یەکسانن. بەبۆچوونی چیف، ئەم گۆڕانە لە هەڵوێستی بزاڤدا هێندە بەرەبەرەو هەستپێنەکراو بوو کە درککردنی بۆ زۆر لە هاوچەرخەکان ئاسان نەبوو[٢٠٧].



لەگەڵ رادیکالیزمو ململانێی زێتر لە بزاڤداو هەروەها ئامادەیی زێتری ژنە کرێکارەکان بەرەبەرە گوتاری سۆشیالیستیش لە بزاڤدا رۆدەچوو. بۆ باسکردن لە رەگوڕیشە هزرییەکانی شەپۆلی یەکەمی فیمنیزم ئاماژە بەهزرە سۆشیالیستییەکانیش دەکرێتو دەگوترێت زێتر لە هزرەکانی مارکس، لە راستیدا ئەوە بیرو هزری سۆشیالیستەکانی وەك سان سیمۆنو فۆریی بوون گوزارەکانی وەك ژیانی هەرەوەزیان فۆرمۆلەکرد. ئەم هێڵە هزرییە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا کاریگەرییەکی وەهای لەسەر بزاڤی ژنان نەبوو، لە سەرەتاکانی سەدەی بیست بەرەبەرە بەنێو گوتاری بزاڤی ژناندا رۆچوو. کێیت ریچاردز[٢٠٨] وتارخوێنو نووسەری سۆشیالیست رایگەیاند کە مافی دەنگدانی بەرامبەر تەنیا "مافێکی رەگەزی" نییە، بەڵکو "مافێکی چینایەتی"یە[٢٠٩]. بەڵام ئەم گوتارە هیچ کاتێك نەیتوانی لەم شەپۆلەی بزاڤی ژناندا ڕەهەندی هەژموونی بەخۆوە بگرێت.

**داواکارییەکانی بزاڤی ژنانو تەوەرە سەرەکییەکانی خەبات**

بەهەمان شێوەی ئاماژەی پێکرا دوای جیابوونەوەی کۆمەڵەی نەتەوەییو کۆمەڵەی ئەمریکی، یەکێك لە جیاوازییەکانی دوو رێکخراوەکەی ژنان لەوەدابوو کە کۆمەڵەی نەتەوەیی بەتایبەتی لە گۆڤاری ریڤۆلیۆشندا بە دوای ئەوەوە بوو نەتەنیا کێشەی مافی دەنگدان بەڵکو لە کێشە جیاوازەکانی ژنان بکۆڵێتەوە، راڤەیان بکاتو رەخنەیان لێ بگرێت. ریڤۆلیۆشن باسی لە یاساکانی تەڵاق دەکرد، لە هەندێ باردا، کەنیسەی پەلکێشی نێو ململانێیەکە دەکردو دەپەرژایە سەر کێشە خێزانییەکان. کۆمەڵەی نەتەوەیی، کێشەی ژنانی بەکێشەی رەگەز[٢١٠] لە قەڵەم دەداو لە هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا بەدوایدا دەگەڕا[٢١١]. لە هەندێ حاڵەتدا، ئەلیزابێت ستنتۆن لە ساڵی ١٨٦٩ لە ریڤۆلیۆشندا نووسی مافی دەنگدان "کێشەیەکی رواڵەتی و لاوەکییە"و تەنیا "بەشێوەیەکی رواڵەتی بە بەرژەوەندییە سیاسییەکانی پیاوان و ژنان دەبەسترێتەوە"[٢١٢]. لە ساڵەکانی دوای وەستانی بڵاوبوونەوەی ریڤۆلیۆشنیش بەشێوەی جیاواز ئەم هەڵوێستانە لە وتاردانەکان، خۆپیشاندان، وتارو کتێبەکانی باڵی رادیکاڵدا دەخرانەڕوو. لە کاتێکدا کۆمەڵەی نەتەوەیی مافی دەنگدانی کردبووە تاکە تەوەری





چالاکی خۆی. لە پرۆسەی بزاڤدا، تێڕوانینی دووەم بەرەبەرە زاڵ دەبوو و لە دەیەی کۆتایی شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژناندا بەکردەوە بۆ بەو تاکە داواکارییەی جەختی لەسەردەکرایەوە. لە خوارەوە ئاماژە دەکرێت بەهەندێ لەو تەوەرانەی جێی بایەخی بزاڤی ژنان بوون کە هەڵبەت هەرچۆنێك بێت بۆ بزاڤ ڕەهەندێکی لاوەکیان هەبوو — یاخود بەلای کەمەوە ڕەهەندێکی لاوەکیان بەخۆوە گرت - و وەك نموونە باس لە تێڕوانینەکانی ڕێبەرو بیرمەندانی بزاڤ لەم بوارانەدا دەکرێت.

***چاکسازی جلو بەرگ:*** دوای شکستی ئەو هەوڵەی بۆ گۆڕان لە شێوازی جلوبەرگی ژنانە لە نیوەی سەدەی نۆزدەیەم درا، چیدی بزاڤی ژنان بە شێوەیەکی بەربلاوو رادیکال بە دوای گۆڕانکارییەکی تەواو لە جۆری جلوبەرگەکانی ژنانەوە نەبوو، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە زەرورەتی ژیانی مۆدێرن بوو کە تاڕادەیەك گۆڕانی پێویست دەکرد. لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٨٨٠ و ١٨٩٠ بزاڤێك بەرەو جلوبەرگە سادەترەکان لە ئارادابوو، زۆر لە قوتابیانو بەڕێوەبەرەکانی قوتابخانەکان بۆ پیشاندانی جیدیەتی کاری خۆیان، خۆیان لە بەکارهێنانی زێڕو خشڵو خۆڕازاندنەوە دوور دەگرت[٢١٣].

***هاوسەرێتی و بونیادی خێزان:*** لە بزاڤی ژناندا هەمیشە مەسەلەی پەیوەندی هاوسەرێتیو دامەزراوەی هاوسەرگیری بەجۆرێك لە جۆرەکان بایەخی پێ دراوە. هەندێ لە ژنان بەتایبەتی لە ئاستی ڕێبەرایەتی بزاڤدا سەبارەت بە هاوسەرێتی رەشبین بوون. سۆزان ئەنتۆنی لەبارەی بەهاوسەرێتییەوە نووسی: "هاوسەرێتی هەمیشە مەسەلەیەکی یەکلایەنە بووە کە بەشێوەیەکی تەواو نایەکسان بەسەر دوو رەگەزدا دەسەپێت. پیاو بەهاوسەرێتی هەموو شاتێك بەدەست دەهێنێتو ژنیش هەموو شتێك لە دەست دەدات، یاسای چەوساندنەوەو فەرمانڕەوایی شەهوەتەکان هی پیاونو ملکەچی تەحەموولکەرانەو خاکەرایانەو گوێڕایەڵی پەتی [وەك شتێکی] گونجاو بە ژن سەیریان دەکرێت"[٢١٤].

ئیما گوڵدمەن لە وتارێکدا بەناوی خۆشەویستیو هاوسەرێتی نووسیویەتی:



هاوسەرێتی لەسەرەتادا رێکخستنێکی ئابوورییە، جۆرە سۆشیال (الضمان)ێکە.جیاوازییەکەی لەگەڵ سۆشیالی تەمەنی ئاسایی تەنیا ئەوەیە کە سۆشیال زێتر پێویستە جێبەجێ بکرێت. داهاتی هاوسەرێتی سەبارەت بەوەبەرهێنانەکان بە شێوەیەکی بەرچاو کەمە. تاکەکەس لە پیادەکردنی گرێبەستێکی سۆشیال دۆلارو سەنت سەرف دەکاتو هەمیشە ئازادە کە لە بەردەوامی پارەدانو وازبهێنێت، بەڵام ئەگەر مافی ژن لە بەرامبەر سۆشیال، مێردێکە، ژن ناوی خۆی، ژیانی تایبەتی خۆی، رێزگرتن لە خۆی، هەموو ژیانی خۆی لەپێناویدا دەبەخشێت... سەرەڕای ئەوەش سۆشیالی هاوسەرێتی وابەستەییەکی ناچاریانەی بەدرێژایی تەمەنی بەدواوەیە[٢١٥].

شارلۆت گیلمەن واتە گەورەترین کۆمەڵناسو ئابووریزانی شەپۆلی یەکەمی فیمینیزم یەکێك بوو لە رەخنەگرانی "ماڵ". ئەو نووسی" ماڵ، کۆنترین دامەزراوەی ئێمەو بە پێویست نزمترینیشیانە ... خواردن، نووستن، هەناسەدان، جل لەبەرکردن، پشوودانو خەریك بوون- ئەمانە چالاکیگەلێکی باشن؛ بەڵام ئایا لە چالاکییەکانی دیکە پیرۆزترن؟"[٢١٦] مارگرێت سینگەر پەیامی خۆی لە خەباتکردن بۆ "کۆنترۆڵی ژنان لەسەر جەستەی خۆیان" لەقەڵەم دەداو لەسەر هەمان بنچینە، رێبەرایەتی بزاڤ کۆنترۆڵی منداڵبوونی لەئەستۆگرت.

هەڵبەت ئەمە هەڵوێستی هەموو ژنە چالاکەکانی نێو بزاڤ نەبوو. زۆریان خۆیان بە بەرگریکەری خێزانو بەهاکانی لەقەڵەم دەدا. ئەم تێڕوانینە بەتایبەتی لەگەڵ گەشەکردنی بزاڤی پێشکەوتنخوازیو قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکان لە بزاڤدا زاڵبوو. سەرەڕای ئەوە، پەرچەکرداره نێگەتیڤەکان لە بەرامبەر گوزارەکانی وەك عەشقی ئازادو رەتکردنەوەی هاوسەرێتی روونیان کردەوە کە ئەگەر بزاڤی ژنان بیەوێت جەخت لەسەر گۆڕانی بنەڕەتی لە ستراکتووری خێزانو هاوسەرێتیدا بکات، سەرناکەوێت[٢١٧].





***ڕاڤەی نوێی ئایین:*** هەوڵەکانی ژنان بۆ گەیشتن بە پلەی قەشایەتی یەکێك بوو لەو تەوەرانەی بزاڤی ژنان لە قۆناغی یەکەمدا بایەخی پێدەدا، لە هەندێك لە کەنیسەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا. لەهەمان کاتدا، هەندێك لە ڕێبەرانی بزاڤ وەکو خۆی بەدوای بلاوکردنەوەیاندابوون لە هەموو کەنیسەکاندا. ستنتۆن پێیوابوو دەبێت ژنان "شەریکی یەکسانو پشت بەستووبن بەخۆیان بۆ پیاوان لە ... کەنیسەدا". لە بەردەوامی هەوڵەکان بۆ ڕاڤەی نوێی مەسیحییەت، لە دەیەی ١٨٩٠ ئینجیلی ژنان نووسرا کە هەڵبەت ڕووبەڕووی پەرچەکردارگەلێکی توندبووەوە بەجۆرێك کە ناسا بە شێوەیەکی فەرمی خۆی لێ بێبەری کرد[٢١٨].

***داواکاری خزمەتگوزارییە کاتکوشتنیەکان:*** هەندێك لە ڕێبەرانی بزاڤی ژنان لەم ماوەیەدا پێیانوابوو دەبێت ژنان لە ئیمکانیاتی کاتکوشتنی پێویست بۆ کارکردن لە دەرەوەی ماڵ سودمەند بن. هەندێکیان زێتر دەوڵەتیان بە بەرپرسی ئامادەکردنی ئەو توانایانە لەقەڵەم دەداو هەندێکی دیکە پێیانوابوو زێتر لە ڕێی بەشداری ژنان خۆیانەوە دەکرێ ئەم داواکاریانەی کۆمەڵگا بێنەدی. شارلۆت گیلمەن سۆشیالیستی نامارکسی لایەنگری بەکۆمەڵایەتیبوونی کارەکانی ماڵ، خاوێنی پیشەیی ماڵەکان، مۆبەقو سالۆنەکانی خواردنی گشتی و، داینگەی منداڵ بوو. مێلوسینا فەی پیری[٢١٩] بەتەمای دروستکردنی شوێنی هەرەوەزی بوو و لەم هەرەوەزیانەدا ئیمکانیاتە بەکۆمەڵەکانی بۆ ئەنجامدانی کارەکانی ماڵەوەو منداڵ بەخێوکردن داین کردن."ماری ستەڤێنس هۆلاند[٢٢٠]" یش لە بیری گۆڕینی فیزیکی سیمبولەکانی ڕێکخستنی ژیانی ماڵەوەدا بوو تاکو لەم ڕێیەوە ئەگەری ئەوە بێتە ئاراوە کە کارەکانی ماڵەوەو چاودێریکردنی منداڵانو چالاکییەکانی دیکەی ماڵەوە بەشێوەیەکی بە کۆمەڵ فۆرمۆڵەبن[٢٢١].

***یەکسانی ئابووری:*** گیلمەن پێیوابوو ڕەگوڕیشەی هەموو نایەکسانییەکان لەو ڕۆڵانەدایە کە پشت ئەستوورن بەڕەگەز. لە ئەنجامدا بەبڕوای ئەو تاکە ڕێگەیەك کە ژنان دەتوانن بەهۆیەوە یەکسانی لەگەڵ پیاواندا بەدەست بهێنن، گەیشتنە بە یەکسانی ئابووری. بەبۆچوونی ئەو ماڵ زیندانێکە ژن دەبەستێتەوەو ناچاری دەکات ڕۆڵی بەکارهێنەرێك



بگێڕێت، چونکە ئەوە وابەستەیی ئابووری ژنە بەپیاوەوە قەیدو زنجیرەکەی دروست دەکات، ئازادی تەنیا کاتێك بە دەست دێت کە هاوسەرو کچەکان بچنە نێو جیهانی دەرەوەو بتوانن خۆیان لەڕووی ئابوورییەوە زامن بکەنو ئەو هێزە سەرەکییەی ئەوانی بەستووەتەوە لەناو بەرن. بەبۆچوونی ئەو کار "پرۆسەی سەرەکی ژیانی مرۆیی"یەو تا ئەوکاتەی ژنان بەشێوەیەکی یەکسان لەگەڵ پیاوان نەچنە نێو ئەو پرۆسەیەوە لەڕووی زەینیو تێڕوانینەوە بەسنووورداری دەمێننەوە[٢٢٢].

بەبۆچوونی ئەنتۆنی لە کۆمەڵگەی ئەمریکادا جیاوازی بەرچاوی نێوان حەقدەستی ژنانو پیاوان، پیشاندەدات کەوا "ڕەگەز بە تەنیا مەسەلەکە دەستنیشان دەکات." لە هەمان کاتدا، ئەو لەو بڕوایەدابوو "بۆ ئەوەی ژنان بگەن بە پلەو پایەیەك کە هێندەی پیاوان کۆنترۆڵی کاری خۆیان بکەن، دەبێت لە مافی دەنگدان سوودمەندبن"[٢٢٣].

بە دروستکردنی پەیوەندییە ئورگانییەکان لە نێوان بزاڤی ژنانو ژنە چالاکەکان لە بزاڤی کرێکاراندا، هەندێ لە ژنە کرێکارەکان پێیانوابوو مافی دەنگدان بەمانای یەکسانی بەدەستهێنانی یەکسانییە لە کایەی کاریشدا. مارگرێت درێیەر ڕۆبینز[٢٢٤] ساڵی ١٩١٧ ڕایگەیاند:

> ئەم زەمەنە بۆ دیموکراسیو کرێکاران زەمەنێکی سەیرە. ئەمە کاژێری ژنانە لە مێژووی جیهاندا .. دواجار دوای سەدەگەلێکی بێتواناییو جیاکاری، ئێستا ژنان لەسەر بنەمایەکی یەکسان لەگەڵ پیاوان دەچنە نێو هێزی کارو ڤیستەڤاڵی ژیان[٢٢٥].

ژنەکانی وەك ئالا ریڤە بلۆر[٢٢٦] کە میانگیریان لە نێوان بزاڤی ژنانو بزاڤی کرێکاریدا دەکرد، لەو بڕوایەدا بوون مافی دەنگدان تەنیا "مۆدێکی فیمینیستی" نییە، بەڵکو هۆکارێکە بۆ خەباتکردن لەدژی نایەکسانیو نادادپەروەری ئابووری.

***تاکگەرایی:*** ئەلیزابێت ستنتۆن لەوتارەکەیدا لە بەرامبەر کۆمیتەی قەزایی ئەنجومەنی نوێنەران لە ساڵی ١٨٩٢ جەختی لەسەر ئەو مەسەلەیە کردەوە کە نابێت تەنیا وەك





"دایك، هاوسەر، خوشكو كچ" سەرنج لە ژنان بدرێتەوە. ئەوەی ژنان دەیانەوێت ئەوەیە كە "وەك هاوڵاتی، وەك ژن" سەیریان بكرێت[٢٢٧]. ئیما گۆڵدمەن، ئانارشسیتی ناسراو بە "ئێمای سوور[٢٢٨]" لەو بڕوایەدا بوو فیمینیستە فەرمانڕەواكان لەسەر بزاڤی ژنان بەدوای ئامانجگەلێكی سنووردارەوەن. ئەو بەدوای "رزگاری تەواو"ەوە بوو، واتە ئەو شتەی بتوانێت بۆ ژنان ئەگەری ئەوە بڕەخسێنێت بگەن بە "مرۆڤایەتی تەواو"؛ واتە هەموو خواستو هیواكانیان بواری دەركەوتنیان هەبێتو هەموو رێگرە دەستكردەكان لەسەر ئەم رێیە تێكبشكێنرێن. لە ئەنجامی ئەوەدا خوازیاری تێكشكاندنی هەموو "زۆردارە ناوخۆییەكان" واتە دابونەریتە هەییەكان بوو، لەو بڕوایەدا بوو ژنی رزگاربوو دەبێت وەك "كەسایەتییەك نەك كالاَیەكی سێكسی" جەخت لەسەر خۆی بكاتەوە. گۆڵدمەن دەیویست پەیوەندی لە نێوان تاكو كۆمەڵگادا دروست بكات: "ئەوەی مرۆڤ چۆن بۆ خۆی گەرموگوڕ بێت لە هەمان كاتیشدا لەگەڵ ئەوانیتر یەك بێت، هەستێكی قووڵی لەگەڵ مرۆڤەكانی دیكە هەبێتو لە هەمان كاتدا، تایبەتمەندییە تاكەكەسییەكانی خۆی هەبێت" (تەئكیدەكە لە نووسەرەوەیە).[٢٢٩]

*مافی دەنگدان:* بێگومان گرنگترین داواكاری بزاڤ لەم قۆناغەدا بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بوو. بەهەمان شێوەی گوترا، كۆمەڵەی ئەمریكی لەسەرەتادا تەنیا بەدوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدانەوە بوو. تاڕادەیەك دوای وەستانی بڵاوبوونەوەی ریڤۆلیۆشن، كۆمەڵەی نەتەوەییش خۆی بەلای مافی دەنگداندا شكاندبووەوە بەشێوەیەكی تایبەتی بەلایەنگری لە وۆدهال لەگەڵ پەرچەكردارە توندەكانی رای گشتی رووبەڕوو بوو، تێگەیشت ناتوانێت هەم بەدوای مافی دەنگدانەوە بێتو هەم درێژە بەخواستە رادیكالەكانی خۆی بدات. لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستدا، چەند هێزێك هاتنە نێو بزاڤەوە كە مافی دەنگدانیان كردە تاكە تەوەری خەباتی خۆیانو بێ دوودڵی توانیان بزاڤی ژنان بگۆڕن بۆ بزاڤی مافی دەنگدانی ژنان. لە ئەنجامدا لە ماوەی دەیەی دوایی خەبات لەم شەپۆلەی فیمینیزمدا، چیدی شتێك نییە بەناوی بزاڤی سەرتاپاگیری ژنانو هەرچی هەیە جەخت كردنە لەسەر مافی دەنگدان. لەم چوارچێوەیەدا دەبێت ئەوەش زیاد



بكەین كەوا دێتە بەرچاو بەلای كەمەوە هەندێك لە ڕێبەرانی بزاڤ لەم قۆناغەدا بەدەستهێنانی هەموو خواستەكانی بزاڤیان پەیوەست بە بەدیهاتنی مافی دەنگدان لەقەڵەم دەدا. لە ئەنجامدا تەنیا بەشێوەیەكی بەرەبەرە چاویان لە خواستەكانی دیكەی بزاڤ پۆشی. بەڵام گۆڕینەوەی بزاڤ بەراپەڕینێك كە تاكە ئامانجێكی هەبێت[٢٣٠] هەڵبەت ئاكامگەلێكی تایبەتی خۆشی هەیە كە لە بەشی دووەمدا ئاماژەیان پێدەكرێت.

**رێكسختن و ئامرازەكانی خەبات**

لە دەیەكانی نێوان كۆتایی شەڕی ناوخۆییو شەڕی یەكەمی جیهانی، بزاڤی ژنان ئەزموونێكی رێكخراوەیی تاڕادەیەك فرەوانی هەبوو. لەلایەكەوە، رێكخراوگەلێكی تایبەتی بۆ بەرەوپێشبردنی ئامانجی سەرەكیو دیاری بزاڤ لەم قۆناغەدا واتە گەیشتن بە مافی دەنگدانیان پێكهێنانو لەلایەكی دیكەوە، ژنانی لایەنگری بزاڤی ژنان لە دروستكردنو رێبەرایەتی رێكخراوە تایبەتە پیشەیی، ئێتنی، نەژادیو، ریفۆرمەكاندا چالاك بوون. لێرەدا بەكورتی ئاماژە بەرێكخراوە سەرەكییە چالاكەكانی ژنان لەم ماوەیەداو ئەو گۆڕانانەی لە سەرەكیترین رێكخراوەكاندا روویاندا، دەكرێت.

دوو هێزی رێكخراوەیی سەرەكی لە مافی دەنگداندا تا بەر لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستەم، كۆمەڵەی نەتەوەیی مافی دەنگدانی ژنانو كۆمەڵەی ئەمریكی مافی دەنگدانی ژنان بوون كە لە ساڵی ١٨٩٠ یەكیان گرتو كۆمەڵەی نەتەوەیی ئەمریكی مافی دەنگدانی ژنان (ناسا)یان پێكهێنا. كۆمەڵە سەرەڕای ناوەندەكانی لە واشنتۆن، لە ویلایەتەكانیش هۆبەی ناوخۆییو ویلایەتی هەبوو.

كاری كات رێبەری ناسا لە ماوەی ساڵەكانی ١٩٠٧ و ١٩٠٨ بۆ دروستكردنی هەماهەنگی نێوان گروپەكانی لە نیویۆرك شورای نێو شاریان پێكهێنا. كات لەساڵی ١٩١١ بڕیاریدا چالاكی ناسا لە نیویۆرك بەهێز ببێت. لە ئەنجامدا شواری نێو شاری گۆڕا بۆ پێگەیەك لە پێناو دامەزراندنی "حزبی مافی دەنگدانی ژنان".[٢٣١] لەگەڵ چالاكییە فرەوانەكانی حزب بە شێوەی بڵاوبوونەوەی "چەندین هەزار كیلۆ" سیپارەو





هەواڵنامەی بەلاش، لە هەموو شوێنێکی نیویۆرکدا مەسەلەی مافی دەنگدانی ژنان گۆڕا بۆ بابەتێکی گرنگ[٢٣٢].

هریت بلاچ لە ساڵی ١٩٠٧ "یەکێتی سیاسی ژنان"[٢٣٣]ی دامەزراند بەو ئامانجەی ئەو ژنانەی کاردەکەن لەوانەش پیشەییەکانو کرێکارانی پیشەسازی بگرێتە خۆی. سەرەڕای ئەوە، لە ساڵی ١٩٠٧ بە مەبەستی دروستکردنی پەیوەندی ئۆرگانیکی لە نێوان بزاڤی ژنانو بزاڤی کرێکاران "لیگی یەکسانی ژنانی پارێزەری خۆیان"[٢٣٤] پێکهێنا کە لە ماوەی ساڵو نیوێکدا ژمارەی ئەندامەکانی لە ٢٠٠٠ کەسەوە بە ٢٠ هەزار کەس گەیشتو ئەو ژنانەی لەخۆدەگرت کە کاریان لە پیشەسازی و هەروەها خزمەتگوزارییەکانی وەك مامۆستایەتیدا دەکرد[٢٣٥].

لەساڵی ١٩١٠ بەپشتیوانی ئادەمز، ئالیس پول بەسەرۆكو لۆسی بێرنز بە جێگری سەرۆکی کۆمیتەی کۆنگرە لە ناسا هەڵبژێردران. لە ساڵی ١٩١٣ یەکێتی کۆنگرە جێگەی کۆمیتەی کۆنگرەی گرتەوە کە سەرەتا بەشێك بوو لە ناسا، بەڵام دوای ئەوە جیابووەوە. تاکە ئامانجی یەکێتی بەدەستهێنانی مافی دەنگدان لەگەڵ چاکسازی فیدراڵی بوو.

لە ساڵی ١٩١٦ ئەو کاتەی پول سەرنجیدا گوشار خستنەسەر حزبی دیموکرات بۆ پەسەندکردنی مافی دەنگدان بە هیچ شوێنێك ناگات، بڕیاریدا بەپشت بەستن بەو ژنانەی مافی دەنگدانیان هەبوو- لە ویلایەتەکان-"حزبی نەتەوەیی ژنان"[٢٣٦] دامەزرێنێت. تاکە ئامانجی حزب چاکسازی مافی دەنگدان راگەیێندرا[٢٣٧].

بەڵام رێکخراوە کاریگەرەکان لە بزاڤدا سنووردارنەبوون بەو رێکخراوانەی بە مەبەستی مافی دەنگدان دادەمەزران. لە ساڵەکانی ١٨٨٠ وە بەرەبەرە ژنە رەشپێستەکان بەتایبەتی لە چوارچێوەی کەنیسەی باپتیستدا دەستیان بە رێکخستنی خۆیان کردبوو و ماوەیەك دواتریش کۆبوونەوەی نەتەوەیی ژنانیان وەك بەشێکی کۆبوونەوەی نەتەوەیی باپتیستەکان پێکهێناو لەگەڵ ژنانی نەژادەکانی دیکە هاوبەستەییان راگەیاند[٢٣٨].



بەدەر لە چوارچێوەی کەنیسەش ژنە رەشپێستەکان لە بۆستۆن کۆبوونەوەی "فیدراسیۆنی نەتەوەیی ژنە ئەمریکییە بەرەگەز ئەفریقیەکان" یان گرێدا کە دواتر لەگەڵ لیگی ژنە رەشپێستەکان یەکی گرتو "کۆمەڵەی نەتەوەیی ژنە رەنگینپێستەکان"[٢٣٩] یان دامەزراند[٢٤٠].

بزاڤە ریفۆرمخوازەکان وەك پێشکەوتنخوازیو قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکان ژنەکانیان هێنایە نێو کایەیەکی چالاکەوە کە پێویستی کرد پەیوەندی لەگەڵ چەند بەشێکی فراوانی کۆمەڵگا بەرقەرار بکەن. زۆر لە ژنە لایەنگرەکانی بزاڤی ژنان ئامادەییان لەم چالاکییە ریفۆرمخوازانەدا هەبوو و لە ئەنجامدا توانیان لە نێوان بزاڤێك کە بە گشتی لە ژێر نفووزی ژنە سپیپێستەکانی چینی ناوەڕاست دابوو و ژنە کۆچەر، رەنگینپێستو کرێکارەکاندا پەیوەندی دروست بکەن.

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم پەیوەندییەکانی نێوان بزاڤی ژنانو بزاڤی کرێکاران زێتر لە جاران بەهێزبوون. ژنە خەباتکارەکان لە نێو کرێکارەکاندا سەبارەت بە بزاڤی ژنان هێندە گەشبین نەبوون و هێندەش لەگەڵ ئەم "خاتوونانە" هاودڵیان نەدەنواند. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کێشەی گرنگو بە پەلە بۆ ژنە کرێکارەکان مافی دەنگدان نییە، بەڵکو چەند ریفۆرمێکن لە بوارەکانی رەوشی پیشەییو حەقدەستو ... هتد. دایکە جۆنز[٢٤١] یەکێك بوو لە رێبەرانی ژنە کرێکارەکان کە جەختی دەکردەوە دادپەروەریی ئابووری بەبەراورد لەگەڵ دەنگدان ئەولەویەتی هەیەو ژنە چالاکەکان لە بزاڤی ژناندا دەبێت واز لە "خووی خاتوونانە"[٢٤٢]ی خۆیان بهێنن. بەلام ژنە چالاکەکان لە بزاڤی ژناندا توانیان بەرەبەرە بچنە نێو سەندیکاکان و ژنە کرێکارەکان. ئادەمز، والد و ماری ریتەر بێرد[٢٤٣] دەچوونە کارگەگان بۆ دیتنی ژنانو بەدیتنەوەی رێبەرەکانی ژنە کرێکارەکان ئەوانیان فێردەکردن رێکخستنێکی زێتریان هەبێتو "کەمتر نەفرەت بکەن". لەو نێوەدا توانیان هەندێ لە رێبەرانی ژنە کرێکارەکان بکەن بەلایەنگری خۆیان. لەو ژنانەش دەتوانین ئاماژە بە لیۆنۆرا ئۆرایلی[٢٤٤] بکەین کە وەك میانگیرێکی نێوان بزاڤی ژنانو ژنە کرێکارەکان کاری دەکردو دەیتوانی بەزمانی

کرێکارەکان قسەیان لەگەڵدا بکاتو دواجار باشتر بڕوایان پێ بهێنێت[٢٤٥]. بەهۆی چالاکییەکانی بلاچو ئۆرایلییەوە بوو کە زۆر لە ژنە کرێکارەکان بوونە لایەنگری بزاڤی ژنان.

بەم شێوەیە، لە قۆناغی دووەمی شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژناندا بوو چالاکی ڕێکخراو هاوشان لەگەڵ دروستکردنی تۆڕەکانی پەیوەندی لە نێوان بزاڤ و لەگەڵ بزاڤەکانی دیکەدا بوو بەیەکێك لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی بزاڤ کە لە سەرکەوتنیدا لە بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بەدڵنیاییەوە کاریگەرییەکی دیاریکەری هەبوو.

لەو ساڵانەدا کە بزاڤی ژنان بەهرەمەند بوو لە توانا زێترەکان بۆ بڵاوکردنەوەی تێڕوانینو خوستەکانی خۆی لە ڕێگەی چاپەمەنیو بڵاوکراوەکان، ئەم هۆکارانەی راگەیاندن گرنگترین ئامرازی گواستنەوەی تێڕوانینەکانیان بوونو بزاڤ سوودی لە وتاردان، نامەنووسی، بڵاوکردنەوەی جارنامە، چاپکردنی هەواڵەکان ... بۆ مۆبالیزەکردنە ماوەماوەییەکان وەردەگرت. لە پرۆسەی بزاڤ و بەرادیکاڵتربوونی تەکتیکەکانی، زێتر لە هەرشتێك سود لە خۆپیشاندان، ڕێپێوان، جۆرەکانی کردە وروژێنەرو بەرچاوەکان وەردەگرت کە لە توانایاندا بوو بۆ بزاڤ هەواڵەکە باشتر بڵاوبکەنەوەو سەرنجی رای گشتی بۆ خۆیان راکێشن. هەروەها هەنگاوەکانی وەك بە لۆبکردنی کاربەدەستەکان لە کۆنگرە، کاریگەری خستنە سەر سیاسەتمەداران، ئامادەیی لە کۆمیتە جیاوازەکان لە کۆنگرەدا بەردەوام بوو.

ئەوەی دوای وەستانی ریڤۆلیۆشن، زێتر لە هەرشتێك یارمەتی ئەنتۆنیدا ئەوە بوو کە گەشەکردنی خێرای پەیوەندییەکان و تورەیی سەرهەڵدراو لەو گوزارانەی لەگەڵ شەڕی ناوخۆ خرابوونە ڕوو، بەپێویستییەکی تاڕادەیەك گشتی بۆ زانیارییەکان تەواوبوو و ئەنتۆنی- بەدرێژایی ساڵ- وستنتۆن- هەشت مانگ- لەمیانەی سەفەرە خولییەکان وتاریان دەدا. دەگوترێت سۆزان ئەنتۆنی لەماوەی ساڵێکدا ١٧١ وتاری دانو سەدان وتووێژی نافەرمی ئەنجامدان. بوونی پەیوەندییە ئاسانترەکان لە ڕێگەی هێڵی ئاسنەوە ئەو ئەگەرەی بۆ ئەنتۆنی دەرەخساند لە سەفەرە پروپاگەندەییەکەیدا بە شەمەندەفەر لە



هەر ئێستگەیەك دە دەقیقە بوەستێت و بە وتارێکی دە دەقیقەیی گوێگرەکانی بەبزاڤی ژنانو مەسەلەی مافی دەنگدان ئاشنا بکات. لەم هەنگاوانەدا، تاڕادەیەك ڕۆژنامەکانیش هەواڵەکانی بزاڤی ژنانیان بڵاودەکردنەوە. وێڕای ئەوەی زۆر کەس حەزیان لە ئەنتۆنی نەبوو، بەڵام ستایشی کەسایەتی بەهێز، راشکاوەیی گوتەکانیو ئازایەتییەکەیان دەکرد.[٢٤٦]

لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدە، کۆبوونەوەکانی ساڵانەی ژنانو کۆمەڵەکانیان بەردەوام بوونو تا ئەو کاتەی ئەنتۆنی لە بزاڤدا چالاك بوو، هاوکات لەگەڵ ئەم کۆبوونەوانە لە کۆنگرەشدا فۆرمۆلە دەبوو. هەوڵدان بۆ گەیشتن بە مافی دەنگدان لە ڕێگەی داواکردن لە ژێدەرە یاساییەکان بە شێوەی جۆراوجۆر شێوەی وەردەگرت، بەڵام دادگاکان و دیوانی باڵای ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوەیان رەتکردەوە بەوەی مافی هاووڵاتیبوون پێویستی بەمافی دەنگدان نییە.

ستنتۆن هەروەکو خۆی چەندین جار بۆ بڕواهێنان بە نوێنەرانی کۆنگرە بۆ مافی دەنگدانی ژنان دەچووە کۆمیتەکانی کۆنگرەو لە دانیشتنەکانی گوێگرتنی[٢٤٧] کۆمیتەکانی یاسادانان یاخود هەڵبژاردنەکان بەشداری دەکرد. بەرەبەرەو بەدووبارەبوونەوەی داواکارییەکانی ژنان لە بواری مافی دەنگدانو جەخت کردنەوەی بزاڤ لەسەری و ئامادەبوونی بەردەوام لە کۆڕوکۆمەڵەکانی یاسادانان لە دەیەی ١٨٨٠- واتە ئەوکاتەی ئەنتۆنی دەقی پێشنیارکراوی بۆ ریفۆرمی فیدراڵ ئامادەکرد- مافی دەنگدانی ژنان لە حاڵەتی تابۆ (حرام) دەرچوو و وەك پێشنیارێکی زانستی سەیریان دەکرد.[٢٤٨]

تاکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بزاڤی ژنان تەنیا لە ڕێگەی شێوازە ئارامەکانو هاوشان بەپایەداری و بەردەوامی وەك ئامادەکردنو ناردنی داواکاری، بڵاوکردنەوەی کوراس، وتارخوێندنو داواکردنی مافی دەنگدان بەشێوەیەکی خۆپارێزانە بوو. بەلەناوچوونی ڕێژەیی لە ڕێبەرایەتی بزاڤی ژناندا و ناهاوکاربوونی کەشی گشتی بۆ چالاکی ژنان، پراگماتیستەکانی بزاڤ زێتر بەرەو "خوێندنی گشتی" دەچوونە پێش. لەم





ماوەیەدا دەبوو ڕێکخستنیش لە خزمەتی خوێندندا بێت و دروشمی زاڵ ئەمەبوو: "خۆتان ڕێکخەن، خۆتان ڕێکخەن بە مەبەستی فێربوون، فێربوون، فێربوونی ڕای گشتی." بەڵام خوێندنی گشتی بە ئەرکێکی دوورو درێژو بێ کۆتایی دێتە بەرچاو.[٢٤٩]

بەبۆچوونی میللەت، بێ بەرهەمی روونو دیاری " تەحەموولی هاوکات بە ئارامی" لە سەرەتاکانی سەدەی بیست دیارکەوت. هەست دەکرا میکانیزمگەلێکی "دراماتیکیتر" پێویستن. لە ئەنجامدا خۆپیشاندان، پۆل پۆل ڕۆیشتنو ڕێپێوان بە دەوری ساختومانە حکومییەکاندا[٢٥٠] وەك تەکتیکی نوێ هەڵبژێردران.[٢٥١]

بۆ سەرنج ڕاکێشانی لە ساڵی ١٩٠٩ چالاکیگەلێکی ڕاگەیاندنی بەرفرەوان دەستیان پێکرد. وتارخوێنییەکان بۆ سەرنجڕاکێشانی گشتی و وروژاندنی هەستی فزولیەتی خەڵکی لە شوێنە کراوەکاندا ئەنجام دەدران. لە ساڵی ١٩١٥ حزبی مافی دەنگدانی ژنان، لە نیویۆرك بۆ سەرنج ڕاکێشانی ڕای گشتی پەنای بۆ شێوازگەلێکی نوێ برد لەوانەش دەکرێ ئاماژە بکەین بە خۆپیشاندانە شەوانەییەکان لەلایەن ژنانەوە کە مەشخەل بەدەست لە شەقامەکاندا ڕێیان دەکرد، کۆنسێرت گێڕان لە شەقامەکان، دامەزراندنی ڕێستورانتەکانی مافی دەنگدان، پڕکردنی باڵۆنەکانی مافی دەنگدان لە هەوا و... هتد.[٢٥٢]

کاری کات بڕوای وابوو تەنیا بە هۆکاری دیمۆکراتی دەتوانین مافی دەنگدانی ژنان بەدەست بهێنین. دواجار، ئەو بە دوای گوشاری بەردەوامەوە بوو لەسەر ئەو کەسانەی دەسەڵاتی ریفۆرمی فیدرالی مافی دەنگدانی ژنانیان هەیە. ئەو تەکتیکە جیاوازەکان، لە کردە جەماوەرییەکانەوە بگرە تاکو تەکتیکەکانی بڕوا پێهێنان و بەلۆبکردنی ئەندامانی کۆنگرەی لەم ڕێیەدا بەجایز لەقەڵەمدەدان. لە ماوەی ساڵەکانی پێش شەڕو بەدرێژایی شەڕ ئەنجامدانی خۆپیشاندانو ڕێپێوان لە دەوری کۆنگرێس و کۆشکی سپیدا بەردەوام بوو. ئالیس پول لە ساڵی ١٩١٥ بەسەفەرێك بەپێ لە سان فرانسیسکۆوە تا واشنتون داواکارییەکی ١٨ هەزار پێی بەنیو ملیۆن ئیمزاوە ئامادەکرد[٢٥٣].



یەکێك لە هەنگاوە زۆر گرنگ و کاریگەرەکان کە لەم شەپۆلەی بزاڤی ژناندا فۆرمۆلیزە دەبوو، پەیوەندیکردن بوو بەکاربەدەستە حکومیو سیاسەتمەدارەکانەوە. هەم ناساو هەمیش یەکێتی کۆنگرەو حزبی ژنان، بەردەوامیان بەو نەریتەدا کە ستنتۆن و ئەنتۆنی بناغەیان بۆ دانابوو. نوێنەرانی بزاڤی ژنان چەندین جار لە دانیشتنە گوێگرتنیەکانی کۆنگرەو دانیشتنی کۆمیتەکانیدا بەشداریان دەکرد. بە دانوستان لەگەڵ نوێنەرانو سیناتۆرەکان ئەوانیان ناچار دەکرد مەسەلەی مافی دەنگدانو لە کۆمیتەکانو هەردوو ئەنجومەندا بخەنە ڕوو، لە ئاستی ویلایەتەکانیشدا بەهەمان شێوە گوشاریان دەخستە سەر کۆڕوکۆمەڵەکانی یاسادانان. سەرەڕای ئەوە، دوای هەنگاوی کات لە پەیوەندیدا لەگەڵ حزبی کۆماریخوازو دیمۆکراتو بەتایبەتی دوای دامەزرانی حزبی ژنان، دروستکردنی پەیوندی لەگەڵ دوو حزبی بەهێزیی وڵات بوو بە یەکێك لە هەنگاوە تەوەرییەکانی ڕێکخستنەکانی ژنان. سەرەڕای ئەوە، پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ سەرۆك کۆمار وەك پلەو پایەی سەرەکی ڕاپەڕاندن لە وڵاتداو کەسێکی باڵادەست کە دەیتوانی کۆنگرێسیش بخاتە ژێر کاریگەری خۆی، چەندین جار فۆرمۆلەبوو و هەروەك باسکرا، بێ کاریگەریش نەبوو.[٢٥٤]

لە بزاڤدا، لەتەك ئەم کردە تاڕادەیەك باوانە بەرەبەرە سوود لە کردە ململانێخوازییەکانی دیکەش وەردەگیرا. یەکێك لە هۆکارە کاریگەرو تاڕادەیەك دەستنیشانکەرەکان لە گۆڕانی تەکتیکی بزاڤ بەتایبەتی لە بەشە رادیکالەکەی بزاڤ، کاریگەری بزاڤی ژنانی ئینگلتەرا بوو. ئەمێلین پانکهورست[٢٥٥] لە ساڵی ١٩٠٣ لەگەڵ دامەزرانی یەکێتی کۆمەڵایەتیو سیاسی ژنان لە ئینگلتەرا ڕێنمایی کردنی بزاڤی ژنانی لەم وڵاتەدا لەئەستۆ گرتبوو. ئەو پێیوابوو سەرکەوتن لە بزاڤدا پێویستی بە پەنابردنەبەر کردە بەرچاوەکان، ململانێخوازی و کردەی سیاسی ڕاستەوخۆ هەیە. ئەنجامدانی خۆپیشاندانی ڕۆژانە، بەستنەوەی خۆیان بە پلیکانەی فەرمانگە حکومییەکان، شکاندنی شۆشەکان، شکاندنی سنووقەکانی پۆستە، ئاگربەردان لە خانووە بەتاڵەکان، بەردگرتن لەو نوێنەرانەی دژی مافی دەنگدانو تەنانەت کارە





خۆکوژییەکان لە شێوازەکانی خەباتی بزاڤی ژنان بوون لە ئینگلتەراو کار بەپەرچەکرداری تاڕادەیەك توندوتیژانەی حکومەت گەیشتو ئەو ژنانەی بەشداریان لە خۆپیشاندانەکاندا کردبوو دەسگیرکران، لافاوی مانگرتن لە خواردن دەستی پێکرد. ئەمانە دەبوونە هۆی وروژاندنی ڕای گشتیو لە ئەنجامدا حکومەت ناچار دەبوو ژنان ئازاد بکات.[٢٥٦]

ئەو ژنانەی خەریکی کارە خۆشگوزەرانی و کۆمەڵایەتییەکانیش بوون کاریگەرییان لە فرەوانکردنی پانتایی بزاڤدا هەبوو. بزاڤی نیشتەجێکردن[٢٥٧] بەرێبەرایەتی ژنەکانی وەك جین ئادەمز بووە هۆی ئەوەی زۆر لە ژنەکانی چینەکانی خوارەوە بچنە نێو چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانەوە.[٢٥٨] سەرەڕای ئەوە، ئەم هەنگاوە وەك دروستکردنی پردێك وابوو لە نێوان بزاڤی ژنانو بزاڤی کرێکاران یاخود بە یەکێك لە دەستەواژەکان لە نێوان "خاتوون"ەکانی چینی ناوەڕاست و ژنە کرێکارەکاندا.

بەهەمان شێوەی کە ڕێگا نوێیەکانی گەیاندنی و خێرابوونی هاتوچۆ لەگەڵ سەرهەڵدانی کەشتییەکانی هەڵمو ڕێگای ئاسن لە قۆناغی پێشووتردا یارمەتی بزاڤیدا، لەم قۆناغەدا سەرەڕای ئەوە، تەلەفۆنیش بەهانای بزاڤەوە هاتو توانای پەیوەندییەکانی لە ئاستێکی بەرچاودا زێدەکرد. لە واشنتۆن بەشێوەیەکی بەربلاو سوود لە تەلەفۆن وەردەگیرا بۆ دیاریکردنی چاوپێکەوتن لەگەڵ سیاسەتمەداران، دەستنیشانکردنی کۆنفرانسەکانی ڕۆژنامەگەری، ئاگادارییەکانی گردبوونەوە، چاودێری کردنی دەستپێکەکانو...هتد. بڵاوکراوەکانیش لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی بزاڤ، گواستنەوەی داواکارییەکانی بۆ ڕای گشتی و لایەنگیری کردنی و دواجار دروستکردنی ڕای گشتی کاریگەرییەکی دیاریکراویان هەبوو. بەشێوەیەکی تایبەتی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی زۆربەی بڵاوکراوە گرنگەکان لایەنگری بزاڤیان دەکرد. لە نیویۆرك لە پانزدە ڕۆژنامەی سەرەکی، دە ڕۆژنامە لەگەڵ مافی دەنگدانو سێیان بێلایەن بوون. لە نموونەکانی پشتگیری بڵاوکراوەکان لە بزاڤی ژنان، دەکرێ ئاماژە بەم بارە بکەین کە





ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست یەکێك بوو لە سەرچاوە داراییەکانی کۆمیتەی کۆنگرەی ناساو سەرنووسەرەکەی دیارییەکی هەزار دۆلاری پێشکەش بەم کۆمیتەیە کرد.[٢٥٩]

سەرەڕای ئەوە، بزاڤ خۆیشی خاوەنی چەند بڵاوکراوەیەك بوو، لەو ساڵانەدا کە خەباتکردن لەپێناو مافی دەنگدان لە لوتکەدا بوو بڵاوکراوەی هەواڵی حەفتانە سوفەرجیست[٢٦٠] (لایەنگری مافی دەنگدان) بڵاودەبووەوە کە لە هەنگاوێکی تاڕادەیەك بێ پێشینەدا لە هەوڵی ئەوەدابوو لە ئاستی نەتەوەییدا بڵاودەبێتەوەو بەردەوام هەواڵە پەیوەستەکان بە مافی دەنگدان بۆ موخاتەبەکانی بگوازێتەوە. ئەم بڵاوکراوەیە بە شێوەیەکی تەواو پیشەیی بەڕێوە دەچوو و بەشداریگەلێکی جیاجیای هەبوونو بەچاپکردنی ریکلامەکان گوژمەی خۆی دابین دەکرد.[٢٦١]

بەم شێوەیە، لە ڕووی ڕێکخراوەیی، پەیوەندی و کایەی کردەو تەکتیکەکانی خەبات، بزاڤی ژنان لەم قۆناغەدا زۆر پێشکەوتوتر بوو لە قۆناغی پێشترو لە ڕووی مۆبالیزەی سەرچاوەو تواناکانیش زۆر بەهێزتر بوو. بزاڤی ژنان توانی پانتایی کۆمەڵایەتی خۆی فرەوان بکاتو نەتەنیا سەرنجی ڕای گشتی بۆ خۆی ڕاکێشێت، بەڵکو تاڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بێت لە هاودڵکردنی چەند بەشێکی ڕای گشتی لەگەڵ خۆیدا.

### ئەنجام

لە سەدەی نۆزدەیەم، بزاڤی ژنان وەك "بزاڤێکی بەردەوام"[٢٦٢] دروست بوو. برایدەنتال[٢٦٣] هۆیەکەی بە ئاوێتەبوونی هاوکاتی پاڵنەر بۆ فیمنیزم (لەگەڵ سەرهەڵدانی گوزارە مۆدێرنەکانی وەك یەکسانی مەدەنی) لە ڕێگەی کردەی جۆراوجۆرو ئامرازی بەدیهاتنی لە قەڵەم دەدات، هەردووکیان بە ئەنجامی سەرمایەداری دەبینێتو، جەخت لەسەر هۆکارەکانی وەك شارنشینی، بزاوتی جوگرافیاییو پێشکەوتنی پەیوەندییەکان دەکاتەوە.[٢٦٤]

بەڵام نابێت ئەم خاڵە فەرامۆش بکەین کە سەرەڕای گوزارەکانی مۆدێرنیتەو ژێرخانگەلێکی گونجاو کە سەرمایەدارییان هێنایە ئاراوە، گرنترین ڕۆڵی سەرمایەداری

دروستکردنی گۆڕان بوو لە ڕەوشی ژنان و دانانیان لە شوێنگەگەلێکی ناکۆکدا. سەرەڕای ئەوەش نابێت ڕۆڵی ستراکتووری ئەو دەرفەتە سیاسییەی لە حکومەتی دەوڵەتی لیبرالەوە سەرچاوەی گرتووە لەو نێوەدا پشتگوێ بخەین. دەوڵەتی لیبرال، بەهەمان شێوەی لە لێکۆڵینەوەی پرۆسەی بزاڤدا ئاماژەی پێکرا، کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوو لە ڕووی فۆرمۆلیزەکردنی تەکتیکەکانی بزاڤ و سەرکەوتنیدا، دەروەست بوو لەبەرامبەر ئازادی دەربڕینو ئازادی کۆبوونەوەکان لەلایەکو کرانەوەی کەناڵەکانی کاریگەری خستنە سەر حکومەت لەلایەکی دیکە. هاوشان لەگەڵ کاریگەربوونی حکومەت بەڕای گشتی، بەو مانایە بوو کە حکومەت وەك دامەزراوەیەکی سەرەکیی وەڵامدەرەوە لەبەرامبەر داخوازییەکانی بزاڤ لە ڕادەو توندی بەرەنگاربوونەوە لەبەرامبەر ئەم بزاڤە کۆمەڵایەتییە ڕووبەڕووی سنووردارییگەلێکی بەرچاوبووەوە. هەروەها دەبێت ئەو خاڵەش لەبەرچاو بگرین کە وەڵامدانەوە ڕێژەیی و ماوەماوەییەکانی حکومەت (بەتایبەتی بەسەرنجدان لە ستراکتووری فیدرالی ویلایەتە یەکگرتووەکان) لەو هۆکارانەبوو کە دەبووە هۆی ئەوەی بزاڤەکە حاڵەتی تەقینەوە بەخۆیەوە نەگرێتو وەڵامە ئیجابیە "ناتەواوەکان" وەك "هۆکاری دڵنیایی" کاری بۆ حکومەت دەکرد.[٢٦٥]

لە کاتی بەستنی کۆبوونەوەی سنکافالز تا حەفتاو یەك ساڵ دواتر کە ڕیفۆرمی نۆزدەیەم بڕیاری لەسەر درا، پەنجا و شەش هەوڵ بۆ ئەنجامدانی ڕیفراندۆم، چوار سەدو هەشتا هەوڵ بۆ ناچارکردنی ئەنجوومەنەکانی یاسادانان بۆ ئەوەی چاکسازی بخەنە بەردەمی دەنگدەران، چلو حەوت هەوڵ بۆ ناچارکردنی ئەنجومەنی دامەزرێنەری ویلایات بۆ ئەوەی مافی دەنگدانی ژنان بخەنە نێو دەستووری ویلایەت، دووسەدو حەفتاو حەوت هەوڵ بۆ ناچارکردنی کۆبوونەوە ویلایەتییەکانی حزبەکان بۆ ئەوەی مافی دەنگدانی ژنان بخەنە نێو پەیڕەو پرۆگرامەکانیانەوەو بڕیاری لەسەربدەن و، خەباتی ڕەسمی لە نۆزدە خولی یەك لە دوای یەکی کۆنگرەدا بەئەنجام گەیشت[٢٦٦].



وێڕای ئەوەی هەلومەرجی ستراکتووری و گوتاری بۆ خستنەڕووی مافی ژنان هاوکاربوو، بەڵام ناتوانین ئەو گوتەیە پەسەند بکەین کە "دەرفەتە نوێیەکانی ژنان گەشەسەندنی سروشتی شارستانیەتێکی پیشەسازی بوو و تەنانەت ئەگەر ژنان داوای مافی دەنگدانیشیان نەکردبا هەر دەهاتەدی. دەکرا گەشەکردنەکەی هێواشتر بێت، بەڵام هەرچۆنێك بوایە دەردەکەوت"[٢٦٧]. ڕاستە هەلومەرجە بونیادییەکان لە توانایاندایە زەمینەیەکی گونجاو بۆ کردەی بە کۆمەڵی سەرکەوتوو بڕەخسێنن. بەڵام نابێت بێئاگابین لە ئاست ڕۆڵی بکەرو کاراکتەرە مێژووییەکاندا. دواجار ئەوە مرۆڤەکانن لە کردە تاکەکەسیو بەکۆمەڵەکانی خۆیاندا دەتوانن سوود لە هەلومەرجی گونجاوی ستراکتووری بە شێوەیەکی باش یان خراپ" وەرگرن.

ئەگەر بەپەیرەویکردن لە شتومپکا، وا سەیری کۆمەڵگا بکرێت کە لە چوار بونیاد یاخود ئاست پێکهاتووە (ئاستی ئایدیۆلۆژی، ئاستی نۆرمی، ڕێکخراوەییو نایەکسانییەکان)، دەکرێ بزاڤی ژنان لەم قۆناغەدا لە ڕووی کاریگەرییەکەی لەو چوار بونیادەدا (کەشتومپکا ئەوان بە پتانسیلی ئایدیۆلۆژی، ریفۆرمی، دووبارە ڕێکخستنەوەو دووبارە دابەشکردنەوە ناودەبات)[٢٦٨] هەڵسەنگێنین.

بەزۆری بزاڤەکان بە شێوەیەکی یەکلایەنە لەسەر کایەیەکی گۆڕانی بونیادی چەق دەبەستن. دەکرێ سەرکەوتنی بزاڤ هەم لەسەر بنچینەی ڕێژەیی کاریگەرییەکەی لەسەر ستراکتوورە دەرەکییەکان هەڵسەنگێنینو هەم لەسەر بنچینەی ڕێژەیی سەرکەوتنی لە پاراستنی یاخود بەردەوامی بزاڤ لە خۆیدا.

وا دێتە بەرچاو، گریمانەی بزاڤی ژنان لەم قۆناغەدا ئەوەبوو کە بەزێدەبوونی پتانسیلی نۆرمی بزاڤ و چاکسازی یاسا بەو جۆرەی مافی دەنگدانی ژنانی بەدواوە بێت دەتوانێت خۆ بەخۆ ببێتە هۆی گۆڕان لە سێ کایەی دیکەشدا. بەگوتەی چیف، ئەو پێشکەوتنەی لە ساڵی ١٨٤٨ تاکو ١٩٢٠ ڕوویدا ئەو باوەڕەی هێنایە ئاراوە کە "بەدەستهێنانی مافی دەنگدان دوا کۆسپو تەگەرە لەسەر گەیشتن بە یەکسانی هەڵدەگرێت" و هەست دەکرێت شۆڕشێك لە ڕۆڵی ژناندا ڕوویداوە[٢٦٩].





هەر گۆڕانێک لە بزاڤەوە سەرچاوە بگرێت بە جۆرێک لە جۆرەکان کاریگەری لەسەر بزاڤیش بەجێدێڵێت. ئەو ڕێکخستنە بونیادییە نوێیەی لە کاریگەرییەکانی بزاڤەوە سەرچاوە دەگرێت بە گەشەسەندنی زێتری بزاڤ کۆتایی دێت کە دەتوانین بەپەیرەویکردن لە ئەتزیۆنی[٢٧٠] بە "پرۆسەی بەهێزکردنی بەرامبەر" ناوبنێین. بەهەمان شێوە، هەوڵە سەرکەوتووەکانی قۆناغی یەکەم بە مەبەستی چەسپاندنی خاوەندارێتی ژنان، دەرفەتە تارادەیەک یەکسانەکان بۆ خوێندنی ژنان، ئەزموونی کاری ڕێکخراوەیی لە بزاڤدا و چالاکییەکانی دیکە لە زۆربوونی تواناکانی بزاڤ و ئیمکانیاتە بەردەستەکان بۆ مۆبالیزەکردن کاریگەریان هەبوو.

ئەگەر ئەوە پەسەند بکەین ئامانجی بزاڤی ژنان ئامانجێکی گشتییە- واتە ئەوەی خودی "ڕزگاری" ناودەبەن- لەم قۆناغەدا کەم تا زۆر بەرەبەرە دەگۆڕا بۆ بزاڤێکی تایبەتی، واتە بزاڤی مافی دەنگدان. بزاڤی ژنان وەک بزاڤە گشتییەکانی دیکە جەخت لەسەر کۆمەڵێکی زۆری کێشەکانی ماڵ، هاوسەرێتی، لە فێرکردنەوە بگرە تاکو سیاسەت، ئابووری... هتد[٢٧١]، بەڵام تەوەرەکەیان بە بەدەستهێنانی مافی دەنگدان سنووردار بوو.

ویلیام ئۆنیل لەمەڕ هەڵسەنگاندنی شەپۆلی یەکەمی فیمنیزم پێیوایە ئەم شەپۆلە شکستی هێنا، چونکە ڕێبەرەکانی بزاڤ گیروگرفتە سەرەکییەکانیان زۆر سنووردار پێناسەکردن و لە ماوەی ساڵەکانی ١٨٤٨ تاکو ١٩٢٠ بەرەبەرە تادەکرا زێتر سەرنجیان لە مافی دەنگدان دەدایەوەو لە ئەنجامدا ئەوکاتەی لەگەڵ بڕیاردان لەسەر چاکسازی بەداوایەکەیان گەیشتن، بزاڤ وەستاو لەوە تێنەگەیشتن کە ئەوەی تیایدا سەرکەوتوون شەڕێک نەبوو بەڵکو پێکهەڵپژانێک بوو[٢٧٢].

میللەت لەوەش تێدەپەڕێنێت و پێیوایە داواکردنی مافی دەنگدان "بەفیرۆچوونی وزە بوو بەدرێژایی حەفتا ساڵ". خەباتکردن بۆ مافی دەنگدان شتێک نەبوو زێتر لە دەلاقەیەک لە سەرەتای سەفەرێکی دوورودرێژدا ـ دەلاقەیەک کە نەهێشتنی کات، کارو گوژمەیەکی زۆری دەویست بە شێوەیەک کە چاوپۆشی لە سەفەرەکە خۆی کرا".



بەدەربڕینی میللەت، بزاڤی مافی دەنگدان "شۆڕشێکی تەواوی کۆمەڵایەتی" گۆڕی بۆ کێشەیەکی تایبەتی. زۆر لە نووسەرە رادیکاڵەکانی شەپۆلی دووەمی بزاڤی ژنان وەکو میللەت لەو بڕوایەدان کە "لاوازی سەرەکی لە چەقبەستنی بزاڤ لەسەر مافی دەنگدان، ئەو هۆکارەی بووە هۆی بێ کاریگەربوون، بزربوون و تەنانەت دۆڕاندنی هەموو بزاڤ بۆ بە دەستهێنانی مافی دەنگدان، لە سەرنەکەوتنی بە مەبەستی ئەوەی ئایدیۆلۆژیای باوکسالارانە لە ئاستێکی قووڵو رادیکاڵدا بخاتە کێشەوە لەپێناو دابڕینی رەوتەکانی کۆتوبەندکردنی پێگە، خوو و رۆڵی خۆیان دابوو"[٢٧٣].

بەڵام دەبێت ئەو تێگەیشتنە پەسەند بکەین کە بزاڤە گشتییەکان بەدرێژایی ماوەی خەباتیان "خول" ینو لەوانەیە لە ماوەیەک لە ماوەکاندا حەزو پەرۆشییەکی زۆر لە خۆیان پیشان بدەنو لە خاڵێکی دیکەدا بەبێ ئارەزوویی بگەن، دەشێ لە کایەیەکدا سەرکەونو لە کایەیەکی دیکەدا شکست بخۆن[٢٧٤]. بزاڤی ژنانیش لەم شەپۆلەدا توانی بەسنوورداركردنی داواکاری خۆی بەمافی دەنگدان، ڕێگا بۆ سەرکەوتنی ئاسانتری بزاڤ خۆشکات، بەڵام لە هەمان کاتدا، بۆوە هۆی ئەوەی کە بە بەدەستهێنانی مافی دەنگدان، بزاڤ کاری خۆی بە کۆتایی پێهاتوو ببینێت و لە ئەنجامدا لە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی دیکە بەتایبەتی لە قۆناغی یەکەمی شەپۆلی یەکەمدا بەکراوەیی بمێنێتەوە. هەڵبەت ناتوانین ئەم خاڵە لەبەرچاومان دووربخەینەوە کە بواری هزریی کۆمەڵگە ئامادەیی بۆ شتێکی زێتر لەمە نەبوو.

دەکرێ بڵێین لەم قۆناغەی بزاڤدا، داواکارییە رادیکاڵەکان هاوشان لەگەڵ ئەو شێوازانەی باوترن شوێنی خۆیان بەداوایەکی سیاسیترو لەهەمانکاتدا، پەسەندتر (واتە مافی دەنگدان) هاوکات لەگەڵ شێوازە رادیکاڵترو نەناسراوترەکان بەخشی؛ و ئەنجامەکەشی سەرکەوتنی ماوە ماوەیی بزاڤ بوو لە دوای زێتر لە حەفت دەیەی خەباتی بەردەوام. باسکردنی ئەم خاڵەش شیاوی سەرنجدانە کە لە تەک ئەو رادیکالیزمە لە تەکتیکو خەباتدا، بوونی باڵی میانڕۆش لە سەرکەوتنی بزاڤدا بە تەواوی کاریگەرو دیاریکەر بوو، وا پێدەچێت دەبوایە ئەم پرەنسیپە پەسەند بکەن کە بوونی دوو باڵی رادیکاڵ —

توندرۆو نەرم- میانرۆ سیمبولی سەرکەوتنی بزاڤە کۆمەلایەتییەکانە بە هەمان شێوەی سینکلەر دەڵێت: لە بزاڤی ژنانیشدا ئامادەیی دوو باڵەکە یارمەتی سەرکەوتنی بزاڤەکەی دا.



## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

1. J. Boggs. And G. L. *Boggs Revolution and Evolution in the 20th Century*. (New York. Monthly Review Press, 1974)pp. 157-58
2. M.l. Carden, *The New Feminist Movement*. (New york, Russell Sage, 1974), p. 152.
3. Ladies, Magazine.
4. Sinclair. *op. cit*..p.41-2.
5. Oakley, *op. cit*..p.13
6. Rowbotham, *Women in Movement, op.cit*..p. 45.
7. Flexher, *op. cit*..p. 42:13. *Quarles, Black Abolitionists*. (New york, Oxford University Press. 1969).p.27.
8. Sarah Douglas
9. Lucretia Mott.
10. Sarah and Angelina Grimke.





11. Rowbotham. *Women in Movement.., op.cit*.

12. Flexner, *op. cit*., p. 42. Quarles, *op. cit*., p. 27.

13. Quarles, *ibid*, p. 26.

14. Carden. *op. cit*…p.115

15. Service ethic

16. Millett, *op. cit*., p. 80.

17. Schnier, *op. cit*..p.38.

18. Rowbotham, *Women in Movement*, op.cit..p.46

19. Chafe, *op. cit*.. p.4.

20. exclusion

21. Millett.op.cit..p.66.

22. Rowbotham, Women in *Movement, op.cit*..p.46.7

23. Sinclair. *op. cit*..pp.62-64

24. Rowbotham, *Women in Movement.. op.cit.*

25. J. Cowley. "Pioneers of Women Liberation. "In M.L. Thompson. Ed, Voice of New Feminism (Boston: Beacon Press. 1970)p.11

26. Flexher. *op. cit*..p. 42.



27. J . Hannam, "*Women, History and Protest*". In v. Robinson and D. Richardson. Eds. *Introduction to Women's Studies*, "(London, Macmillan, 1997)pp. 89-90.

28. Temperance Movement.

29. Susan B. Anthony.

30. O. E. Coolidge. *Women's Rights:The Suffrage Movement in America*, 1848-1920. (New york, Dutton, 1966),p. 35, 37 Carden, *op. cit*-p. 156.

31. The Lily

32. Coolidge, *ibid*, pp. 32-37.

33. Flexher, *op. cit*..p. 108.

34. Women's Central Association for Relief.

35. Us Sanitary Commission

36. Bullough, *op. cit*., p. 316

37. M. Binkin. And S.j. Bach. *Women and the Military*. (Washington. pc: The Brookings Institute, 1977) p.5. Carden. Op.cit.. p.156.

38. Harriet Tubman.

39. Sojourner Truth.

40. Rowbothman. *Women in Movement*, *op.cit*..p.49

41. Flexher, *op. cit*..pp. 109-11





42. Deborah Sampson.

43. Robert Shirtliffe.

44. Frances Hooks

45. Frank fuller

46. Elizabeth Compton.

47. Bullogh, *op.cit*.,pp. 318-19.

48. Hannam, *op. cit*..pp.90-1.

49. N.f. Cott.the *Grounding of Modern Feminism*. (New Haven. Yale University Press. 1987)pp. 16-7

50. North Star.

51. Schnier, *op.cit*., p. 85.

52. Cott.*op. cit*.. p. 17.

53. Schnier. *op. cit*. pp. 37-39

54. *Ibid*. p. 20

55. Fuller. *op. cit*..pp.38

56. Schnier. *op. cit*.. pp81.82

57. Chafe, *op. cit*.. p.6.

58. Yates. *op. cit*..p.16.

59. Cuffy.



60. Ro

61. Schnier, *op. cit*..p.118.

62. Schnier. *op. cit*.p.107

63. Sinclair,*op. cit*..pp.254-5.

64. Sinclair. *op*.. *cit*..pp.254-5.

65. Cott.*op. cit*..p.19.

66. Schnier. *op. cit*.p.63

67. Cott.*op. cit*..p.16.

68. Bullough, *op. cit*.. pp. 320-1-

69. identity kit.

70. Oakley. *op. cit*..p. 82

71. Flexher, *op. cit*..p.89. Sinclair,*op. cit*.p.105.

72. Amelia Bloomer.

73. Harrier Hunt.

74. Sinclair,*op. cit*..p.106; Yates, *op. cit*.. p. 29.

75. Ernestine Rose.

76. Yates, *op. cit*.. p. 25.

77. Sinclair.*op. cit*..pp.88.9.

78. Beard, *op. cit*..pp. 159-60.





79. Pauline Wright Davis.

80. Yates, *op. cit*.. p. 26.

81. Sinclair,*op. cit*..p.73.

82. age of consent

83. Schnier. *op. cit*.p.45

84. Chafe.*op. cit*.pp.5-6

85. Flexher, *op. cit*..p.127.

86. *Ibid* ..p.77.

87. *Ibid* .pp.67-82.

88. Schnier, *op. cit*..p.142

89. *Ibid* ..p.138

90. sex war

91. Sinclair,*op. cit*..p.256.

92. Isadora Duncan.

93. Schnier. *op. cit*..p.xv.

94. Frances Wright.

95. Cowley.*op. cit*… P. 7.

96. Sinclair,*op. cit*..p.37: Schnier, *op. cit.*

97. Schnier, *op. cit*..pp.40-68.



98. Antoinette Brown.

99. Sinclair,*op. cit*.,p.198.

100. Schnier. *op. cit*..pp.100-101

101. Sinclair,*op. cit*..p.ch xviii.

102. National Women's Right Association.

103. Cowley, *op. cit*., p. 11.

104. Garrison

105. Worcester

106. Flexher, *op. cit*..pp.80-2.

107. *Idid*..pp.122.181.

108. Coolidge, *op. cit*., p.4.

109. Flexner, *op. cit*.,pp.82-83.

110. Coolidge, *op. cit*., p.49

111. The Dial

112. Schnier. *op. cit*., p.62.

113. Cowley, *op. cit*., p. 15.

114. Beard. *op. cit*., p. 162

115. Iobbying

116. Clarina Nicholas





117. Flexner, *op. cit*., p.92.

118. consciousness raising

119. Schnier, *op. cit*., p. 126.

120. Cowley, *op. cit*., pp.4-5, 11.

121. Flexner, *op. cit*.,p.145

122. Coolige, *op. cit*., p.50

123. Rowbotham. *Women in Movement. op. cit*., p. 49.

124. Cowley, *op. cit*., p. 17.

125. Flexner, *op. cit*.,pp.147-8.

126. Anerican Equal Rights Association.

127. Julia Ward Howe

128. American Woman's Suffrage Association, Awsa

پێویستی بەبیرهێنانەوەیە کەلەم ماوەیەدا تارادەیەك لە هەموو ناوە پەیوەستەکان بە رێکخراوەکانی ژنان، سوود لەناونیشانی ژن (woman) و نەك ژنان (women) وەردەگیرێت. وێڕای ئەوەی هەندێکیان پێیانوایە ئەمە "هەڵەیەکی رێزمانی"یە. وادەردەکەوێت لە ئینگلیزی سەدەی نۆزدەیەمدا بەکارهێنانی شێوەی تاکی ناوی گشتی لە ئاماژەکردن بەگروپێك ناڕاست نەبووە. کات پێیوایە ئەم بەکارهێنانە لە وەکیەك بینینی هەموو ژناندا بووە. بگەڕێوە بۆ : Cott *op. cit*

129. National Woman's Suffrage Association. NWSA.

130. Cowley, *op. cit*., p.17.

131. Liberation



132.Livimore

133.*Woman's Joumal*.

134. The Revohution

135.George Train.

136. Larus, *op. cit*., p. 372.

137. Sargent.

138. Flexner, *op. cit*.,p.174

139. Schnier, *op. cit*., p.xvii.

140.Coolidge, *op. cit*., p. 57.

141. *Ioc. cit*.

142. Bullough, *op. cit*., p. 302.

143. Flexner, *op. cit*.,p.175.

144.Victoria Woodhull

١٤٥. ڤیکتۆریا وۆدهال بەشداری لە ئینتەرناسیۆنالی یەکەم لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا کردبوو. ئەو دەیویست سۆشیالیستەکان کێشەی مافی دەنگدان بکەن بەیەکەم ئەولەویەت. بەڵام فریدریش سۆرژ (Friedrich A. Sorge) پێیوابوو "مافی دەنگدانی گشتی ناتوانێت لە کۆیلایەتی رزگارمان بکات)). سۆرژ لە دژی وۆدهال بۆ مارکسیش گلەیی کردو دواجار کۆنفرانس لەدژی مەیلی "یەکەمی ژنان" دەنگیداو وۆهال دەرکرا

(Rowbotham, *Women in Movement, op. cit*., p. 18.)

146. Yates.*op. cit.,* P. 31: Chafe, *op. cit*., p.11





147.Coolidge.*op. cit*., p. 59.

148. National American Woman's Suffrage Association, NAWSA

149- Garry Chapman Catt.

150-Anna Shaw

151-Chafe, *op. cit*., p. 12. Sinclair. *op. cit*., 144. 293 – 98.

152-Populist Movement.

153-Progrissive Movement.

154-A.P. Grimes. *The Puritan Ethic and Woman Suffrage*", In G.Ruch znd R.Denissof, *Social and Political Movements*. (Neu York, Appleton – Century- Croftsm 1971). Pp. 357-59.

155-W.O. Neil. The Woman Movement. (Chicago, Quderrangle Books, 1967), p.56.

156-Sinclair, *op, cit*., pp. 321-2.

157-P. Baker, The Domestication of Politics: Women and the America Political Society, 1780 – 1920. In L. Gordon. Ed, Women, the state and Welfare. (Madison, WI, the Univercity of Wisconsen Press, 1990), p.63.

158-Grimes, *op. cit*., p. 358.

159- G. Mink, The Lady and the Tramp. In Gordon. *op. cit*., p.107.

160-Grimes, *op. cit*., p.359.

161-Chaf. *op. cit*., pp. 17-18.



162-Womens Christian Temperance Union. WCTU.

163-J.Z. Giele, *Two Paths to Women's Egualit*y*: Temperance Suffrage* and *the Origins of Modern Feminism*. (New York, Tawyne Publisher. 1995).

164-Coolidge. *op. cit*., pp. 76-77.

165-Frences Willard.

166-Anni Wittenmeyer.

167-Flexner, *op. cit*., pp. 183 – 84, Row batham, *Women in Movment, op. cit*., p. 97.

168-Home Protection

169- Coolidge, *op. cit*., pp. 77-78.

170-Giele, *op. cit*., p. 69.

171-Jane Adams

172-Lillian Wald

173-Mary McDowell

174-Schnier *op. cit*., p. 254.

١٧٥- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی جین ئادامز، بیروڕاو چالاکییەکانی بگەڕێوە بۆ:

J. Conway, “Jane Adams: An American Heroine”,

176-Social Feminism

177-R.Rapp, and E.Ross. “The Twenties Blacklash-Compulsory Heterosexuality. the Consumer Family and the Waning of Feminism”. In Lessinger and Swerdlow, op. cit., p. 95.

178-C.A.Lwnardini. *From Equal Suffrage to Equal Rights*. (New York, New York University Press, 1986). p.xiii.

179-Harriot Stanton Blatch

180-Women's Political League, WPL.

181-Sinclair. *op. cit*., p. 300; Coolidge. *op. cit*., pp. 102 -3.

182-Alice Paul

183-Lucy Burns

184-Publicity

185-Congressional Union For Woman Suffrage.

186-Lunardini. *op. cit*., p.34.

187-National Woman's Party

188-Grimes. *op. cit*., p.354.

189- Coolidge, *op. cit*., pp. 106-145.

190-Flexner, *op. cit*., p. 269.

191-Lunadini. *op. cit*., pp. 28-32: Coolidge. *op. cit*., pp.117-125.

192-Chaf, *op. cit*., p.14.



193-Coolidge, *op. cit*., pp. 133-56, Chafe, *op. cit*., p. 20.

194-Yates. *op. cit.*

195-Rowbotham. Women in Movement. *op. cit*., p. 80.

196-Harriet Burton

197-Coot. *op. cit*., p. 21.

198-Rowbotham, Women in Movement, *op. cit*., p. 98.

199-W.Kaminer. “Crashing the Locker Room”. In Brown. *op. cit*., p. 122.

200-Rowbotham. Women in Movemant, *op. cit*., p. 174.

201-The Man Made World.

202-*Ibid*,. p. 173.

203-Mary Llivermore

204-*On the Sphere and Influence of Women*

205-Sinclair, *op. cit*., P.Ix.

206-Aileen kraditor

207-Chafe, *op. cit*., pp. 13-21.

208-Kate Richards

209-Roubotham. Women in Movement, *op. cit*., p. 172.

210-gender





211-*Ibid*., p. 50.

212-Chafe, *op. cit*., p.6.

213-Oakley, *op. cit*., p.83.

214-Yates, *op. cit*., p. 78.

215-Schnier, *op, cit*., p. 381.

216-Sinclair. *op. cit*., p. 272.

217-Chafe. *op. cit*., p. 11.

218-*Ibid*., p. 6.

219-Melusina Fay Pierce

220-Marie Ctevens Howland

221-Rowbotham. *Women in Movement, op. cit.,* pp. 89 -90.

222-Chafe, *op. cit*., p. 8.

223-Schnier. *op. cit*., pp. 141-2.

224-Margaret Dreier Robins.

225-Chafe, *op. cit*., p. 49.

226-Ella Reeve Bloor.

227-Schnier. *op. cit*., pp. 157-58.

228-Red Emma

229-Rowbotham. *Women, Resistance, op. cit*., p. 152.



230-single cause movement.

231-Woman Suffrage Party. WSP

232-Flexner. *op. cit*., pp. 254-6: Coolidge. *op. cit*., pp. 104-5.

233-Women's Political League. WPL

234-Equaliy League of Self Supporting Women

235-Cott. *op. cit*., p. 25. Rowbotham. *Women in Movement, op. cit.,* p. 171.

236-National Wonan's Party, NWP

237-Lunardini. *op. cit*., pp. 23-25.53-84.

238-E. Brooks the “Feminst Theology of the Black Baptist Church. 1880, 1900”. In Lessinger and Swerdlow, eds. *op. cit*., p. 31.

239-National Association of Coboured Women. NACW

240-Flexner. *op. cit.* p. 191.

241-Mother Jones

242-Lady – like

243-Mary Ritter Beard

244-Leonora O’Reilly

245-Sinclair. *op. cit*., pp. 308-9.

246-Coolidge. *op. cit*., 83, 67: Cowley. *op. cit*., p. 19.





247-hearing

248-Coolidge, *Ibid*., pp. 68-69.

249-Flexner, *op. cit*., p. 250: Millett, *op. cit*., p. 82.

250-Picketing

251-Millet, *Loc. Cit*.

252-Coolidge, *op. cit*., p. 107.

253-*Ibid*., pp. 120-21, *Schnier, op. cit*., p. 287-256.

254- Lunardini, *op. cit.,* Sinclair, *op. cit*., بگەڕێوە بۆ:

Flexner, *op. cit.,*

255-Emmeline Pankhurst

256-Coolidge. *op. cit*., pp. 97-99.

257-settlement movement

258-Yates, *op. cit*., p. 32.

259-Ibid, p. 115: Sinclair. *op. cit*., p. 331. Lunardini. *op. cit*., p. 31.

260-Suffragist

261-Lunardini. *Ibid* .. pp. 38-39.

262- sustained movement

263- Bridenthal



264- R. Bridenthal. “Notes toward a Feminist Dialectic” In Lessinger and Swerdlow. Eds.. *op. cit*., p. 3-9.

٢٦٥- هێلکار ٢ (پاشکۆ) هۆکارە کاریگەرەکان لەسەر دروستبوونی شەپۆلی یەکەم بزاڤی ژنان پیشاندەدات.

266- Coolidge, *op. cit*., p. 158.

267- *Ibid*., p. 168.

268- P. Sztompka. “*Society in Action*. (Chicago. University of Chicago Press, 1991.), pp. 153-5.

269- Chafe. *op. cit*., p.22.

270- Etzioni

271- H. Blumer, “Collective Behavior” In A. M. Lee, ed. *Principles of Sociology*. (New York. Barnes and Noble: 1955), p. 101.

272- O’Neil, *op. cit*., pp. vii-x.

273- Millett. *op. cit*., pp. 83-4.

274- Blumer. *op. cit*., p. 101.

## بەشی سێیەم

## هەڵپەساردنی بزاڤی ژنان: ۱۹۲۰-۱۹٦۰

### پێشەکی

سەرکەوتن لە تێکۆشان لەپێناو بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بە زۆری بە کۆتایی بەشێك لە بزاڤی مافەکانی ژنان و تەنانەت هەندێ جار بە "کۆتایی فیمنیزم"[1] (هەڵبەت بەپێچەوانەی رای ئۆنیل، تەنیا کۆتایی شەپۆلی یەکەمی بزاڤ) دەژمێردرێت. بە دەربڕینی لیۆناردینی، "زۆربەی ژنان بڕیاردانی کۆتایی [لەسەر چاکسازی مافی دەنگدان] یان وەك کۆتایی خەباتێکی درێژخایەنو پڕ گوژمە، بەڵام دواجار هاوشان لەگەڵ سەرکەوتن دەبینی"[2].

بەزۆری فیمینیستەکان لە راڤەی ساڵەکانی ۱۹۲۰ تا کۆتایی دەیەی ۱۹۵۰و هەندێکیش تا ناوەڕاستی دەیەی ۱۹٦۰ باس لە نەمانو بێبزاوتی فیمنیزم دەکەن. بە درێژایی دەیەی ۱۹۲۰ واتە راستەوخۆ دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بۆ ژنان، لەلایەکەوە، بە رای زۆرکەس- لەوانەش هەندێ لە خەباتگێڕانی بزاڤ و بێگومان هەموو کاربەدەستانو بەدەستەواژەیەکی باشتر هەموو پیاوان- بزاڤ ئامانجی خۆی پێکابوو و بەبۆچوونی ئەوانەی بڕوایان بە بەردەوامی دروستکردنی گۆڕانکاری لە پایەی ژناندا هەبوو، ئێستا تەنانەت ژنانیش دەیانتوانی بەرەبەرە بە داواکارییەکانی خۆیان بگەنو، لەلایەکی دیکەوە، لەبارەی ئەوەی "داواکارییەکانی دیکە" چینو لە چ رێگەیەکەوە دەبێت بەدوای زامنکردنیانەوە بین بیروڕاکان لە ناو بزاڤی ژناندا زۆر ناتەبا بوون-







جیاوازی بیروڕا کە یەکێك لە نیشانەکانی لەمەڕ پانتایی ناونانی "فیمنیزم" و "فیمینیست" بوو، ئەم رەوشە تاکو دەیەی ١٩٦٠ تاڕادەیەك بەردەوام بوو. بەڵام لەناوچوونی بزاڤ بەمانای ناکارایی ژنان نەبوو لەسەر بنچینەی زۆر لەو ئامانجانەی هەندێ لە فیمینیستەکانی سەدەی نۆزدەیەم جەختیان لەسەر دەکردەوە. ئەوان لە چوارچێوەی ئەو گروپانەدا کە پێکهاتەیان جیاوازە بەئامانجی جیاواز و هەندێجار ناکۆك بەردەوامیان بە چالاکی خۆیان دەدا کە بە زۆری لە شێوەی پیادەکردنی نفووزدا بوو.

بە زۆری لە بەرهەمە زانستییەکاندا لە بواری بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان، کەمتر سەرنج لە سەردەمەکانی نەمانی بزاڤە کۆمەڵایەتییەکانو وابەستەیی نێوان سەردەمە جیاوازەکانی بەلوتکەگەیشتنی مۆبالیزەی کۆمەڵایەتیو چالاکییەکانی بزاڤ بەهۆی قۆناغەکانی بێبزاوتی رێژەیی بزاڤ دەدرێتەوە. لەچاوی لێکۆڵەرو تیۆریستەکانی بزاڤی کۆمەڵایەتییەوە، لەبەرئەوەی بزاڤ لە بنەڕەتدا دیاردەیەکی نائاسایی و دابڕان دروستکەرە، پێویستی بەروونکردنەوە هەیە، بەڵام لەبارەی وەستان، بێبزاوتی و لەناوچوونی بەمانای گەڕانەوە بۆ رەوشی پێشتر (بەلای کەمەوە بە شێوەی رێژەیی)، پێویستی بەروونکردنەوە نییە. ئەم کەموکوورییە هەم لەو بەرهەمانەدا دەبینرێت کە بایەخ بەزەمینە بونیادیەکانی بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان دەدەنو هەم لە تیۆرە دامەزراوییەکانی بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان. ئەم سەرنج نەدانە لە قۆناغەکانی بێبزاوتی بزاڤ لە زاڵبوونی تێگەیشتنێکی بزاڤی کۆمەڵایەتی سەرچاوە دەگرێت کە تەنیا لەسەر بنچینەی مۆبالیزەی کۆمەڵایەتیی سەرتاپاگیرو فراوان پێناسەی دەکات. لە کاتێکدا ئەگەر بزاڤی کۆمەڵایەتی بە دیاردەیەك لەقەڵەم بدەین کە بەشێوەیەکی هێزەکی درێژخایەنەو قۆناغگەلێکی بەرزبوونەوەو داشکان بەخۆوە دەبینێت، دەتوانین بگەین بە تێگەیشتنێکی فرەوانترو بەربڵاوتر لەبارەیەوە. لێرەدا هەوڵدەدرێت سەردەمی هەڵسپاردنی[٣] بزاڤ وەك قۆناغێك لە ژیانی بزاڤدا درك بکرێتو تایبەتمەندییەکانی ئەم قۆناغە گوزارشی لێوە بکرێتو دروستبوونو بەردەوامییەکەشی روون بکرێتەوە. رۆڵی ئەم قۆناغە لەمەڕ فۆرمۆلیزەکردنی شەپۆلی دواتری بزاڤ لەو بابەتانە دەبێت کە لە



بەشی دواتردا لێی دەکۆڵرێتەوە. لەم بەشەدا، لە رەوشی بزاڤ و چالاکییەکانی ژنان بە درێژایی چەند دەیەیەك لە دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان دەکۆڵینەوەو پاشانیش هەوڵدەدەین لەو هۆکارانە بکۆڵینەوە کە کاریگەربوون لە دروستکردنی ئەو رەوشە کە بەگشتی لە ناکۆکی نێو بزاڤ و ناهاوکاربوونی فەزای سیاسی-کۆمەڵایەتیدا کورت دەبێتەوە.

**"لەناوچوون"ی بزاڤی نارەزایی:**

**بزاڤ لە چالاکییە نادامەزراوەکانەوە بۆ سیاسەتی دامەزراوەیی**

ئەو تێگەیشتنەی کە دەیەکانی ١٩٢٠ تاکو ١٩٥٠ دەیەکانی لەناوچوونی بزاڤی ژنانو فیمنیزم بوون بەیەکێك لە ئیعتیبارەکان تەواو راستە. لەبارەی ئەم ساڵانەوە، تەنانەت ناتوانین باس لە "بزاڤ" ی ژنان بەمانای چالاکییەکانی ژنان وەك گروپێکی کۆمەڵایەتی بەدەر لە سیاسەتی رۆژانەو ئاسایی بکەین. چونکە کایەی ژنان لەم ساڵانەدا زێتر لە چوارچێوەی سستەمی پلورالیزمانەی زاڵ لەسەر ژیانی سیاسی ئەمریکا هاوشان لەگەڵ میکانیزمە بە دامەزراوەبووەکانیدا بوو. بەڵام نابێت ئەو خاڵە فەرامۆش بکەین کە گواستنەوەی بەشی زۆری چالاکییەکانی ژنان بۆ نێو سیاسەتی بە دامەزراوەبوو بە مانای لە ناوچوونی بزاڤی ژنان نەبوو، بەڵکو بزاڤ چووە قۆناغێکەوە کە ڤەرتا تایلۆر بە "هەڵپەساردن" ناوی دەباتو، ئەویش بەمانای پرۆسەیەکە کە بزاڤەکان لە رێگەیەوە خۆیان لە فەزای سیاسی ناهاوکاردا دەپارێزنو لە نێو دوو ماوەی مۆبالیزەدا، بەردەوامی بزاڤ فۆرمۆلە دەکەن. لەم هەلومەرجەدا، ستراکتوورەکانی هەڵپساردن دروست دەبن تاکو ئەوانەی بەشێوەیەکی هێزەکی کەوتوونەتە کێشەوە بەشێوەیەکی کاتی لە چوارچۆوەی رەوشی هەییدا بپارێزرێنو لەم رێیەشەوە، رێگە بگرن لە دروستبوونی درز یاخود کەموکووڕی لە سستەمی کۆمەڵایەتیدا[٤].

دوگان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەیەی ١٩٢٠، دەیەی هێرشە توندەکانە لە دژی فیمنیزمو هێزە چەپەکان لە مێژووی ئەمریکاداو لە ماوەی ئەم ساڵانەدا گوشار





لەسەر چینی هەژار، کرێکار، ژنانو رەشەکان بە لوتکەی خۆی دەگات[٥]. فەزای سیاسی لە دوای شۆڕشی رووسیا زۆر گۆڕا. ترس لە کۆمۆنیزمو "ترسی سوور" هەموو جۆرە بزاڤێکی رادیکالی بەکۆمۆنیزمو بەلشەفیزم دەبەستەوە. سەرەڕای ئەوەش، سیاسەتی راگەیەنراوی پریزیدێنت هاردینگ، "ئاسایی کردن" بوو کە هەڵبەت رادیکالیزمی تەحەموول نەدەکرد. لەم فەزایەدا تەنانەت ریفۆرمخوازیش، بەدەربڕینی ئۆنیل، "کەشێکی قوورسی لە دەیەی ١٩٢٠ دا ئەزموون دەکرد". بەڵام تەنیا گوشاری "دژە بزاڤ نییە، بەڵکو وا دەردەکەوێت ئامانجە رادیکالە فیمینیستییەکانیش سەرنج راکێشی خۆیان لە دەست داوە. لە دەیەی ١٩٢٠ ژنە بێ مێردو بێ منداڵەکان بوون بەبابەتی لێکۆڵینەوە ئازارناسییەکان، هەڵوێستی زۆر لە رێکخراوەکانی ژنان — بەدەربڕینی نەوەی دواتری فیمینیستەکان- شێوەیەکی "پارێزگارانە"ی بەخۆوە گرتو هاوبەستەیی ژنان دووچاری لەرزۆکی هات[٦].

لەهەمانکاتدا، لەم ساڵانەدا شایەدی رێکخستنگەلێکین لە نێو ژنان لە رێی بەدیهێنانی ئامانجگەلێکی تایبەتیدا کە بە دەربڕینی فیمینیستەکان خۆیان، ئەو ئامانجانە بە ئامانجی "فیمینیستی" لەقەڵەم نادرێن، بەڵکو "ژنانە" (feminine) و هەندێجار فرەوانتر لێی، مرۆیین — بەمانای ئەو کۆمەڵە بەهاو فۆرمانەی لە کولتوورێك و کۆمەڵگایەکدا بە "تایبەتمەندی ژنان" دەژمێردرێن. کۆمەڵەکانی ژنان لە پیشەو کارو گروپە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکاندا زۆر گەشەیان کرد، ژنان ئەزموونی کاری سیاسیان بەدەستهێناو، لۆبەکانی خۆیانیان دامەزراندن و، هەوڵیاندا ئەو یاسایانەی کە بە قازانجی ژنانیان دەزانین یاخود بەپێی حەزی تایبەتی ژنان بەپێویست دەبینران، بڕیاریان لەسەر بدرێت. فیمنیزم لەم ساڵانەدا کەوتە ژێر کاریگەری فەزای گوتاری دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم، واتە بزاڤە ریفۆرمخوازەکانی وەك پێشکەوتنخوازیو قەدەغەکردنی بەکاربردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکانو لەم فەزایەدا هەڵبەت بەهەمان شێوەی کە دەبینین، "فیمنیزمی کۆمەڵایەتی" زێتر لە فیمنیزمی لیبرال سەرنج راکێش بوو و توانی جۆڵەیەکی سیاسی زێتر لە خۆی پیشان بدات.



**رێکخستنی ژنان**

ئالیس پارك لە ناوەڕاستەکانی دەیەی ١٩٢٠ رایگەیاند، "سەردەمێك دێت جۆری مرۆڤ هێندە مرۆیی دەبێت کە چیدی پێویستیمان بەڕێکخراوە جیاوازەکانی ژنان نابێت"[٧]. بەڵام لە دەیەی ١٩٢٠ و دواتر، جۆری مرۆڤ بەو پلەیەی مرۆڤایەتی کە پارك مەبەستی بوو نەگەیشتبوو. وێڕای ئەوەی کەمبوونەوەی خەباتو پراگماتیزمی ژنان لە چوارچێوەی بزاڤی فیمینیستی لەدەیەی ١٩٢٠ و بەدواوە دەشێ سەرچاوەی لەوەوە گرتبێت یاخود لە پەیوەندیدا لەگەڵ کەمبوونەوەی رێکخستنی ئەوان ببینرێت، بەڵام لە ڕاستیدا زۆریان لەوانەش، ئاینێز هاینس ئیروین[٨] لەو بڕوایەدایە لەم ماوەیەدا، ژنان "لەڕادەبەردەر خۆیان رێکخستبوو". رێکخراوەکانی ژنان ژمارەیەکی زۆری رێکخراوە سیاسییەکانیان لەخۆدەگرتن، واتە ئەو رێکخراوانەی کایەو بابەتی خەباتیان "کۆمەڵگای سیاسی"[٩] بوو، تاکو رێکخراوە مەدەنییەکان واتە رێکخراو، دامەزراوەو کۆمەڵە پیشەیی، خۆشگوزەرانی و، نەتەوەیی — نەژادیو....هتد کە زێتر لە کایەی کۆمەڵگای مەدەنیدا چالاك بوون و بەگشتی سوودیان لە کایەی سیاسەت بۆ هەمووارکردن یاخود گۆڕینی پەیوەندییەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا وەردەگرت. هەندێك لەم رێکخراوانە پێشتر هەبوون، هەندێکی دیکەیان شێوە گۆڕاوەکانی رێکخراوەکانی پێشووتربوونو هەندێکیش بەدرێژایی دەیەی ١٩٢٠ و دواتر دروست بوون. هەندێك لەم رێکخراوانە خۆیان و ئامانجەکانیان بەفیمینیستی لەقەڵەم دەداو هەندێکی دیکە بەڕاشکاوی دژی فیمنیزم بوونو، گروپێکیش لەبەرامبەر ئەو هەوڵانەی بۆ ناونانی فیمنیزم بە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی هزری لەسەر بنچینەی یەکسانی تەواوی ژنان لەگەڵ پیاواندا دروست دەبوون، دواجار لە بە "فیمینیست" ناوبردنی خۆیان دەستیان کێشاو ئەم زاراوەیە بەرەبەرە لەلایەن گروپێکی تایبەتییەوە پاوان کرا. لە هەندێك لەم رێکخراوانەدا تەنیا ژن ئەندام بوونو هەندێك رێکخراوی دیکە بەڕوونی لە زۆرینەی بنەبڕی ژنان بەهرەمەند بوونو لەئەنجامدا دەکرێت هەندێ لەو رێکخراوانەی "ژنانە" نەبوون لە ریزی رێکخراوەکانی ژنان بژمێرین. دەکرێ بڵێین هەندێك لەم رێکخراوانە





بەسەرنجدان لە جۆری داواکارییەکانو تەوەرەکانی خەباتی شەپۆلی دووەم، تەواو و راستەوخۆ رەهەندێکی وەزیفیان هەبوو لە گواستنەوە لە شەپۆلێکی بزاڤی ژنان بۆ شەپۆلێکی دیکە – بەتایبەتی حزبی نەتەوەیی ژنان-[١٠]و هەندێکی دیکەش بە سەرکەوتن لە دروستکردنی گۆڕانکاریگەلێك لە دۆخی بابەتیو زەینی ژناندا، زەمینەیان بۆ شەپۆلی دووەم بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەڕەخساند.

**١- رێکخراوە سیاسییەکان**

ماهیەتی سیاسی خەباتی شەپۆلی یەکەم بەتایبەتی لە ساڵە دواییەکانیدا لە چوارچێوەی بزاڤی مافی دەنگدان، هەڵبەت مەسەلەی چۆنایەتی سوود وەرگرتنی گونجاو لەم مافانە بە جۆرێك کە دابینکەری خواستەکانی ژنان بێت، دەهێنێتەپێش. گرنگترین ئەو رێکخراوانەی لەم بوارەدا چالاك بوون لە راستیدا هەمان ئەو رێکخراوانە بوون کە بە مەبەستی بەدەستهێنانی مافی دەنگدان چالاکیان دەنواند.

"*لیگی ژنانی دەنگدەر*" [١١] کە بە دەربڕینی میللەت "باڵی پارێزگار"ی بزاڤی ژنان بوو، لە شوباتی ١٩٢٠ لە "کۆبوونەوەی سەرکەوتن"دا ناسا جێگەی گرتەوە. ئەم رێکخراوە بە گشتی لە ژنانی چینی ناوەڕاستو باڵا پێکهاتبوو و لەگەڵ گروپەکانی دیکەش بەسەرنجدان لە ئامانجە هاوبەشەکان ئیئتلافی دەکرد. لیگ پێیوابوو مافی دەنگدان بەمانای هاتنەدی بەشێکی زۆری مافە بنچینەییەکانی ژنانە[١٢]. لیگ بەپێچەوانەی حزبی ژنان، ئامانجەکانی خۆی بە زۆرو فرە پێناسە دەکردنو نەیدەخواست "لۆبێکی تایبەتی ژنان پێکبهێنێت و ئەندام و رێبەرەکانی ئەو رێکخراوە خۆیان "بەوەقفی خۆشگوزەرانی هەموو کۆمەڵگەو نەتەوە" لەقەڵەم دەداو لە مانا گشتییەکەیاندا بەدوای ئامانجگەلێکی مرۆڤدۆستانەوە بوون نەك بەدوای ئامانجە تایبەتییەکانی ژنان[١٣]. پەیرەو و پرۆگرامەکەی شەست و چوار حاڵەتی لە خۆدەگرت کە لەژێر حەوت ناونیشاندا پۆلێن کرابوون: فێرکردنی هاوڵاتییەتی، ژنان لە پیشەسازیدا، خۆشگوزەرانی منداڵان، تەندروستی گشتی، خستنەڕوو و داواکاری کەرەستەکانی خۆراك، هێورکردنەوەو ریفۆرمی یاسا هەڵبژاردنییەکان و، شوێنگەی



یاسایی ژنان. ئەم تەوەرانە لە ساڵی ١٩٢٣، بۆ سێ تەوەر کورت کرانەوە کە بریتیبوون لە "یەکەم، کارایی وەك پێگەی خۆشگوزەرانی گشتی لە حکومەتدا؛ دووەم، شوێنگەی یاسایی یەکسان بۆ ژنان و، سێیەم، رێگەگرتن لە شەڕ بەهۆی هاوکارییە نێونەتەوەییەکان"[١٤].

"*حزبی نەتەوەیی ژنان*" بەڕێبەرایەتی ئالیس پول لە تێکۆشاندا لەپێناو بەدەستهێنانی مافی دەنگدان لە چەند ساڵی کۆتایی ئەم خەباتەدا وەك حزبێکی تاك روانگەیی دامەزرا تەنیا بە مەبەستی بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بۆ ژنان چالاکی دەنواند. بەڵام زۆر لە رێبەرەکانی خوازیاری درێژەدان بەچالاکییەکانی بوون لە دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان و ئەم مەسەلەیە بەرەو ئەوە چوو کە حزبی تاك روانگەیی بەکردەوە حەل بێتو یەکسەر حزبێکی نوێ بەهەمان ناوەوە جێگەی ئەو بگرێتەوە. ئامانجی حزبی نوێ بە "مافە یەکسانەکان بۆ ژنان" راگەیەنراو بەزوویی جەختی لەسەر "نەهێشتنی هەموو بێ توانایییە یاساییەکان" کردەوە[١٥]. حزب پێیوابوو کە ژنان وەکو خۆی لە شوێنی جیاواز لەبەرامبەر "یاسا، لە پیشەکان، لە کەنیسە، لە پیشەسازی و، لە ماڵدا" پاشکۆی پیاوانن و دەبێت لەم کایانەدا بە یەکسانی تەواو بگەن[١٦]. حزب هزری ئیئتلافی لەگەڵ گروپە ریفۆرمخوازەکان کە لەپێناو لەچەکداماڵین، کۆنترۆڵی دانیشتووان و، یاساکانی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی چالاکیانە دەنواند رەتدەکردەوەو تەنیا لە رێی "یەکسانی تەواو بۆ ژنان" خەباتی دەکرد. وێڕای ئەوەی هەندێ لە مێژوونووسو نووسەران- بەتایبەتی زۆر لە فیمینیستەکانی شەپۆلی دووەم- پول و حزبی ژنان بەنوێنەری فیمینیزمی رادیکال لەم ماوەیەدا لەقەڵەم دەدەن، بەڵام بەکردەوە فیمینیزمی رادیکال بەمانای دابڕان بوو لە ئامانجە رادیکالەکانی دیکە. بەبۆچوونی کات، حزب بەکردەوە لەگەڵ دەستنیشانکردنی داواکارییەکانی بە مافە یەکسانەکان بۆ ژنان "بە شێوەیەکی ئاماژەپێکراوی، پشتیوانی لە رەوشی هەیی لە رەهەندەکانی دیکەدا دەکرد" و ئەمە بەمانای ئەوەبوو کە ئامانجی ژنان دەکەوتە بەرامبەر ئامانجی گروپە رادیکاڵەکانی دیکە، بەڵام بەهەرحاڵ، ئەمە حزبی ژنان بوو کە بەرەبەرە توانی





خۆی وەك نوێنەری هزری فیمینیستی بخاتەڕوو و پاوانی بکات. حزب وەك گروپێکی توندڕەوی کەمایەتی ناسرابوو و ئاشتەوایی بەمانای قوربانیکردنی ئامانجی یەکسانی لەقەڵەم دەدا[١٧].

لە ساڵی ١٩١٩ هەندێ لە ژنە چالاکەکانی دژی عەسکەرتاریەت و ئەو ژنانەی دی کە لە سیاسەتی پێشکەوتنخوازدا بەشداربوون "کۆمیتەی ژنان بۆ کردەی سیاسی"[١٨] یان لە واشنتۆن دامەزراند. کۆمیتە کاری چاپمان کات"[١٩] و "شارلۆت پەرکینز گیلمان"ت لە سەرووی گروپی راوێژکاری خۆی دانان. ئامانجی کۆمیتە ئەوەبوو کە "ئاسانکارییە گشتییەکان، سەرچاوە سروشتییەکانو سستەمی دارایی"[٢٠] لە "دەستی گروپێکی کەم" دەربهێنێت تاکو بتوانن بە " گەشەسەندنی ئابووری ئاشتیخواز بگەنو شەڕ نەهێڵن"[٢١].

## ٢- رێکخراوە مەدەنییەکان

مەبەست لە رێکخراوە مەدەنییەکان لێرەدا ئەو رێکخراوانەن کە بەدوای ئامانجگەلێکی ئابووریو کۆمەڵایەتی تایبەت یاخود گشتیەوەنو لەتوانایانداە رێکخراوە پیشەیی، ریفۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها بەرەو پێش بردنی ئامانجە تایبەتییە مرۆڤدۆستانەییەکان ئەوانەی لە بەرژەوەندی گشتیدان لە خۆیان بگرن.

لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٥و ١٩٣٠دا دەیان رێکخراوی پیشەیی بۆ ژنان دامەزران و فیدراسیۆنەکانی یانە پیشەییەکانی ژنان بە ناوی نێونەتەوەیی زۆنتا[٢٢] و نێونەتەوەیی کوتا[٢٣] دروست بوون. لە گرنگترین ئەم فیدراسۆنانە، فیدراسیۆنی نەتەوەیی یانەکانی ژنە[٢٤] پیشەکارو بازرگانەکان بوون، لێنا مادەسین فلیپپیس[٢٥] بەرێوەبەری گشتی ئەم فیدراسیۆنە، مەبەست لە دامەزراندنەکەی بە کۆکردنەوەی ئەو ژنانە لە قەڵەم دەدا کە "بەشێوەیەکی تاکەکەسی نفووزێکی زۆریان هەبوو، بەڵام لە شێوەی چینێك کاریان نەدەکرد. "فیدراسیۆن لە بەرچاوی بوو" هەستی هاوبەستەییان زێدە بکات، رێگەیان پێبدات وەك کۆمەڵێکی گشتی کاربکەن،... هەوڵی هاوبەشی ئەوان زامن بکەن ...،



بەهای گروپ بۆ ئەوان خۆیان، ئەو کۆمەڵانەی لەگەڵیان لە پەیوەندیدان و هەموو کۆمەڵگە زێدە بکەن" تاڕادەیەك نیوەی ئەو ژنانەی ئەندامی یانەکان بوون لە دەیەکانی ١٩٢٠و ١٩٣٠ کارمەندی نوسینگەکانیان پێکدەهێنان و پێشوازیان لە جەخت کردنەوەی فیدراسیۆن لەسەر بەرزکردنی ئاستی کاری ژنانو شەڕکردن لەگەڵ جیاکاری پیشەیی دەکرد. تاکو ساڵی ١٩٣١ ژمارەی ئەندامەکانی بەپەنجاو شەش هەزار کەس گەیشت.

ژنە خاوەن کارەکان لە ئاستی ناوچەییشدا دەستەو کۆمەڵەیان پێکدەهێنان، یانە شارییەکانی ژنان لەم جۆرە کۆڕوکۆمەڵانە بوون کە لەو نێوەدا شوێنگەگەلێکیان هەبوون بۆ سەقامگیری کاتی ژنانو بەستنی کۆبوونەوەکان. ئەم یانانە هەم ئامانجگەلێکی مەدەنیو هەم کۆمەڵایەتیان هەبوون[٢٦].

*فیدراسیۆنی یانەکانی ژنان* لەو یانانە پێکدەهات کە تیایاندا بە شێوەیەکی نەریتی ژنان چالاکیان دەنواند. فیدراسیۆن لە ساڵی ١٩١٠ قسەکەری نزیکەی ملیۆنێك ژن بوو. هیچ ئامارێك لەبارەی ژمارەی ئەو ژنانەی لە دەیەی ١٩٢٠ ئەندامی یانەکان بوون نییە، بەڵام گومان دەکرێت ژمارەی ئەندامەکانیان هەندێك کەم ببێتەوە. هەڵبەت فیدراسیۆن لە ساڵەکانی دواتردا توانی دووبارە تاڕادەیەك بەهێز بکەوێتەوە، بەڵام هەرگیز نەیتوانی پەرستیژو بایەخی جارانی خۆی دووبارە بەدەست بهێنێتەوە[٢٧].

*لیگی یەکێتییە کرێکارییەکانی ژنان*[٢٨] لە دەیەی ١٩٢٠ رووی کردە چالاکییە نێونەتەوەییەکان بە مەبەستی رێکخستنی ئەو بڕیارانەی تایبەت بوون بەکارکردن لە پیشەسازیدا. بەڵام لیگی یەکێتیش وەك لیگی بەکاربەرەکان لەگەڵ کەمبوونی ژمارەی ئەندامەکانی دەستەویەخەبوو و، لە رووی شێوازی کارەوە چالاکییەکانی زێتر بەلای دامەزراوە فەرمیو شارەوانییەکان و دامەزراوە ویلایەتییەکاندا دەشکانەوە. لیگ تاکو دوای جەنگی دووەمی جیهانی هەر روو لە نەمان بوو و دواجار دوای شەڕ لەناوچوو[٢٩].





*کۆنگرەی کۆمەڵەکانی باوان و فێرکەران*[٣٠] کە فیدراسیۆنێك بوو لە کۆنگرەی نەتەوەیی دایکان و کۆمەڵەی باوان و فێرکەران پێکدەهات، لە دەیەی ١٩٢٠ بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەی سەندو ژمارەی ئەندامەکانی پێنج بەرامبەر زێدەبوو و بە زێتر لە پێنج سەد هەزار کەس گەیشت[٣١].

کۆمەڵەی نەتەوەیی ژنە رەنگینپێستەکان لە دەیەکانی دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدانیش چالاك بوو. ئەم گروپە کە خۆی بە "فیمینیست" ناودەبرد، تورێك بوو لە یانەکانی ژنە رەشپێستەکان و هەروەها لەسەر ئاستی شارو ویلایەتەکان لە رێنماییکردنی خەباتی دژە لینج، دابینکردنی خانوو و شوێنی حەوانەوە بۆ ژنان و دروستکردنی قوتابخانەکاندا چالاك بوو[٣٢]. کۆمەڵە لە نێوان ١٥٠,٠٠٠ تاکو ٢٠٠,٠٠٠ کەسی لەخۆگرتبوو و زۆر لە رێبەرەکانی لە هەمان کاتدا لە رێکخراوەکانی مافەکانی رەشپێستەکاندا لەتەك پیاوە رەشپێستەکان چالاکیان دەنواند. هەروەها لە دەیەی ١٩٢٠ کۆمەڵەی نەتەوەیی حەقدەست وەرگرەکان بە مەبەستی هاوکاری ئەو کرێکارە ژنە رەشپێستانەی لە ماڵ و کارگاندا کاریان دەکرد، دروست بوو[٣٣].

لە کۆتایی دەیەی ١٩٢٠ *رێکخراوی ژنان بۆ ریفۆرمە نەتەوەییەکان* لەرێگەی قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکحولییەکان دروست بوو و بە توندی گەشەی سەند. ئەم رێکخراوە کە سێ ملیۆن ئەندامی هەبوو خەباتی بۆ قەدەغەکردنی یاسایی بەکاربردنی خواردنەوە ئەلکحولییەکان دەکرد، بەڵام بە هیچ شێوەیەك بە دوای ئامانجە "فیمینیستی"یەکانەوە نەبوو[٣٤]. لەم دەیەیەدا بەپێچەوانەی ماوەی بزاڤی مافی دەنگدان، هیچ پەیوەندیەك لە نێو ئەم جۆرە ریفۆرمخوازانەو "فیمنیزم" تەنانەت لە مانا فراوانەکەی دا نەبوو.

*لیگی نەتەوەیی بەکاربەران*[٣٥] وەك رێکخراوێك کە بەدوای ئامانجەکانی خۆشگوزەرانییەوە بوو هەروەها تەوەری چالاکییەکانی خەباتکردن بوو بە مەبەستی هێورکردنەوەی چۆنایەتی ژیان بە تایبەتی بەجەختکردن لەسەر مەسەلەی بەکاربردن،



بەدرێژایی دەیەی ١٩٢٠ یش بەردەوامی بە چالاکییەکانی خۆیدا. وێڕای ئەوەی لیگ رێکخراوێکی ژنان نەبوو، بەڵام زۆربەی ئەندامەکانی لە دەستدا. زۆر لە رێبەرانو ئەندامانی لیگ لە رێبەرانو پشتیوانە چالاکەکانی رێکخراوەکانی ژنان بوونو ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی لە رێگەی ئەو ئامانجە تایبەتیانەی ژنان بایەخیان پێدەدان چالاك بێت. لیگ لە ساڵی ١٩١٩ بەرێبەرایەتی فۆرانس کێلی[٣٦]- کە لە رێبەرانی حزبی نەتەوەیی ژنانیش بوو- کاری لەسەر رێکخستنی هەلومەرجی کار لە پیشەسازیەکاندا بۆ ژنان کرد. بەڵام لیگ وێڕای ئەو هەوڵانەی بە درێژایی دەیەی ١٩٣٠ بۆ زیندووکردنەوەی خۆیدا، دواجار نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ دەسەڵات و ئیعتباری سەرەتایی خۆی[٣٧].

*کۆمەڵەی ژنە لاوە مەسیحییەکان* لەو گروپانە بوو کە بەدرێژایی دەیەی ١٩٢٠ گەشەی سەند. کۆمەڵە لە کۆتایی دەیەی ١٩٢٠ شەش سەد هەزار ئەندام و پەنجاو پێنج هەزار راوێژکاری خۆبەخش و سێ هەزارو نیو کارمەندی جێگیری هەبوو. کۆمەڵە بەدامەزراندنی یانە پیشەسازییەکان لە هەوڵی زێدەکردنی هۆشیاری ژناندا بوو سەبارەت بە یەکێتییە کرێکارییەکان، هەروەها ژیانی ئەوان "شیرین" بکات لە رێی ئەو پەیوەندیو هاتوچۆیانەی لە نێوان ئەواندا دروستی دەکردن.

*لیگی ئەمریکی کۆنترۆڵکردنی منداڵبوون* لە بوارەکانی بەیاسایی کردنی منداڵبوون و فێرکردنی گشتیدا چالاکی دەنواند و لە ساڵی ١٩٢٦ سی و حەوت هەزار ئەندامی هەبوو. هەڵبەت لیگ رێکخراوێکی تەواو ژنانە نەبوو، بەڵام نەوەد لە سەدی ئەندامکانی ژن بوون[٣٨].

ژنان بەسەرنجدان لەوەی کە لەگەڵ ئەزموونی شەڕی جیهانی لە دووبارەبوونەوەی هەراسان بوون، دەستیان کرد بە دامەزراندنی کۆمەڵە خۆبەخشەکان بۆ رێگەگرتن لە دووبارە روودانی شەڕ. کۆمیتەی ژنان بۆ لەچەکداماڵینی جیهان لە دەیەی ١٩٢٠ بەرێبەری ئەما وۆڵد[٣٩] دامەزرا. دوای ئەوەی حزبی نەتەوەیی ژنان لەچەکداماڵینی وەك یەکێك لە تەوەرەکانی چالاکی خۆی پەسەند نەکرد، وۆڵد بەبێ ئەوەی





پەیوەندییەکانی لەگەڵ حزب بپچڕێنێت، ئەم کۆمیتەیەی وەك دامەزراوێکی سەربەخۆ لە حزب دامەزراند. لە ڕێکخراوە چالاکەکانی دیکە لەم بوارەدا دەکرێ ئاماژە بکەین بە *کۆمەڵەی ئاشتی ژنان* بە ڕێبەری فانی گاریسۆن ویلارد (کچی گاریسۆنی ڕێبەری بزاڤی نەهێشتن) و *یەکێتی ئاشتی ژنانی نیوەگۆی ڕۆژئاواو* هەروەها *لیگی نێونەتەوەیی ژنان بۆ ئاشتی و ئازادی* کە هەڵبەت ڕێکخراوێکی نێو نەتەوەیی بوو و ئەندامەکانی لە شانزدە وڵاتی جیاواز پێکدەهاتن[٤٠].

*نووسینگەی ژنان* بە ڕێبەری ماری ئەندرسۆن، یەکێك بوو لە دامەزراوە زۆر چالاکەکان لەپێناو مافەکانی ژناندا. ئەم نووسینگەیە وەك ڕێکخراوێکی یاسایی لەلایەن دەسەڵاتی بڕیاردان دامەزرابوو و لە تواناگەلێکی تاڕادەیەك زۆر بەهرەمەند بوو: دەیتوانی لە نێو بیرۆکراسیدا درێژە بە ژیانی خۆی بدات، گوژمەی ئەنجامدانی پرۆژەی گەورەو درێژخایەنی هەبوو و لە سەرچاوە مرۆییە شارەزاکان، ئاسانکارییە نووسینگەیی و کەرەستەییەکان بەهرەمەند بوو. نووسینگەی ژنان پەیوەندی لەگەڵ گروپە کرێکارییەکان هەبوو و هەوڵیدەدا ڕێکخراوە نەریتیەکانی ژنان ناچار بکات چالاکی بنوێنن. نووسینگە لەساڵی ١٩٢١ گوزارشگەلێکی جیاجیای لەبارەی مەسەلەکانی ژنان بڵاودەکردنەوە. لەبەرئەوەی نووسینگەو ڕێبەرەکانی بەدەربڕینی دورست-لاتی[٤١]، لە وێنەی "لەماڵدامانەوە"ی ژنان ڕزگاریان نەببوو، بەرەبەرە وەك دامەزراوێکی "دژە فیمینیستی" ناسران. ئەوە لە هەلومەرجێکدا بوو کە ئەندرسۆن خۆی بە "فیمینیست" دەزانیو گروپە دژە فیمینیستەکانیش نووسینگەی ژنانیان تاوانبار دەکرد کە دەیەوێت بە پشتیوانی لە یاسا فیدراڵەکان لە بەرژەوەندی " خێزان لەناوببات و ئەمریکا بکاتە بەلشەفیکی."[٤٢] بەگشتی، نووسینگەی ژنان هەموو هەوڵی خۆی بۆ هێورکردنەوەی ڕەوشی کاری ژنان خستە گەڕو لە ماوەی دەیەکانی دواتریش بۆ ئەم مەبەستە چالاکی نواندو لەبەر ئەوەی ریفۆرمی مافە یەکسانەکانی بەرێگر دەبینی لەبەردەم بەخشینی ئیمتیازاتی تایبەتی کار بەو ژنانەی کاریان دەکرد بەشێکی زۆری چالاکییەکەی ڕووەو شکست پێهێنانی ئەو ریفۆرمە بوو[٤٣].



لە دەیەکانی دوای بە دەستهێنانی مافی دەنگدان، ستراکتوورەکانی کار لەگەڵ ڕۆڵی ڕاوێژکاری وەك کۆمسیۆنی سەرۆك کۆمار یاخود شوراکانی ڕاوێژکاری، یاخود کۆمسیۆنە ویلایەتییەکان بەشێوەی ماوە کورت دادەمەزران کە ڕۆڵیان زێتر بە مەبەستی پرس پێکردن و هێنانە ئارای ڕاوێژکاری و هەروەها کۆنترۆڵکردنی پرۆسەی یاسادانان بوو، بەڵام لە سەرچاوە داراییەکان، بەهرە تەکنیکیو پەیوەندییە درێژخایەنەکان بێبەش بوون.[٤٤]

**داواکاری و تەوەرەکانی خەبات**

وا دەردەکەوێت لەم سەردەمەدا بەپێچەوانەی قۆناغی خەباتی مافی دەنگدان کە بەکردەوە بە خواستی زۆر سنووردارو دیاریکراو پێناسە دەکرا، ژنان خوازیاری چەند گۆڕانکارییەك بوون لە کایە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا. هەندێ لەم داواکاریانە درێژکراوەی داواکارییەکانی سەدەی نۆزدەیەم بوون، بەڵام زۆربەیان لەسەر بنچینەی شوێنگەی تایبەتی کۆمەڵایەتی و ئابووری ژنان لە گروپەکانداو مەیلە هزرییە تایبەتییەکانیان پێناسە دەکرانو هەندێجار تەنانەت بەداواکاری "ژنانە"ش لەقەڵەم نەدەدران واتە پەیوەندیان بە هەموو ژنانەوە نەبوو وەك گروپێکی کۆمەڵایەتی.

***ریفۆرمی مافە یەکسانەکان:*** لە ساڵی **١٩٢٣** "ریفۆرمی مافە یەکسانەکان"[٤٥] خرایەڕوو. لە حەفتاو پێنجەمین ساڵی کۆبوونەوەی سنکافالز و لە ڕێوڕەسمی ڕێزنان لە ئەلیزابێت کیدی ستنتۆن، لە کۆبوونەوەیەکدا بە ئامادەبوونی شاندەکانی ژنان کە لە سەرتاسەری ئەمریکا بەرپاببوو. ئەلیس پول دەقی ریفۆرمەکەی نووسی و خستیەڕوو کە هەرزوو ناوی "ریفۆرمی مافە یەکسانەکان"ی وەرگرت. دەقی پێشنیارکراو ئەمەبوو: "پیاوان و ژنان لە سەرتاسەری ویلایەتە یەکگرتووەکان و هەموو ئەو ناوچانەی دەکەونە ژێر فەرمانڕەواییەکەیەوە لە مافە یەکسانەکان بەهرەمەندن" دەقی ریفۆرمەکە لەلایەن دانیل ئەنتۆنی برازای سۆزان ئەنتۆنی لە ١٠ی دیسامبەری **١٩٢٣** لە کۆنگرەدا خرایەڕوو. ئەم ریفۆرمە یەکسانی بەسەر هەموو کایەکاندا گشتاند، لەوانەش کێشەکانی وەك تەڵاق، خاوەندارێتی، کارو... هتد[٤٦].





ریفۆرم رووبەڕووی دژایەتی هەندێ لە ڕێبەران و ڕێکخراوەکانی ژنان بووەوە. زۆر کەس ئەم ریفۆرمەیان بە مەترسی لەقەڵەم دەدا لەبەر هەموو ئەو یاسایانەی تایبەتن بە پشتیوانی ژنان. فلۆرانس کۆلی پێیوابوو ریفۆرمی مافە یەکسانەکان بەمانای دروستکردنی بەربەستێکە لەبەرامبەر بزاڤی ژنانو مایەپوچکردنی بیست ساڵ تێکۆشان بۆ بڕیاردان لەسەر یاسا کرێکارییەکان[٤٧]. بەرپرسانی لیگی یەکێتی کرێکارییەکانی ژنان پێیانوابوو تەنیا ئەو ژنانەی هیچ کارێکیان نییە یاخود هەندێ کاری تایبەتی دەکەن پشتیوانی لەم ریفۆرمە دەکەن و جیاوکە تایبەتییەکانی ژنە کرێکارەکان سوودیان پێ ناگەینن. هەندێکیشیان ریفۆرمیان بە زێدەڕۆییەك دەبینی (ماری ئەندرسۆن لە نووسینگەی ژنان، وەك "فیمنیزمی هیستری" وەسفی کرد.)[٤٨] هەندێ لە رکابەرانیش پێیانوابوو کە نایەکسانییەکانی نێوان ژنان و پیاوان دەبێت بەرەبەرە بەدرێژایی کات کەم ببنەوەو نابێت بە دوای ئەوەوە بین هەندێك لە پشتیوانییە نەریتییەکانی ژنان وەك وەزیفەی یاسایی پیاو لە پشتیوانی کردنی خێزان یاخود نەفەقەی ژن بەجارێك نەمێننو جۆرێك لە "فەوزای یاسایی" دروست ببێت.[٤٩]

حزبی نەتەوەیی ژنان لایەنگری سەرەکی ئەم ریفۆرمە بوو و ساڵانە دەیبردە کۆنگرێس. ئەم تێگەیشتنە لە نێو لایەنگرانیدا هەبوو کە ئەم ریفۆرمە دەبێتە هۆی "رزگاری" تەواوی ژنان[٥٠]. هەندێك لە ڕێکخراوەکانی ژنان وەك "لیگی ژنە بە رەگەز ئەلبانییەکان" و "کچانی شۆڕشی ئەمریکا"[٥١] پشتیوانیان لێدەکرد. بەڵام بە گشتی، هەر زۆر زوو دەرکەوت حزبی نەتەوەیی ژنان تاکە ڕێکخراوی کارای ژنانە پشتیوانی لە ریفۆرم دەکات.

***یەکسانی لە کارو دەرفەتەکانیدا:*** وێڕای ئەوەی هەندێ لە ڕێبەرانی بزاڤی ژنان لە سەدەی نۆزدەیەم کارکردنی ژنانیان وەك بەدیلێك بۆ شووکردن دەبینی، لە نێو زۆر لە فیمینیستەکانی دەیەی ١٩٢٠ دا گوزارەی "کار لەتەك شووکردن" دا لەئارادا بوو. زۆر لەو ژنانەی کاریان هەبوو وەك چەند سیمبولێکی سەرکەوتوو لە بەکارهێنانی هەماهەنگی نێوان کارو شووکردن ناودەبران. یەکێك لە ئامانجەکانی "دامەزراوەی



پەیوەندییە پیشەییەکانی ژنان" کە لە ساڵی ١٩٢٩ دامەزرا، دروستکردنی "هەماهەنگی نێوان ماڵو حەزە پیشەییەکانی ژنان" بوو[٥٢]. هەڵبەت لە تەك ئەم بۆچوونەدا، تێڕوانین بۆ کارکردن وەك بەدیلی شووکردن لەئارادا بوو.

بە گشتی، لەم دەیەیەشدا وەك سەردەمی پێش بەدەستهێنانی مافی دەنگدان، ژنان هەم لە رووی بەدەستهێنانی کار- بەتایبەتی ئەو کارانەی ئەگەری پێشکەوتنیان تیادا هەبوو- رووبەڕووی سنووورداری دەبوونەوەو هەمیش لە هەلومەرجی هاوشێوەدا لە حەقدەستێکی کەمتر بە نسبەت پیاوان سوودمەند دەبوون. ئەمە تەنیا پەیوەندی بە سیاسەتی سەرکارەکانەوە نەبوو، بەڵکو پەیوەندی بە سیاسەتەکانی دەوڵەتی فیدراڵیشەوە هەبوو. ژنە مافپەروەرەکان سەرەڕای قبووڵکردنیان وەك پسپۆڕ لە ئەزموونی بەکارهێنانی ولاتدا، وەك کارمەندی سادە لە ولاتدا سوودیان لێ وەرگیرا، ئەو ژنانەی پسپۆڕبوون و کاریان لە کۆنگرەدا دەکرد داهاتیان کەمێك زێتر بوو لە نیوەی موچەی مانگانەی پیاوان، لە خەزنەداریدا، زۆرترین حەقدەستی ئەو ژنانەی کاریان دەکرد تەنانەت زۆر کەمتر بوو لە حەقدەستی ئەو ژنانەش کە لە کۆنگرەدا کاریان دەکرد[٥٣].

بەلای لایەنگرانی یەکسانی ژنانو پیاوانەوە لە کایەی ئابووریدا، ئەوەی پێویست بوو بۆ بەدەستهێنانی یەکسانی، نەهێشتنی ئەو یاسایانە بوو کە پشتیوانیان لە ژنان دەکرد[٥٤]. ئەم جۆرە داواکاریانە تەواو دەکەوتنە بەرامبەر داواکارییە پشتیوانییەکانی ریفۆرمخوازان. لایەنگرانی یەکسانی کار پێیانوابوو ئەو یاسایانەی جیاکاری دروست دەکەن لە شێوەی یاساکانی پشتیوانیکردن، دەبنە هۆی سنووردارکردنی توانای رکابەری ژنان لەگەڵ پیاوان لەکاردا و ئەمەش لە بەرژەوەندی پیاواندایە[٥٥].هاریت بلاچ بەتوندی پێیوابوو کە "پشتیوانیخوازی" بەشێوەی کەمکردنی کاژێرەکانی کار یاخود قەدەغەکردنی کاری شەوانە بە هیچ شێوەیەك لە بەرژەوەندی ژناندا نییەو لە بنەڕەتدا پشتیوانی نییە، چونکە بەپشت بەستن بەهەمان یاساکانی "پشتیوانی"یە کە " ژنەکانیان بە ئاراستەی کارە خراپترەکان بردوون، توانای بە دەستهێنانی داهاتیان بۆ





ئەوان سنووردار کردووەو هەندێجار ئەوانیان بەگشتی لە پۆلێکدا دەرکردوون" وا بەڵگە دەهێنرێتەوە کە یاسا پشتیوانییەکان دەبنە هۆی ئەوەی پیاوان کارە سەرنج ڕاکێشترەکان پاوان بکەن‌و لە ئەنجامدا دەبێت ژنان بەهەوڵدان لە ڕێگەی نەهێشتنی یاساکانی پشتیوانی، دەرفەتەکانی کاری خۆیان زێدە بکەن(٥٦).

سەرەڕای ئەوە لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٢٠ بەدواوە هەوڵدرا ڕێگە بۆ چوونی ژنان بۆ نێو ئەو کارانەی بەکاری پیاوان سەیریان دەکرا خۆش بکرێت. لە ساڵی ١٩٢٦ ئانیتا فیلیپس(٥٧) کە خۆی لە سوپادا بەرپرسیاریەتییەکی ناعەسکەری هەبوو، پرۆژەیەکی بۆ دامەزراندنی لەشکری خزمەتگوزاری ژنان(٥٨) داڕشت وەك بەشێکی سوپا هاوشان بە ڕێنماییە تەواو عەسکەرییەکان و پێکهێنانی شانەو یەکەکان لەژێر فەرماندەیی ئەفسەرانی ژن. هەڵبەت فەرماندەیی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەم پێشنیارەی ڕەتکردەوە. ساڵی ١٩٢٨ پرۆژەی پەلکێشکردنی ژنان بۆ نێو سوپا پێشنیارکرا، بەپێی ئەو پرۆژەیە ژنان بە ئەنیفۆرم و جیاوکی هاوشێوەی پیاوان دەچنە نێو سوپاوە. هەڵبەت ئەم پرۆژەیەش تا سەرەتاکانی دەیەی ١٩٣٠ لە نێو دامەزراوەو کەسە جیاوازەکاندا لە هاتووچوودا بوو و سەرەنجام هەڵپسێردرا(٥٩).

***چالاکی‌و داواکارییە خۆشگوزەرانییەکان:*** زۆر لە ژنە چالاکەکان لە بزاڤی ژناندا بە تایبەتی فیمینیستە کۆمەڵایەتییەکان کە زێتر پەیوەندیان لەگەڵ ژنانی چینەکانی خوارەوە هەبوو، پێیانوابوو کە چەوساندنەوەی دووقاتی ژنان پێویستی بەبایەخدانی تایبەتییە پێیان و بەدەستهێنانی پشتیوانییە یاساییەکان بۆیان. فلۆرانس کۆلی پێیوابوو دەبێت پشتیوانی لە ژنان بکرێت چ خۆیان "بیانەوێت یان نەیانەوێت"(٦٠).

لیگی ژنە دەنگدەرەکان زێتر بایەخی بە دابینکردنی خۆشگوزەرانی ژنان‌و منداڵان دەدا. لەو بابەتانەش گەلێك خەباتی لە پێناویاندا دەکرد: حەقدەستی یەکسان، کاژێرەکانی کارو کارکردنی منداڵان بوون. لیگ لە سەرەتای دەیەی ١٩٣٠، ٣٠٤ یاسای بە مەبەستی چاکسازی لەبەرچاو گرتبوون کە زێتر لە نیوەیان پەیوەندیان بەکاری منداڵانەوە هەبوو تەنیا ٢٥ یاسا تایبەت بوون بە ژنان(٦١).





لیگی نەتەوەیی بەکاربەران، لیگی ژنە دەنگدەرەکان‌و یەکێتی کرێکاری ژنان ئاڵاهەڵگرانی سەرەکی خستنەڕووی ئەم داواکاریانە بوون. ئەوان زێتر لەوەی بەدوای یەکسانییەوە بن بۆ ژنان، یەکسانیان بە زیانی ژنان دەبینی‌و دەیانویست پشتیوانی یاسایی تایبەتی لە ژنان بکرێت. لە ئەنجامدا داواکارییەکانی وەك دیاریکردنی کەمترین ڕادەی حەقدەست، هەموارکردنی کاژێرەکان‌و هێورکردنی هەلومەرجی کار بۆ ژنان، دەخستنەڕوو، هەروەها نوسینگەی ژنانی وەزارەتی کار بەڕێبەری ماری ئەندرسۆن پشتیوانی ئەم جۆرە داواکاریانەی خۆشگوزەرانی‌و پشتیوانی تایبەتی لە ژنان بوو(٦٢). لە دەیەکانی دواتریش ئەلینۆر ڕۆزڤێلت (Eleanor Roosevelt) هاوسەری سەرۆك ڕۆزڤێلت کە هاوکاری لەگەڵ فیمینیستە کۆمەڵایەتییەکان هەبوو و لایەنگریی لە یاساکانی پشتیوانی دەکردو پێیوابوو دژایەتی حزبی نەتەوەیی ژنان لەگەڵ ئەم یاسایانە [کارێکی] "تەواو پاشڤەڕۆیانەیە"(٦٣).

زۆر لە فیمینیستەکان لەم دەیەیەدا بوونە خوازیاری ئەوەی بێوەژنەکان‌و ئەو ژنانەی وازیان لێ هێنراوە پشتیوانییەکی تایبەتیان لێ بکرێت، هەندێ کەس جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ژنە خاوەن منداڵەکان نابێت ناچاری کارکردن بن‌و ئەرکی دەوڵەتە حەقدەستێکی یەکسان بە حەقدەستی ئەو ژنانەی کاردەکەن بەدایکان بدات‌و ئەوان بتوانن سوودمەندبن لە چەند جیاوکێکی تایبەتی لەو کاتانەی منداڵیان لەزگدایە، منداڵیان دەبێت‌و منداڵ بەخێو دەکەن. هەروەها پرۆژەی پێویستی دامەزراندنی داینگە بۆ منداڵانی ئەو ژنانەی کاردەکەن خرایەڕوو. سەرەڕای ئەوە داواکارییەکانی وەك دابینکردنی خۆراك‌و شیر، تەندروستی‌و خانوو و .... هتد پێشکەش کران. "سەندیکای هاوکاری ژنان"(٦٤) خوازیاری ئەوەبوو کاربەدەستە ناوچەییەکان خزمەتگوزارییە تایبەتییەکانی خۆشگوزەرانی وەك ناوەندەکانی خۆشگوزەرانی بۆ دایکان‌و جلشۆری بۆ ژنە کرێکارەکان دەستەبەر بکەن(٦٥).

***کۆنترۆڵی منداڵبوون‌و فێرکردنی خێزانەکان:*** ئەو جەخت کردنەوەیەی هەندێك لە فیمینیستە ڕادیکالەکان هەیانبوو لە ماوەی خەباتی شەپۆلی یەکەمدا لەمەڕ

"کۆنترۆڵی ژنان لە سەر جەستەی خۆیان"و، لەسەر هەمان بنچینە خوازیاری کۆنترۆڵی لە دایکبوونو بڕیاردانی ژنان خۆیان بوون، لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٢٠دا رەهەندێکی باوتری وەرگرت. رێبەرانی ئەم رەوتەو بەتایبەتی مارگرێت سینگەر زێتر جەختیان لەسەر لایەنی تەندروستیو پزیشکی کۆنترۆڵی منداڵبوونیان دەکرد. پەیرەوانی ئەم رەوتە زۆر زۆرتربوون لە پەیرەوانی رەوتی "کۆنترۆڵی ژنان لەسەر جەستەی خۆیان"و تەوەری سەرەکی چالاکیان بریتی بوو لە فێرکردنی گشتی و وتوویژو پرسو را بۆ بەیاساییکردنی کۆنترۆڵی منداڵبوون بە رێنمایی پزیشکان. فێرکردنی دایكو باوك لەپێناو پەروەردەی "زانستیترو" باشتری منداڵان یەكێك بوو لەو کایانەی ژنان لەو ماوەیەدا بایەخیان پێدەدا.. لەم کردانەدا هەڵبەت ژنان چالاکییەکانی ناویانی پاوان نەکردبوون، بەڵکو رێبەرو پشتیوانە سەرەکییەکانیان بوون، سوود لە هاوکاری مامۆستایانی زانکۆکان لە بەشەکانی کۆمەڵناسیو دەروونناسیو خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی بۆ بەدەستهێنانی وێنەیەکی دروست لە جۆری پەروەردەی منداڵان وەردەگیرا.[٦٦]

***ئاشتی و لەچەك داماڵین:*** لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا هەندێ لە گروپە فیمینیستەکانو لایەنگرانی بزاڤی ژنان لە دژی چوونی ئەمریکا بۆ ناو شەڕبوونو وەك بوونەوەری ئاشتیخواز پێناسەی ژنانیان دەکرد، بە پێچەوانەوەی پیاوان، کە بە درێژایی مێژوو خەریکی شەڕو تۆڵەکردنەوە بوونە، ژنان خوازیاری ئاشتی جیهانین. ئالیس پارك، یەكێك لەوانەی لەپێناو ئاشتیدا خەباتی دەکرد، هەمیشە جەختی دەکردەوە "یەکەم ئامانجی من هەمیشە فیمنیزم"ە. بەڵام لە هەمان کاتدا لەبەرئەوەی "جەنگ شوك بۆ ژنان دروست دەکات"، پێیوابوو فیمینیستەکان دەروەستن بەوەی لە رێی ئاشتیدا تێبکۆشن. سەرەڕای ئەوە، بەبڕوای ئەو، ئەوەی رێکخراوەکانی ژنان دەتوانن لەڕێی ئاشتی جیهانیدا ئەنجامی بدەن لە توانای هیچ کەسێکی دیکەدا نییە، یەکێکی دیکە لە پاڵنەرەکانی فیمینستەکان لە دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان ئامانجە ئاشتیخوازەکانو فیمنیزمدا ئەو گوزارەیە بوو کە پێشکەوتنو ئاسایشی ژنانو



ئەنجامدانی ریفۆرمە سەرتاپاگیرەکان لە هەلومەرجی هەرەشەی شەڕی مۆدێرندا[٦٧] مومکین نین.[٦٨] دوای شەڕیش هەندێ لە رێکخراوەکانی ژنان بە مەبەستی هاوکارییە نێونەتەوەییەکان هەوڵیان بۆ بەرەو پێش بردنی ئاشتی دەداو لەناوەوەش پشتیوانیان لە سیاسەتەکانی ئاشتی و لەچەکداماڵین دەکردو ئەم کایەیەیان بە باشترین گۆڕەپان بۆ سوودوەرگرتن لە مافە سیاسییە نوێیەکانی خۆیان لەقەڵەم دەدا.

بایەخدان بە لەچەکداماڵینی جیهان لە رێکخراوەکانی ژناندا شوێنێکی تایبەتی هەبوو وێڕای ئەوەی کە ئالیس پول دژی پەرژانە سەر هەر مەسەلەیەك بوو جگە لەو مەسەلانەی راستەوخۆ پەیوەندیان بە مافەکانی ژنانەوە دەبێت، بەڵام لە حزبی نەتەوەیی ژناندا زۆر لە ئەندامان پێیان وابوو دەبێت حزب بۆ لەچەکداماڵینی جیهان چالاکی بنوێنێتو بزاڤێکی ئاشتی نێونەتەوەیی ژنان رێکبخات. سارا بارد فیلد[٦٩] لەو بڕوایەدا بوو "ئاشتی جیهانی گرنگترین مەسەلەیەکە کە دەبێت ژنان بپەرژێنە سەری"[٧٠]. لیلیان کەر[٧١] پێیوابوو "ئێمە دەتوانین هەروەك چۆن مافی دەنگدانمان سەپاند، بە گوشاری خۆمان جەنگیش لەناو ببەین" ئەو پێیوابوو کە لە بنەڕەتدا شەڕ لەناو ناچێت "مەگەر ئەوەی ژنان کارێك بکەن". بیل کاس لافۆلەت[٧٢] لەو بڕوایەدابوو بەپشتبەستن بە دۆخی تایبەتی ژنانو دەرکی فیمینیستیانەی ئەوان، ((ئاپۆرە گەورەکانی ژنان هەست دەکەن مافی ژنان، واتە رزگاری چەشنی [مرۆڤ] لە لەناوچوون بزاڤێکی فیمینیستییە)). هەروەها تەنانەت ئەوانەی دژی بایەخدانی حزبی ژنان بوون بە مەسەلەی لەچەکداماڵین لە کەسە چالاکەکانی لایەنگیری ئاشتی بوون، بەڵام لەو بڕوایەدابوون لەڕووی رێکخراوەییەوە، حزبی ژنان نابێت خۆی گیرۆدەی مەسەلەکە بکاتو پێویستە رێکخراوەکانی دیکە بەدوای ئەم ئامانجەدا بچن.[٧٣]

## کایەکانی چالاکی

بە هەمان شێوەی لە لاپەڕەکانی پێشتردا ئاماژەی پێکرا، کایەی چالاکی ژنان، لە ماوەی هەڵپەساردندا بە گشتی لە چوارچێوەی میکانیزمو ئامرازەکاندا بەدامەزراوە ببوو و کەمتر پەنایان بۆ کردە راستەوخۆکانی وەك خۆپیشاندانو رێپێوانو... دەبرد.





دوو تەوەری سەرەکی چالاکی لەم ماوەیەدا، پیادەکردنی نفووز لە دامودەزگا حکومییەکان لە ئاستە جیاوازەکانی سیاسەتگوزاریو سوودوەرگرتن لە توانا نوێکان واتە مافی دەنگدانو هەڵبژاردن بوون.

**پیادەکردنی نفووز لە کۆنگرەو دامەزراوە حکومییەکاندا**

بە درێژایی سەدەی بیستو بەتایبەتی نیوەی یەکەمی، هەندێك لە ڕێکخراوە کۆنەکانی ژنان - هەندێکیان بەناوی نوێ - بۆ سەپاندنی پرۆگرامە فیمینیستییەکان لە واشنتۆنو ویلایەتەکان چالاکیان دەنواند. حزبی نەتەوەیی ژنان جەختی لەسەر شێوازی "دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ پیاوە سەرەکییەکان" کردەوە. ئەمە ئەو شێوازە بوو کە لە خەباتکردن بۆ مافی دەنگدان وەك پرسو را لە ئاستی ویلایەتو فیدرالدا سوودی لێ وەردەگیرا. لەم ماوەیەدا حزب سوودی لەم تەکنیکە وەردەگرت بۆ خستنەڕووی چاکسازی مافە یەکسانەکان "لۆبیستەکان" "گوشار هێنەران"ی حزبی نەتەوەیی ژنان راستەوخۆ بۆ لای یاسادانەران، فرمانڕەواکانو سەرۆك کۆمارەکان دەچوون نەك پێگەی کۆمەڵایەتیان". گرتنەبەری ئەم شێوازە بەو مانایە بوو کە بڕواهێنان بەرێبەرانی دامەزراوە سەرەکییەکان لە پێشترە لە بڕواهێنان بە رای گشتی یاخود جەماوەری خەڵك.(٧٤)

یەکێك لە درێژخایەنترینی ئەم کردانە بەردەوامی مکووڕانەی حزبی نەتەوەیی ژنان بوو لەبارەی چاکسازی مافە یەکسانەکان. ساڵانە حزب چاکسازی دەبردە کۆنگرە تاکو بڕیاری لە بارەوە بدرێتو وێڕای ئەوەی تاکو سەرەتای شەپۆلی دووەمی بزاڤی ژنان ئەم چاکسازییە بڕیاری لەسەر نەدرا، حزب وەکو خۆی ساڵانە لەم بارەیەوە پێی دادەگرت. سەرەڕای ئەوەش، بەلای کەمەوە لە سێ حاڵەتدا لە ساڵەکانی ١٩٤٦، ١٩٥٠ و ١٩٥٣ بەجیدی لێی کۆڵرایەوە.(٧٥)

ڕێکخراوەکانی دیکەی ژنانیش بۆ بەرەوپێش بردنی ئامانجە جۆراوجۆرەکانی خۆیان پەنایان بۆ ئەم شێوازە دەبرد. لەو کایانەی ژنان بۆ بەرژەوەندیان وتووێژیان ئەنجامدەدا



قەدەغەکردنی کاری منداڵان، پشتیوانی لە دایکانو منداڵانیان، پەرەدان بە مافە مەدەنییەکان کە ژنانیش بگرنەوە لەپێناو ئامادەبوونیان لە دەستەی ڕووبەڕووبوونەوەی پلەوپایە حکومییەکانو هەروەها بڕیاردان لەسەر چاکسازی مافە یەکسانەکان بوو.

ڕێکخراوەکانی ژنان کە لە لیگی ژنە دەنگدەرەکان، لیگی نەتەوەیی بەکاربەران، لیگی نەتەوەیی یەکێتییە کرێکارییەکانی ژنان، کۆمەڵەی ژنە زانکۆییەکانی ئەمریکا، فیدراسیۆنی گشتی یانەکانی ژنان بۆ قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکان، کچانی شۆرشی ئەمریکاو کۆمەڵەی ژنە لاوە مەسیحییەکان پێکدەهات. لە واشنتۆن بۆ وتوێژکردن لەگەڵ کۆنگرێس ئیئتیلافیان پێکهێناو "کۆمیتەی پەرلەمانی هاوبەشی ژنان"(٧٦) یان دامەزراند. توندی و بەربڵاوی چالاکی وتووێژی ژنان لە واشنتۆن بە رادەیەك بوو کە کۆمیتەی پەرلەمانی وەك "بەهێزترین لۆب لە واشنتۆن" دەناسرا(٧٧). لە ماوەی دەیەکانی دواتریش ئەم چالاکیانە بەردەوام بوون.

ڕێکخراوەکانی ژنان لە ئاستی ویلایەتیشدا بۆ هێورکردنەوەی رەوشی ئەو ژنانەی کاریان دەکرد گوشارگەلێکیان دەخستە سەر دەسەڵاتی یاسادانانی ویلایەتو توانیان زۆرترین کاژێرەکانی کاری ژنان سەرەتا بۆ دە سەعاتو دواتریش بۆ هەشت سەعات کەم بکەنەوە. سەرەڕای ئەوەش، بڕیارگەلێك بۆ هێورکردنی هەلومەرجی کار لە رووی تەندروستی و کەمترین رادەی حەقدەستو هەروەها قەدەغەکردنی زێدەکاری ناچاری و کاری شەوانە پەسەند کران.(٧٨)

لەچەکداماڵین یەکێك بوو لەو کایانەی ژنان بۆ بەرەوپێشبردنی ئامانجەکانیان تیایدا پەنایان بۆ کردەکانی وەك پیادەکردنی نفووزو پرسوڕا دەبرد. کۆمیتەی ژنان بۆ لەچەکداماڵینی جیهان بە هاوکاری یەکێتی ژنانی مەسیحی بۆ قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەهولییەکان، فیدراسیۆنی نەتەوەیی یانەکانی ژنە پیشەکارو بارزگانەکان، لیگی ژنە دەنگدەرەکانو گروپە کەنیسەییو زانکۆییەکان گوشاریان دەخستە سەر سەرۆك کۆماری ئەمریکا بۆ بەستنی کۆنفرانسێکی جیهانی بۆ لەچەکداماڵینو هەروەها بۆ سەر کۆنگرێس بۆ کەمکردنەوەی گوژمە سەربازییەکان.





هەنگاوەکانی ژنان بێ کاریگەری نەبوون لە بەستنی کۆنفرانسی لەچەکداماڵین لە واشنتۆن بۆ سنووردارکردنی چەکی هێزی گەورەکان و، چەند ژنێکیش بە ئەندامی کۆمیتەی راوێژی دەستەی نێردراوی ئەمریکا بۆ ئەم کۆنفرانسە دانران.[٧٩]

**بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و بەدەستهێنانی پلەوپایە حکومییەکان**

بەگشتی بەدرێژایی دەیەی ١٩٢٠ وا دەردەکەوێت ژنان سەرەڕای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان و مافی هەڵبژاردنیان بە نوێنەرو سیناتۆر، هێندە پەرۆشی سوودوەرگرتن لەم دەرفەتە نەبوون. ژنان کەمتر لە پیاوان مەیلی بەشداریکردنیان لە هەڵبژاردندا لەخۆ پیشاندەداو لە هەڵبژاردنی خۆشیان لە زۆر باردا پشتیوانیان لە کەسە دژە فیمینیستەکان دەکرد.[٨٠] لە ساڵی ١٩٢٠ لە نیویۆرك ژنان تەنیا لە سەدا ٣٥ دەنگەکانیان هەبوو، لە ئیلینۆ لە سەدا ٤٦,٥ ژنان دەنگیاندا. لە هەڵبژاردنی شارەوانی شیکاگۆدا لە سەدا ٧٥ ئەو کەسانەی دەنگیان نەدا، ژن بوون. هەڵبەت بەگشتی دەیەی ١٩٢٠ بە دەیەی ئاوابوونی بەشداری سیاسی هاوڵاتیان دەبینرێت و پیاوانیش بەنیسبەت جاران کەمتر بەشداریان لە هەڵبژاردندا دەکرد. لە هەڵبژاردنی دەیەی ١٩٢٠ تەنیا نزیکەی نیوەی ئەوانەی مەرجی دەنگدانیان هەبوو دەنگیاندا. لە کاتێکدا ئەم رێژەیە لە سەدەی نۆزدەیەم لە سەدا هەشتابوو. سۆزان لافۆلەت لە ساڵی ١٩٢٦ گوتی "بەخترەشی بزاڤی ژنان ئەوە بوو کە بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بۆ ژنان لە کاتێکدا سەرکەوت کە مافە سیاسییەکان بەهایەکی زۆر کەمتریان هەبوو لە بەهای خۆیان لە سەدەی هەژدەدا"[٨١] رەنگە بشتوانین بڵێین تا رادەیەکیش هەر لەبەر ئەوە لەم ماوەیەدا مافی دەنگدان بە ژنان بەخشرا. هەرچۆنێك بێت، لە دەیەکانی دوای بەخشینی مافی دەنگدانیش، تەنیا نزیکەی یەك لە سێی ژنان سوودیان لە مافی دەنگدان وەردەگرت‌و لەسەر هەمان بنچینەش، هەندێك لەو بڕوایەدان مافی دەنگدان لە رووی سیاسییەوە "رووداوێك"ی بەبایەخ نەبوو.

شێوازی دەنگدانی ژنانیش هۆی نیگەرانی فیمینیستەکان بوو. فرانك کێنت[٨٢] لە کتێبی رەفتاری سیاسیدا نووسی "خەمی ژنانت نەبێت. راستی ئەوەیە هیچ شتێك



بەناوی هاوبەستەیی رەگەزی لە سیاسەتدا نییە". ژنان وەکو یەکتر نەبوون، پێکەوە دەنگیان نەدەداو هەمیشە پێیان باشتر بوو پەیڕەوی لە پیاوان بکەن نەك لە ژنان. ژنان لە کردەی سیاسی خۆیاندا وەك پیاوان بوون هەمان خاڵە لاوازەکانیان هەبوون.[٨٣] گۆڤاری *ویلایەتی ئیلینۆی* نووسی ژنان تەنیا کاتێك دەنگدەدەن کە مەسەلەکە لە رووی شەخسی یاخود خێزانییەوە بۆیان گرنگ بێت. وا دەردەکەوێت ژنان لە دەنگداندا پاشکۆی باوك و هاوسەرەکانیانن و تەنیا لەبارەی مەسەلە ئەخلاقییەکانی وەك قەدەغەکردنی گەندەڵی یاخود قەدەغەکردنی سوودوەرگرتن لە خواردنەوە ئەلکەحولییەکان دەنگ بەکارمەندە "ئەخلاقیترەکان" دەدەن، بەڵام بەهەرحاڵ، دەنگدانی ژنان وەك ژن‌و لەسەر بنچینەی رەگەز نەبوو[٨٤] ئەم رەوشە بە رادەیەك فیمینیستەکانی نیگەران و نائومێد کردبوو کە ئالیس ستۆن بێلکوێل لە ساڵی ١٩٢٩ بۆ کاری کاتی نووسی "راستی گوتەی نەمری خاتوو پۆیزەر[٨٥] لەو بارەیەوە کە ژنان دەبەنگن، چونکە خوا ویستوویەتی لەم رێیەوە ئەوان بە گونجاو بۆ پیاوان دروست بکات، دەسەلمێت".[٨٦]

هەڵبەت هەندێ کەس لە بزاڤی ژناندا روونکردنەوەو رێگەچارەیان بۆ ئەم گرفتە هەبوو. بەبۆچوونی ئان مارتین[٨٧] ژنان لە ئەنجامی ئەو رێنماییانەی بە درێژایی سەدەکان پێیان بەخشراون دووچاری "گرێی خۆبەکەمزانی" هاتوون کە دەبێتە رێگر لە بەردەم ئەوەی بە یەکسانی بگەن. فرانسیس کیلۆریش[٨٨] پێیوابوو ژنان پشت بەخۆ نابەستن. هەندێ لە فیمیسنیتەکان لەسەر ئەم بنچینەیە پێیانوابوو کە دەبێت حزبێکی ژنان دامەزرێت تاکو پشتیوانی لە پالێوراوە ژنەکان بکات.[٨٩] بەڵام ئەم گروپە جیاوازیخوازە پێیوابوو نابێت ژنان پەیوەندی بەو حزبانەوە بکەن کە لە ئارادان، چونکە سیاسەتی حزبی "لە جەوهەردا گەندەڵەو نابێتە هۆی رزگای (ژنان) ئەوان" و دەبێتە هۆی ئەوەی "ژنان واز لە ئامانجە ریفۆرمیستەکانیان بهێنن‌و لەم رێگەیەوە رۆڵی تایبەتیان لە سیاسەتدا لەناودەچێت". یەکێك لە راڤەکاران لە ساڵی ١٩٢٢ بە ئاوازێکی زۆر توند نووسی "ئەو ژنەی پەیوەندی بە یەکێك لەم حزبانەوە بکات بەتەواویی دەبێتە لاساییکەرەوەی





پیاو... لەوە بەدوا ئەو ژنە شتێك نابێت جگە لە برغوێك لە ئامێرێكی كۆن و لەبەریەك هەڵوەشاو، ئەو تاكە ئامانجەی دەكرێ لێی دەرك بكەین پاراستنی چەند كەسێكی خراپەكارە لە كاربەدەستە سیاسییەكان". ئان مارتین پێیوابوو دامەزراندنی ئەو حزبە بۆ گەیشتنی ژنان بە یەكسانی پێویستە. فیمینیستەكان بەم مەبەستە چەند هەنگاوێكیان نا. كۆمیتەی پەرلەمانی هاوبەشی ژنان كاریگەرترین بازووی سیاسی ئەوان بوو و چالاكییەكانی ژنانی بەمەبەستی وتووێژو پرسوڕا ئەندامەكانی كۆنگرەی هەماهەنگ دەكرد.[٩٠]

لە بەرامبەردا، هەندێ لە فیمینیستە چالاكەكان لە لیگی ژنە دەنگدەرەكاندا داوایان لە ژنان دەكرد لە چوارچێوەی حزبە دیموكراتو كۆماریخوازەكاندا چالاكی بنوێننو، لەم رێگەیەوە هەم كاریگەری بخەنەسەر سیاسەتی حزبیو هەم سەر سیاسەتگوزاری لە چوارچێوەی سستەمی سیاسیدا.[٩١]

*ژنەكان لە كۆمیتەی ژنان بۆ كردەی سیاسی* جارێكیش چوونە نێو ململانێی هەڵبژاردنی سەرۆك كۆمار. بەسەرنجدان لە تێڕوانینە ریفۆرمخوازو ئابوورییەكانی سیناتۆر لافۆلەتو لایەنگری ئەو لە نەهێشتنی جیاكاری لە دژی ژنانو لە هەمان كاتدا داڕشتنی یاسای پشتیوانی لە ژنان لە حاڵەتە پێویستەكاندا، كۆمیتە پشتیوانی لەو كرد بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك كۆمار و، وێڕای ئەوەی لافۆلەت دەنگی پێویستی بەدەستنەهێنان، بەڵام رێژەی دەنگەكانی زۆر بەرزبوونو لە گشت وڵاتدا یەك لە شەشی تاكەكان دەنگیان پێدا هەرچەند لە زۆر ویلایەت ناوی ئەو لە كارتەكانی دەنگداندا نەبوو.[٩٢]

بەڵام سەرەڕای ئەم حاڵەتەی چالاكی راستەوخۆ، ژنان بە مەبەستی پیادەكردنی مافی دەنگدان هێندە چالاك نەبوونو هەروەها هەوڵەكانی فیمینیستان لەم ئاراستەیەدا هێندە سەركەوتوو نەبوون. ئامادەیی ژنان لە كارە پرۆسەیی و هەڵبژاردنیەكان تارادەیەك سنووردار مایەوەو زێتر رەهەندێكی رەمزی هەبوو، سەرەڕای ئەوە، ئەم ژنانە بەزۆری پرۆگرامێكی فیمینیستیان نەبوو و كەمتر وەك "ژن"ێك دەچوونە نێو سیاسەتەوە. ئەو ژنانەی وەك نوێنەر هەڵبژێردران بە زۆری (دوو لە سێیان) بێوەژنی نوێنەرە پیاوەكان



بوونو لە دوو كاربەدەستی ژن یەكێكیان جێنشینی هاوسەرە مردووەكەی بوو، تاكە ژنی سیناتۆر لەم دەیەیەدا رێبیكا فیلتۆن[٩٣] هەروەها تەنیا بۆ پڕكردنەوەی شوێنی خاڵی هاوسەرە مردووەكەی بۆ ماوەی سەعاتێك بووە سیناتۆر.[٩٤]

بە گشتی لە دەیەی ١٩٢٠ دوای ئەوە نە سیاسەتی سەربەخۆخوازیو نە سیاسەتی پەیوەندیكردن بەو حزبانەی لە ئارادابوون هێندە كاریگەری نەبوو لەسەر سیاسەتو حكومەت لە ئەمریكا. بەهەمان شێوەی كات دەڵێت ناتوانین بڵێین ئەم یان ئەو پرۆگرامە "فیمینیستی تر" بوو، بەڵكو دەبێت ئەوە پەسەند بكەین كە هەردووكیان بەكردەوە ناسەركەوتووبوون. دەبێت لە سەرنەكەوتنی ژناندا لەوەی وەك بلۆكێكی یەكپارچە كار بكەن، بەدوای هۆیەكدا بگەڕێین.

**زەمینەكانی لەناوچوونی فیمینیزمو بزاڤی ژنان**

ئەو راستییەی كە بە درێژایی چوار دەیە دوای بە دەستهێنانی مافی دەنگدان، ژنان نەیانتوانی بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجە "فیمینیستی"یەكان بە هەر شێوەیەك كە پێناسە دەكرا بەبەردەوامیدان بە بزاڤ، سەركەوتنێكی بەرچاو بەدەست بهێنن و سەرەڕای ئەگەری بە دەستهێنانی رواڵەتی و رەسمی كۆمەڵگای سیاسی، تەنانەت نەیانتوانی لە چوارچێوەی سیاسەتی بەدامەزراوەبوودا بەباشترین شێوەی مومكین سوود وەرگرن، ئەنجامی چەند هۆكارێكی دەستنیشانكەر بوو: لێڵی گوتاری بزاڤی مافی دەنگدان و دواجار دەركەوتنی جیاوازی بیروڕا لە نێو فیمینیستەكان خۆیان، دروستبوونو سەرهەڵدانی جیاوازی لە نێو ژنان خۆیانو لە ئەنجامدا لاوازبوونی "ناسنامەی ژنانە"، نەگونجاوبوونی فەزای سیاسیو كۆمەڵایەتی بەسەرنجدان لە بونیادە سیاسییەكانی و گوتارە هەژموونییە سیاسیو كۆمەڵایەتییەكان. ئەم بەشە تایبەتە بە لێكۆڵینەوەی ئەو زەمینە ناهاوكارە بۆ لایەنگرانی چالاكییە كردەییەكانو نفووزی گوتاری فیمینیزم.





## لێلی گوتاری بزاڤی دەنگدان

### فیمنیزمی «جیاوازی» لە بەرامبەر فیمنیزمی "یەکسانی"دا

لە بەشی پێشوودا ئاماژ بەم خاڵە کرا کە شەپۆلی یەکەمی فیمنیزم هێندە پشت ئەستوو نەبوو بە بیروڕای تیۆری پوخت کە بتوانین دوا ئامانجەکانی بزاڤ و پانتایی ئەو گۆڕانکارییانەی مەبەست بوون لێیانەوە هەڵێنجێنین. لە دەیەکانی سەرەتای خەباتدا، ڕێبەرانی بزاڤ داواکاری و ئامانجەگەلێکی جیاوازیان بۆ ژنانو تەنانەت بۆ گشت کۆمەڵگا دەخستنەڕوو و خوازیاری گۆڕانکاری بنەڕەتی بوون لە ژیانو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا. بەڵام لەبەرئەوەی هەرگیز تەنانەت لەو سەردەمەیشدا تێگەیشتنێکی هاوبەشی تەواو ڕوونو دیار لە شێوەی ئەو گۆڕانکاریانەی مەبست بوون نەخرانەڕوو و زۆر لەو گۆڕانکارییانەی باڵەکان یاخود تاکەکەسە تایبەتەکان لە بزاڤدا دەیانخستەڕوو، ڕووبەڕووی پەرچەکرداری نەرێنیو ڕاشکاوانەی باڵێکی دیکە دەبوونەوە، بۆ ڕای گشتیو تەنانەت خودی پشتیوانە چالاکەکانی بزاڤیش ڕوون نەبوو کە پانتایی ئەو گۆڕانکاریانەی مەبەستن چەندەو دواتریش فیمنیزمو بزاڤی ژنان لە بنەڕەتدا چۆن پێناسە دەکرێن.

ئەو کاتەی کە لە دە یاخود پانزدەساڵی کۆتایی چالاکییەکان لە شەپۆلی یەکەمدا، بزاڤی ژنان بەکردەوە گۆڕا بۆ بزاڤی مافی دەنگدان لێلی گوتاریی تیایدا زێتر لە جاران دەرکەوت. مافی دەنگدان بەکردەوە ببوو بە چەمکی سەرەکی یاخود وشەی کلیلی گوتاری فیمینیستیو، ئەو بڕوایە لە جاران زێتر بەهێزدەبوو کە بەدەستهێنانی ئەو مافە خۆی لەخۆیدا وەك بەدیهاتنی ئامانجەکانی دیکەیە - ئەو ئامانجانەی کە جگە لە چوارچێوەی چەمکە گشتییەکاندا دیار نەبوو کە چین.

بە هەمان شێوەی لە زۆربەی لێکۆڵینەوەکاندا لەبارەی بزاڤ و شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکاندا دەخرێتە ڕوو، لێلی گوتاریی بزاڤێکی کۆمەڵایەتی لە ماوەیەکی کورتدا بە هۆکارێکی ئەرێنی بۆ سەرکەوتنی لەقەڵەم دەدرێت. لێلی لەو چەمکانەی



بەکاردەبران لەلایەن ڕێبەرانی بزاڤ - لە بزاڤی ژناندا، چەمکەکانی وەك ئازادی ژنان، یەکسانی ژنانو پیاوان، نەهێشتنی جیاکاری، مافە یەکسانەکان، ئیعتباری مرۆییو... دەبوونە هۆی ئەوەی گروپە جیاوازەکان دەربڕینو تەفسیرگەلێكو بە یەکێك لە دەربڕینەکان، بە"خوێندنەوەی" تایبەتی خۆیان لە مەڕ بزاڤ، پەیوەندی پێوە بکەن. لە ئەنجامدا، پێگەی پشتیوانی لە بزاڤ فرەوانتر دەبێتو دەتوانێت لە شێوەی چەترێکی سەرتاپاگیردا بۆ داپۆشینی داواکاری و چالاکییە جیاوازەکان کاربکات، لە ڕاستیدا، لە هەلومەرجی لێلی گوتاریدا ڕێگە لە بەردەم ئەکتیڤبوونی ناسنامە هێزەکییەکانی دیکە لە نێو ئەو گروپانەی بەشداریان لە بزاڤدا کردووە تا ڕادەیەك دادەخرێتو بە جۆرێك لە جۆرەکان دەتوانین بڵێین کە هەموو پێیانوایە تێگەیشتنی خۆیان لەو چەمکانەی کە دەخرێنەڕوو تێگەیشتنێکی گشتییە.

لە بزاڤی مافی دەنگدادا، بێدەنگی ڕێژەیی نوێنەرە ناسراوو سەرەکییەکانی بزاڤ لە مەڕ زۆر لە چەمکەکانو هەوڵدانیان بۆ پاراستنی یەکێتیو ڕەنگە زێتر لەو، توندی چالاکییە کردەییەکان کە جێگەیەکی زۆری بۆ تیۆردانەران نەدەهێشتەوە، لە هۆکارە کاریگەرەکانی لێلی گوتاری بزاڤ بوو. وێڕای ئەوەی لە ململانێکانی سەدەی نۆزدەیەم، هەندێ ژن لەوانەش ئیزادۆرا دانکن، ڤیکتۆریا وۆدهالو ئانارشیستەکان، کێشەکانی وەك ڕەتکردنەوەی هاوسەرێتیان دەخستەڕوو هەندێکیش وەك ئیما گۆڵدمانو شارلۆت پەرکینز گیلمەن بە ڕوونییەکی زێترەوە بە دوای یەکسانییەوە بوون لە نێوان هەموو کایەکان بۆ ژنانو پیاوان، بەڵام لە ساڵەکانی کۆتایی خەبات کە مافی دەنگدانیان تیادا بەدەست هات، کەمتر وتوویژ لە مەڕ ئەم کێشانە دەکرا، تەنانەت لە"یەکەمین کۆبوونەوەی جەماوەریی فیمینیستی" کە لە ساڵی ١٩١٤ لە نیۆیۆرك بەسترا، ناوونیشانی وتارەکان بابەتەکانی وەك مافی کار، مافی بوونی پیشە بۆ دایکان، مافی بوونی بیروباوەڕەکان، مافی ڕێکخستن، مافی پسپۆڕبوونو... بۆ ژنان بوو و جەخت لەسەر "یەکسانییە هەمە لایەنەکان" بەلای کەمەوە لە ناوونیشانی وتارەکان کە هەموو خەڵك ئەوانیان لە پۆستەرو ڕاگەیەنراوە بڵاوکراوەکاندا دەبینی- نەکرا بووەوە.





له خۆپیشاندان‌و ڕێپێوانەکانیشدا یاخود بەشێوەیەکی تایبەتی باس له مافی دەنگدان دەکرا یاخود پەنایان دەبردە بەر چەمکە گشتییەکانی وەك ئازادی کە دەیتوانی بۆ موخاتەبە جیاوازەکان، مافگەلێکی جیاوازی هەبێت.[٩٥]

کاریگەری‌و نفووزی گوتاری بزاڤە ریفۆرمخوازەکانی وەك پێشکەوتنخوازو قەدەغەکردنی خواردنەوە ئەلکەحولییەکان‌و هەروەها ئەو پەیوەندیەی بەکردەوە لە نێوان ئەم بزاڤانەو بزاڤی ژناندا دروست بوو گوتاری بزاڤی ژنانی زێتر تەمومژاوی کرد. هەندێ کات وا دەردەکەوێت بزاڤی ژنان هێندە لەخۆخەریککردنە زەینیە نەریتییەکانی ژنان دوور نییەو بەدوای ریفۆرمە ئەخلاقی‌و خۆشگوزەرانییەکانەوەیە.

دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بوو کە بەرەبەرە بەهۆی تەفسیرگەلێکی جیاواز لێلی‌و تەمومژ لە چەمکە لێلەکان دەماڵران و لێرەدا بوو کە جیاوازییەکان لە تێگەیشتنەکاندا، ئامانج‌و داواکارییەکان روون‌و ئاشکرا بوون‌و زەمینە بۆ پارچە پارچە بوونی رەخسا. جگە لە لێلی داماڵین لە نێو ژناندا، لەگەڵ بە دەستهێنانی مافی دەنگدان دەرکەوت کە پیاوان‌و بەتایبەتی کاربەدەستە حکومی‌و سیاسەتمەداران تەفسیری تایبەتی خۆیان لە مەڕ بزاڤی ژنان‌و مەسەلەی مافی دەنگدان هەیە. بەخشینی مافی دەنگدان بە ژنان، بەبۆچوونی ئەوان کۆتایی شتەکان بوو و بەگوتەی ژنێکی میشیگانی لەو ساڵانەدا پیاوان بە بەخشینی مافی دەنگدان بە ژنان هەرگیز مەبەستیان نەبووە شتێکی زێتری پێ بدەن و پێیان نەداوە"[٩٦]

لەم هەلومەرجەدا کە مافی دەنگدان بەدەستهاتبوو، بە گوتەی کریستال ئیستمەن ژنان دەیانتوانی خولێکی نوێی خەبات دەست پێبکەنەوە. بەڵام چۆن؟ ئایا دەبێت جەخت لەسەر یەکسانی لەگەڵ پیاوان بکەنەوە یاخود داکۆکی لە بەرەو پێش بردن‌و هێوکردنی رەوشی ژنان بکەن بە جەخت کردن لەسەر پێگەی تایبەت‌و جیاوازیان وەك دایك؟ ئەمانە ئەو پرسیارانە بوون کە تەمومژاوییبوون‌و لێلی گوتاریان بێ وەڵام بەجێهێشتبوو.



لە دەیەی ١٩٢٠ چەمکی "ژنی نوێ" وەك تێگەیشتنێك لە ژن کە شایەدی نموونەیەکی نوێ‌و "فێمینیستی" بوو لە ژن، خرایە ڕوو. "ژنی نوێ" مافی دەنگدانی هەبوو پیادەی دەکرد، بەدوای دۆزینەوەی کارەوە بوو لە دەرەوەی ماڵ‌و هەروەها خۆی وەکو پیاوان لەڕووی سێکسییەوە بە ئازاد لەقەڵەم دەدا.[٩٧] وا دەردەکەوێت ئەم تێگەیشتنە نوێنەری "فیمنیزمی یەکسانی" بوو کە داوای دەکرد ژنان لە هەموو کارەکاندا وەك پیاوان وابن‌و هەروەها جیاکردنەوەی فەزا تایبەتەکانی ژنان‌و پیاوان‌و ئەخلاقیاتی تایبەتی ژنان‌و پیاوان نەمێنن. لە روانگەی یەکسانخوازانەوە دەبێت ژنان بەپێی دەقی یاسا، تەواو یەکسان لەگەڵ پیاوان لە قەڵەم بدرێن تاکو بتوانن توانای ململانێ کردن لەگەڵیان بەدەست بهێنن‌و لە پێگەی نزم بەنیسبەت پیاوان رزگاریان ببێت.

حزبی ژنان کە ئالاهەڵگری سەرەکی فیمنیزمی یەکسانی بوو لەم ماوەیەدا، لە یەکەمجاردا یەکسانیی بەوردی پێناسە نەکردو یەکسانیان تاڕادەیەك بەشێوەی " وەك "نەهێشتنی هەموو بێتواناییە یاساییەکان "بۆ ژنانی لەبەرچاو گرت.[٩٨]

فیمنیزمی یەکسانی "پشتیوانخوازی"شی بۆ ژنان رەتدەکردەوەو پێیوابوو هەموو جۆرە "پشتیوانییەکی تایبەتی" لە ژنان لەسەر بنچینەی جیاوازییان لەگەڵ پیاوان بەو مانایەیە کە ژنان "توانای پێویستیان نییە بۆ پارێزگاریکردن لە خۆیان" هەروەها لە پیاوان لاوازترن‌و بە"رەگەزی دووەم" لە قەڵەم دەدرێن.[٩٩] مادیانگەر[١٠٠] پێیوابوو ئەگەر "یاساکانی پشتیوانی کە کاریگەرییان لەسەر رەوشی ژنان هەیە رەش نەکرێنەوەو قەدەغەنەکرێن... پێشکەوتنی ژنان لە بازرگانی‌و پیشەسازیدا دەوەستێت‌و ژنان بۆ نزمترین کارەکان کە کەمترین حەقدەستیان هەیە دەگوازرێنەوە"[١٠١]

ئەم جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ دەقی راگەیانراوی سنکافالزیشدا دەگونجا. لەم راگەیێنراوەشدا جەخت لەسەر یەکسانی ژنان و پیاوان و ستەمی پیاوان لەسەر ژنان کرابوو و هەروەها ئەو کایانەی جێی ژنانیان تیادا کرابووەوە (واتە فەزای تایبەتی‌و ماڵ) بە کایەی سووکئامێزو لاواز ناسێنرابوون. ئەم تێگەیشتنە جەختی لەسەر ئەوە





کردەوە کە پێگەی ژنان تەنیا لە گۆڕەپانی گشتیدا نییە کە دەبێت بگۆڕێت، بەڵکو لە کایەی تایبەتیشدا دەبێت گۆڕانکاری رووبدات.

ئەم ئەنجامگیرییە لە نێو لایەنگرانی یەکسانی تەواودا هەبوو کە ئەگەر یەکسانی یاسایی تەواو بەرقەرار ببێت، هەموو جۆرە جیاکارییەك لە دژی ژنان لە کار، داهات، پێشکەوتن‌و دەرفەتەکاندا لە نێو دەچێت‌و ژنان دەتوانن بەبێ بوونی هیچ "بایەخدانێکی تایبەتی سەبارەت بەلایەنێك" ململانێ لەگەڵ پیاواندا بکەن.[١٠٢] ئەم تێگەیشتنە لە یەکسانی لە نێو ژنان‌و پیاواندا هاوشان بوو بەرەتکردنەوە یاخود باشتر بڵێین، پشتگوێخستنی جیاوازییە نێوخۆییەکانی ژنان. لە گروپەکان‌و چینە جیاوازە کۆمەڵایەتییەکاندا چەند بەرژەوەندی‌و حەزێکیان هەبوو کە هەندێ کات ناکۆك بوون‌و پێکەوە کۆنەدەکرانەوە، بەڵام جەخت کردن لەسەر یەکسانی" بەو مانایە بوو کە ژن وەك بوونەوەرێکی ئەبستراکتی یەکسان لەگەڵ پیاو- ئەویش وەك بوونەوەرێکی ئەبستراکت‌و بێباك بە نایەکسانییەکانی نێوان پیاوان خۆیان- سەیری دەکرا. حزبی نەتەوەیی ژنان نوێنەری سەرەکی ئەم جۆرە تێگەیشتنە بوو. حزب لەو رووەوە کە ژنان تەوەری هەموو چالاکییەکانی ئەون‌و دەیەوێت بە چاوپۆشی لە جیاوازییەکانیان پێکەوە ببەستێتەوە خۆی بە "تەواو فیمینیستی" ناودەبات. ئالڤا بلێمۆنت[١٠٣] پێیوابوو حزب دەبێت بەدوای "بە دەستهێنانی یەکسانی تەواو لەگەڵ پیاوان "ەوە بێت.[١٠٤] بورنیتا شێلتۆن ماتیۆس[١٠٥] لە وەسفی "فیمینیستێکی باش" ئەوی بە کەسێك لەقەڵەم دەدا کە "هەرکاتێك جیاکارییەك ببینێت بیناسێت‌و وەك ژن وەفاداربێت بە ژنان".[١٠٦]

رەنگە بتوانین ئەم رستانەی کریستال ئیستمەن لە رێبەرانی حزبی ژنان کە بڕوای بە پێویستی بەدواداچوونی پرۆگرامێکی راشکاوانەی فیمینیستی هەبوو، بەدەربڕینی جەوهەری "فیمنیزمی یەکسانی" لەقەڵەم بدەین. ئەو لەساڵی ١٩٢١ نووسی، مەسەلەی ئازادی ژنان ئەوەیە کە:

> چۆن دەبێت جیهان دروست بکەین تاکو ژنان بتوانن بوونەوەری مرۆیی بن‌و ئەو دەرفەتەیان هەبێت ئامادەییە بێ رادە جیاجیاکانیان بە رێگەی لە



> رادەبەدەر جیاواز بهێننە دی نەك ئەوەی لەسەر بنچینەی چارەنووسی رەگەزی خۆیان بە یەکێك لە چالاکییەکان مەحکوم بن- واتە ماڵداری‌و منداڵ بەخێوکردن. دووەم ئەو کاتەی ماڵداری‌و بەخێوکردنی منداڵ هەڵدەبژێرن جیهانییەکان ئەم پیشەیە وەك کارێك پەسەند بکەن کە پێویستی بە پاداشتی ئابوورییە نەك تەنیا ئەوەی خاوەنی ئەوکارە بە شایانی وابەستەیی بە پیاوێك لەقەڵەم بدەن... دەتوانین پەسەند بکەین کە ژنان هەرگیز تائەو کاتەی جۆرە ئازادییەکی سۆزاوی، جۆرە خودتەوەرییەکی بەهێزو تەندروست، و جۆرە سەرچاوەیەکی شەخسی دڵشادی نەبێت، هەرگیز نابن بەمرۆڤگەلی. مەزن‌و تەنیا بە گۆڕینی پایەی ئابووری، ژن ناتوانن بەم مانا دەروونییەی [دڵشادی] بگات. بەڵام ئەوەی ئێمە دەتوانین ئەنجامی بدەین داهێنانی هەلومەرجی ئازادی دەرەکییە کە روحی هەموو ژنێکی ئازاد بتوانێت تیایدا لە دایك ببێت‌و گەشە بکات. خەمی سەرەکی بزاڤێکی رێکخراوی فیمینیستی دەبێت [دروستکردنی گۆڕان لە] هەمان هەلومەرجی دەرەکیدا بێت.[١٠٧]

لەسەر بنچینەی ئەم تێگەیشتنە، هەموو جۆرە جەخت کردنێك لەسەر ئەولەویەتە گروپی یاخود چینایەتییەکان شایانی پەسەند کردن نەبوو لە هەمان کاتدا، بەدەستهێنانی یەکسانی لەگەڵ پیاوان پێویستی بە جەخت کردن لەسەر دژایەتی ئەو بەرژەوەندیانە بوو کە لە نێوان ژنان‌و پیاواندا هەبوو. وا دەردەکەوێت ئەم تێگەیشتنە کە ژنانی لایەنگری فیمنیزمی یەکسانی هەم دەیانویست لەگەڵ پیاوان یەکسان بن‌و هەم وەکو دوژمنی سەرەکی خۆیان سەیری پیاویان دەکرد، گرفت دروست بکات. بەڵام لە راستیدا، جەخت کردنی فیمینیستەکان لەسەر ئەوە کە جیاوازی جەوهەری یاخود ماهییەتی لە نێوان ژنان‌و پیاواندا نییەو دەستکەوتەکانی شارستانییەتی مرۆیی بەهەمان شێوەی کە ماف‌و بەرپرسیاریگەلێکی بۆ پیاوان هەیە دەبێت بۆ ژنانیش هەبن، ئەم تێگەیشتنە بەو مانایە بوو کە فیمینیستەکانی یەکسانی لە چوارچێوەی





"گوتاری پیاوانە" دا خۆیان بە یەکسان لەگەڵ پیاوان هەمیشە بە شێوەیەکی پاوانخوازی کاتدا، پێیانوابوو لەبەر ئەوەی پیاوان هەمیشە بە شێوەیەکی پاوانخوازی مامەڵەیان لەگەڵ ئەم مافانەدا کردووەو ژنانیان خستووە شوێنێکی نزمەوە، دوژمنانی ژنان"ن.

کارۆلین سپنسەر[١٠٨] لەو بڕوایەدا بوو هەموو ئەو ژنانەی ئەولەویەت بە شتێك جگە لە فیمنیزم- کە هەڵبەت چەمکەکەی تەنیا وەك یەکسانی تەواو لەگەڵ پیاوان دیاردەکرا- بدەن، "پەیڕەوانی پیاوان"و "کرمی زەوی"ن، ئەوان کەسانێکن کە "ناتوانن لەوە تێبگەن ستەمی نیوەی مرۆڤ لە نیوەی دیکە، یەکەمین شتێکی نادروستە کە دەبێت چاك بکرێتو لابردنی یەکەمین شۆڕشێکە کە دەشێ بیری لێ بکرێتەوە." بە بۆچوونی دۆریس ستیڤنز[١٠٩] "دژایەتی سەرەکی" لە نێوان ژنانو پیاواندایەو ئەم دژایەتیە لە سەرووی هەموو دژایەتیو ناکۆکییەکانی دیکە دەوەستێت.[١١٠] هەڵبەت ئەم تێگەیشتنە پێویستی ڕێکخستنی جیاوازی ژنانی بەدواوە بوو. زۆر لەو فیمینیستانەی لایەنگری یەکسانی بوون بەتەواوی پێیانوابوو دەبێت ژنان وەك ڕەگەزێكو بەشێوەیەکی یەکپارچە کاربکەن. کریستال ئیستمەن لەو بڕوایەدا بوو بەچاوپۆشی کردن لەوەی کامە سستەمی سیاسی لەسەرکارە، "دەبێت تێڕوانینی فیمینیستی لە ڕێگەی هەوڵەکانی ژنان وەك ڕەگەزێك لە کۆمەڵگادا ڕەنگبداتەوە".[١١١]

لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینەدا کە زێتر جەختی لەسەر "یەکسانی ژنان وەك بوونەوەری مرۆیی" دەکردەوە، تێڕوانینێکی دیکە هەبوو کە جەختی لەسەر "ڕزگاری ژنان وەك بوونەوەرگەلێکی ڕگەزی" (واتە ئەو مرۆڤانەی وەك ڕەگەزێك جیاوازیان لەگەڵ پیاوان هەیە) دەکردەوە، ئەم سەرنجدانە لە جیاوازییەکان هەندێجار بە شێوەی جەخت کردن لەسەر جیاوازییەکانی ژنان لەگەڵ پیاوانو هەندێجار بە شێوەی جەخت کردن لەسەر پێویستی جیاوازی لە مامەڵە کردنە یاساییەکان لەگەڵ ژنان بوو لەسەر بنچینەی بوونەوەرگەلێکی جیاواز.



زۆر لە فیمینیستە کۆمەڵایەتییەکانو ڕێبەرانی بزاڤی ژنان وەك مارگرێت سینگەر داوایان لە ژنان دەکرد گەشە بە فەزای تایبەتی خۆیان بدەنو تا دەکرێ "بە شێوەیەکی جیاواز بە ژن بمێننەوە". جین ئادەمز پێیوابوو ئەگەر ژنان ناسنامەی خۆیان وەك گروپێکی خاوەن بەرژەوەندی جیاواز نەپارێزن، ئەو بنەمایانەی تایبەتیان دەکەن لە ناودەبەن و، لەو بڕوایەدا بوو لە بنەڕەتدا کایەی حەزی ژنانو پیاوان جیاوازە، ژنان لە خەمی خزمەتگوزارییە گشتیو ئامانجە باڵاکان دان، بەڵام پیاوان بە دوای بەدەستهێنانی سوودی تایبەتیو دەسەڵاتی شەخسییەوەن.[١١٢] ئەم تێگەیشتنە کە لە ڕاستیدا لە درێژەی تێگەیشتن یاخود ئاراستەی "جیاواز"ی بوو کە لە چەند باڵێکی بزاڤی ژناندا جەختی لەسەر دەکرایەوە، داوا لە ژنان دەکرا وەك بوونەوەرگەلێکی ئەخلاقیتر لە پیاوان جیاوازی خۆیان بپارێزن. هەڵبەت ئەم جیاوازیانەی نێوان پیاوانو ژنان دەشێ بەجیاوازیگەلێکی جەوهەری بژمێرینو هەمیش ئەوان وەك ئەزموونە هاوبەشەکانی ژنان لەبەر دۆخە تایبەتییەکانیان- کە لە هەمان کاتدا جیاوازبوون لە پیاوان- لەقەڵەم بدەین. ئەم دوو تێگەیشتنە لەم ماوەیەدا لەلایەن "فیمینیستەکانی جیاوازی" دەخرانەڕوو، بەڵام بەشێوەیەکی بەرچاو نەبووە جێگەی وتووێژێکی تیۆری ڕوونو دیار. ژنان هەندێجار وەك شتێکی جەوهەری جەختیان لەسەر جیاوازی خۆیان لەگەڵ پیاوان دەکردەوەو لە هەندێ باریشدا بەجەخت کردن لەسەر ڕۆڵی بەکۆمەڵایەتیبوونو ئەزموونی جیاوازی ژنان وەك "دایك" نە لە مانا بایۆلۆجییەکەیدا، بەڵکو لە مانای ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکەیدا- پەنایان دەبردە بەر هۆکارە زێتر کۆمەڵایەتییەکان لە فۆرمۆلەکردنی کەسایەتییە جیاوازەکانی ژنانو پیاوان.

هەروەها پێویستییە تایبەتو جیاوازەکانی ژنان دەبوونە هۆی ئوەی فیمینیستە کۆمەڵایەتییەکان بەو ئەنجامە بگەن کە سروشتی ژنان دەبوونە هۆی ئەوەی فیمینیستە کۆمەڵایەتییەکان بەو ئەنجامە بگەن کە سروشتی ژنانو دایکایەتی ئەوان بەجۆرێك لەجۆرەکان پێویست دەکات پیاوان پشتیوانیان لێ بکەنو نابێت ژنان بچنە نێو





ململانێ بۆ بەدەستهێنانی ئەو کارانەی پیاوانەن. ئەلینۆر راتبۆن[١١٣] و ماد رۆیدێن[١١٤] پێیانوابوو پێویستی بە "فیمنیزمێکی نوێ" هەیە کە پشت ئەستوور بێت بە پێویستییەکانی ژنان نەك گریمانەی یەکسانی. بەپێی بۆچوونی راتبۆن نابێت فیمینیستەکان خۆیان بەپێی "پێوەرە پیاوانەییەکان" هەڵسەنگێنن. بەبۆچوونی هەندێ لە فیمینیستەکانی جیاوازی لە بنەڕەتدا یەکسانی کێشەی ژنان نەبوو هیچ جۆرە گۆرانکارییێکیان لە رۆڵە رەگەزییەکاندا بەو شێوەیەی کە کۆمەڵگا پێناسەیان دەکات بە پێویست نەدەبینی. هەڵبەت بەبۆچوونی ئەوان لەو حاڵەتانەدا کە "ئەگەری بە دەستهێنانی یەکسانی هەبوو بەبێ ئەوەی شوێنگەی ژنان لە کۆمەڵگادا بخرێتە مەترسییەوە" دەبوو بەدەستهێنانی ئەوە لەبەرچاو بگیرێت.[١١٥]

"فیمنیزمی جیاوازی" لە بیروڕای ئەو فیمینیستانەشدا کە بەدوای زێدەکردنی ئازادی سێکسییەوە بوون دەبینرا، ئەم ژنانە تەنانەت هەندێکات لەگەڵ هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی مافی دەنگدان یاخود هەوڵەکانی دیکە لەپێناو ئامادەیی یەکسانی ژنان لە ژیانی گشتیدا دژایەتیان دەکردو تەنیا بەدوای "ئەخلاقیاتگەلێك"ی نوێوە بوون کە تیایاندا ژنان بتوانن وەك پیاوان "جگەرە بکێشن، مەشروب بخۆنەوە، خەریکی لەشفرۆشی و زمانپیسی بن و....هتد". لە راستیدا، ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە"یەکسانی"و "ئازادی" کە سنووردار دەبێت بەکایەیەك، بکردەوە دەیتوانی بەمانای ئەوە بێت کە بەبێ گۆڕان لە پەیوەندییەکانی نێوان دوو رەگەز یاخود هێورکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی ژنان، ئەوان بە تەواوی بتوانن بە جۆرە "لە کۆتوبەند هەڵاتنێك" بگەن. هەڵبەت زۆر لە فیمینیستەکانی دیکە دژایەتی ئەم هەڵوێستەیان دەکرد.

"فیمنیزمی جیاوازی" بناغەیەکی دیکەشی هەبوو، ئەگەر ئەوە گریمان بکرێت کە دەبێت ژنان بتوانن بە شوێنگەیەکی یەکسان لەگەڵ پیاوان لە ژیانی ئابووری، کۆمەڵایەتیو سیاسیدا بگەن، پێویستە لە سەرچاوە پێویستەکان بۆ بەدەستهێنانی ئەو شوێنە سوودمەند بن. بەدەستەواژەیەکی دیکە، لەو هەلومەرجەدا کە ژنانو پیاوان لە پلەوپایەی نایەکسانداان لە رووی گەیشتنیان بەسەرچاوەکان، جەخت کردنەوە لەسەر



یەکسانی دەتوانێت چەمکێکی تەواو پارێزگارانە بەخۆیەوە بگرێتو نایەکسانییەکان زێدە بکات. ئەلیزابێت گلیندۆوێر ئیڤانز[١١٦] ریفۆرمیستی بۆستونی پێیوابوو کە "یەکسانی نێوان بەهێزو بێهێز لە هەلومەرجێکدا کە ئەوان لە ململانێیەکی توندا لەسەر بنەمایەکی رکابەرانە رەفتار دەکەن...بەزۆری ئەو مانایە دەبەخشێت کە ئەو تاکەکەسانەی لە رووی فیزیکیو ستراتیژەوە لاوازترن سەریان بەر بەرد بکەوێت".[١١٧]

لەسەر بنچینەی ئەم بەڵگەهێنانەوەیە، پێویستی گەیشتن بە یەکسانی ئەوەیە کە ئەو گروپەی کەمتر دەستی بەسەرچاوەکان دەگات سەرەتا لە سەرچاوە پێویستەکان سوودمەند بێتو دواتر بە یەکسانی بگات. لە ئەنجامدا پشتیوانییە تایبەتییەکان لە گروپە ژێردەستەکان- لێرەدا ژنان- بەو مانایەیە کە ئەوان بتوانن لە سەرچاوەگەلێکی زێتر سوودمەند بن. دەتوانین ئەم تێگەیشتنە لە بیروڕاکانی "فلۆرانس کۆلی" شدا ببینین. ئەو سێ ساڵی خەباتی خۆی لە رێی کەمکردنەوەی سەعاتی کارو هێورکردنی هەلومەرجی کاری ژناندا خەرج کردبوو و پێیوابوو ژنان لەم رێیەوە دەسەڵاتێکی زێتر بەدەست بێنن.[١١٨]

ئەم تێگەیشتنە لە"فیمنیزمی جیاوازی" بە پێویست لەسەر بنچینەی تێگەیشتن لە"سروشتی" جیاوازی ژنانو پیاوان نەبوو، بەڵکو بە مانای تێگەیشتن بوو لە نایەکسانی وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی کە بەرهەمی نایەکسانییە لە سەرچاوەکانداو دەبێت لە یەکسانی لە گەیشتن بە سەرچاوەکانیشدا بە دوای رێگایەکدا بگەڕێین، کە ئەوەی پێویستە بۆ ئەم یەکسانییە- بەلای کەمەوە لە ماوەیکی کورتدا- بەخشینی ئیمتیازی تایبەتە بە گروپی لاوازتر- لە رووی کۆمەڵایەتییەوە- کەواتە پشتیوانیو ئیمتیازەکان لایەنێکی کەرەستەییان هەیە تاکو بتوانن لە رێیانەوە بە یەکسانی بگەن. ئەم تێگەیشتنە هەندێکات بەرەو جیاکردنەوەی خەباتی ژنان لە چالاکییەکانی پیاوان- ئەگەر لەکایە هاوشێوەکانیشدا بێت- دەچوو گوزارەی دامەزراندنی حزبێکی سەربەخۆی ژنان کە پشتیوانی لە پاڵێوراوە ژنەکان بکات یاخود ئەو رێکخراوانەی کە تەواو بەلای ژناندا بشکێنەوە تارادەیەك نیشانەی ئەم جۆرە پێویستیخوازییە بوو. بەڵام





بەگشتی، وا دەردەکەوێت فیمینیستەکانی جیاوازی زێتر سەرنجیان لە هاوکاری لەگەڵ پیاوان لە کایە جیاوازەکاندا داوەو ئەوەشیان بەپێی پێویستی دەگرتە بەر.

رەنگە بتوانین بڵێین یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکان لە جیاکردنەوەی نێوان فیمنیزمی یەکسانیو فیمنیزمی جیاوازی یاخود بە یەکێك لە دەربڕینەکان، فیمنیزمی کۆمەڵایەتیو فیمنیزمی رادیکال (یاخود لە راستیدا لیبرال) تێگەیشتنیان بوو لە مەسەلەی دایکایەتی. فیمنیزمی یەکسانی لە بنەڕەتدا گرنگترین جیاوازی نێوان ژنانو پیاوانی پشتگوێ دەخست، ئەویش مەسەلەی دایکایەتی بوو. لەبەرامبەردا، فیمنیزمی جیاوازی و رەوتی سەرەکی لە رای گشتی کۆمەڵگادا ژنیان زێتر لە هەر شتێکی دیکە لەسەر بنچینەی رۆڵی دایکایەتییەکەی پێناسە دەکرد. یەکێك لە رابەرانی لیگی دەنگدەرەکان لە وتارێك لە گۆڤاری وۆمێن سیتیزن[١١٩] دا نووسی:

> ئاپۆرەی ژنان لەو بڕوایەدان کە گرنگترین وەزیفەی ژنان لە جیهاندا دایکایەتییە، خۆشگوزەرانیو بەختەوەری منداڵ دەبێت گرنگترین تێبینی بێت و ژنان لەبەر ئەرکی دایکایەتییان دەبێت لەبەرامبەر گوشارە نەگونجاو و نابەجێکاندا پشتیوانیان لێ بکرێت.[١٢٠]

سەرنجدان لەم جیاوازییەی نێوان ژنانو پیاوان بەرەو ئەوە دەچێت کە تەنانەت ئەو دەستەیەی فیمینیستەکانی جیاوازی کە بەجۆرێك لە جۆرەکان بەدوای یەکسانییەوە بوون لەو رووەوە جیاوازیان لەگەڵ فیمینیستەکانی یەکسانی هەبێت کە"جیاوازی" بنەڕەتی بەو مانایەیە کە لە "یەکسانی" مافەکاندا بە دوای پێویستی گەیشتن بە یەکسانی نەگەرێن، بەڵکو گەیشتن بە یەکسانی لەرێی مافە جیاوازو گونجاوەکانەوە مومکین بێت. بەدەستەواژەیەکی دیکە، لە هەلومەرجی جیاوازدا، دەبێت لە ئەنجامەکاندا بەدوای یەکسانی بگەڕێین نەك لە پێکدانەکان یاخود تەنانەت دەشێ تەنیا دەرفەتەکان.





ژنەکانی وەك کۆلی، سمیتو ئەندرسۆن لەو باوەرەدا بوون کە لەو رووەوە یاسادانەریی جیاواز بۆ ژنان پێویستە کە ژنان لەڕووی بایۆلۆژی (توانای جەستەییەکانو هێزی وەچەخستنەوە)و لە رووی کۆمەڵایەتی (دایکایەتی) جیاوازن لە پیاوانو لە ئەنجامدا زێتر ئازاریان پێدەگاتو دەبێت پشتیوانییەکی تایبەتیان لێ بکرێت. فلۆرانس کۆلی رایگەیاند:

> تا ئەو کاتەی پیاوان نەتوانن ببنە دایك، تا ئەو کاتە یاسادانەریی گونجاو بۆ ئەوان ناتوانێت [بەپێویست] بۆ ئەو ژنانەی کاری بەکرێ دەکەن گونجاو بێت؛ و هاواری یەکسانی، یەکسانی لە هەلومەرجێکدا کە سروشت نایەکسانی دروستکردووە، بەهەمان رادە دەبەنگانەو وێرانکەرانەیە کە بانگەوازی ئاشتی، بەدیهاتنی ئاشتی لە شوێنێك کە هیچ باس لە ئاشتی ناکرێت.[١٢١]

لەبەرامبەردا، وێنەی لایەنگرانی فیمنیزمی یەکسانی لە ژنو شوێنگە یاساییو کۆمەڵایەتییەکەی لەسەر ئەو بنچینەیە بوو کە ژن بوونەوەرێکی بەهێزەو جیاوازی نێوان ژنانو پیاوان لە یاساو بازاڕی کاردا... کۆمەڵایەتی- مێژووییە کە بە پێویستیش نکۆڵی لێنەکراو نییە، ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە دابەشکردنی کار لەسەر بنچینەی رەگەز هەم لە خێزانو هەم لە بازاڕی کاریشدا دەشێو دەبێت بگۆڕێت. مشتومڕی نێوان فیمنیزمی یەکسانیو فیمنیزمی جیاوازی بوو بە مشتومڕێك لەمەڕ دەستنیشانکردنی "فیمینیستە راستەقینەکان". هەردوو گروپ بەدەربڕینی کات دەیانویست "بەرگری لە بەهای رۆڵی ئابووریی ژنان بکەن، رێگە لە چەوساندنەوەی ژنان بگرنو دەرگای دەرفەتە کۆمەڵایەتییەکان بە رووی ژناندا بکەنەوە ژنانی لایەنگری "پشتیوانی"، ژنانی حزبی نەتەوەییو لایەنگرانی ریفۆرم مافە یەکسانەکانیان بە"ئەودیو"ی فیمنیزم یاخود بەفیمینیستە "توندڕەوەکان" ناودەبردن. هەندێ کەسی بێزاریش لەم توندڕەوییە لەو بڕوایەدا بوون "تەنانەت بەکارهێنانی وشەی فیمینیست بەمانای داواکردنە لە توندڕەوەکان بۆ ئەوەی متمانەو ئیعتیبارمان بخەنە

مەترسییەوە"[١٢٢] ماری ئەندرسۆن پێیوابوو فیمینیستەکانی یەکسانی "فیمینیستگەلێکی تیۆری"ن لەبارەی ئەو شتو هەلومەرجانە دەدوێن کە بە تەواوی لە کایەی ئەزموونو ناسینی ئەوان بەدەرن" ئەو لەبەرامبەر ئەم گروپەدا، خۆی بەفیمینیستێکی باش"و "ئەهلی کار" لەقەڵەم دەدا.[١٢٣] هەندێك لە فیمینیستەکانی جیاوازی، خۆیان بە فیمینیستی نەرمو میانەڕوو لەقەڵەم دەدا. بەڵام بەرەبەرە لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٢٠ ژنە چالاکەکان بۆ بەرزکردنەوەی پایەی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری ژنان کە لە دەرەوەی چوارچێوەی حزبی نەتەوەیی ژنان بوون، چیدی هەوڵیان نەدا خۆیان بەفیمینیست ناوببەن. لە ئەنجامدا "فیمنیزم" لەلایەکەوە تەنیا بە"فیمنیزمی یەکسانی" سنووردار بوو لەلایەکی دیکەوە، بەهایەکی نێگەتیڤی وەرگرت کە ئەوی بە دەکتورینی "تایفەگەرایانەو ناکردەیی" دەبەستەوە.[١٢٤]

ئەم دابڕانە هزریو گوتارییە تەنیا مەسەلەیەکی ئایدیۆلۆژی نەبوو، بەڵکو تاڕادەیەکی زۆر بە ئەنجامی جیاوازییە بابەتییەکان لە پایەی ژناندا حیساب دەکرێت کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێدەکرێت.

## گەشەکردنی جیاوازی لەنێو ژناندا

وا دەردەکەوێت کە ئاستی چالاکی ڕێکخراوی ژنان لە کۆتایی دەیەی ١٩٢٠ شایانی بەراوردکردن بوو لەگەڵ ئەو ماوەیەی خەبات لە پێناو بە دەستهێنانی مافی دەنگداندا دەکرا. ڕێکخراوگەلێکی زۆر لەم ماوەیەدا دروست بوونو ژمارەی ئەندامانی ڕێکخراوەکانیش بەرچاو بوو؛ بەڵام لەهەمان کاتدا، پێناسەکانیان لەمەڕ خۆیان تایبەتیترو ئامانجەکانیشیان تایبەتیتر بوون لە نەوەی پێشوو. ئەمەش بەمانای گەشەکردنی هۆشیاری لە"جیاوازییەکان" بوو لە نێو کۆمەڵێکدا کە بەشێوەیەکی یەکپارچە بە"ژن" ناودەبرێت. چیدی ژنان خۆیان تەنیا وەك ژن نەدەناساندو کۆمەڵێك حەزو ئارەزوویەکیان هەبوو کە هەندێکات زێتر لەوەی لەگەڵ حەزو ئارزووی گروپەکانی دیکەی ژنان کۆك و تەبابن، لەگەڵ داواکارییەکانی ئەو پیاوانەی خاوەن بەرژەوەندیو حەزو ئارەزووی هاوبەشن، کوك بوون. بەدەربڕینی تایلۆر، جەختکردنەوەی ژنان لەسەر



پێویستی گەشەسەندنی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکان و سەرکەوتنیان لەم ئاراستەیەدا خۆی بووە زەمینەسازی جیاوازییەکانی نێوان ژنان و "لەگەڵ جۆراوجۆری زۆری ژیانی ژنان، پێناسەی ئەم مەسەلەیە کە چ شتێك لە بەرژەوەندی ژناندایە زێتر تەمومژاوی بوو".[١٢٥] بەدەربڕینێکی دیکە، پێویستی بەردەوامی بزاڤی ژنان پاراستنی ناسنامەیەکی ژنانە بوو کە لەسەر بنچینەکەی پێویست بوو "خود" ی ژنان لەبەرامبەر "ئەویتر"دا دروست بێت؛ بەڵام لە بەر پەرتەوازەیی ژنان لە کەلێنە جیاوازە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانیان نەیاندەتوانی بەئاسانی ئەم ناسنامە یەکێتیبەخشە بەدەست بهێننو لەوەش گرنگتر ئەم ناسنامەیە بپارێزن.

ژنە ماڵدارەکان هەستیان دەکرد بیروڕای فیمینیستەکان هەم نکۆلی لە ڕۆڵی بنەڕەتیان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و، بەهای ئەوان دەکاتو، هەمیش زۆر لە بیروڕاکانیان وەك مافە تەواو یەکسانەکان دەتوانێت ئەوان بێبەش بکات لە تایبەتمەندییە نەریتییەکانی وەك نەفەقە کە وەك ئەرکێك بوو لە ئەستۆی پیاو و ژنان وەك جیاوکێك سوودیان لێ وەردەگرت. سەرەڕای ئەوە زۆر لە فیمینیستەکان وەك "بارێك" سەیری "منداڵەکان"یان دەکرد کە تەوەری ژیانی زۆر لە ژنان بوون و، سەرنجیان لەو کێشانەی پەیوەندیان بە منداڵانو دایکەکانیانەوە هەیە نەدەداوە. ژنە کرێکارەکان لەو بڕوایەدا بوون ژنە خۆشگوزەرانەکانی چینی ناوەڕاست شتێك لە ڕەوشی ئەوانو دۆخی دژواریان نازاننو لەوە ئاگادارنین کە مەسەلەی گەورە بۆ ئەم توێژە ڕزگاربوونە لە توندی گوشارەکان نەك بەدەستهێنانی یەکسانی کە دەتوانێت بەجۆرێك لە جۆرەکان گوشاریان لەسەر زێدە بکات. زۆر لەو ژنە پیشەییانەی بێ مێرد بوونو ئاگاداری گیروگرفتی ئەو ژنانە نەبوون کە کاریان دەکرد و مێردیان هەبوو و هەلومەرجی ئەوانیان لە بەرچاو نەبوو، تەنیا دەیانویست هەموو کۆسپو تەگەرەکان لەسەر ڕێی سەرکەوتنی پیشەیی خۆیان هەڵگرن. ژنە ڕەنگینپێستەکان نەیاندەتوانی پێگەی تایبەتی نزمیان وەك کەمایەتییەکی ڕەگەزیو لەهەمان کات کەمایەتییەکی نەژادی گونجاو ببینن لەگەڵ





بیروڕای فیمینیستە جیاوازیخوازەکان کە سەرنجیان لە خەباتی ڕەشپێستەکانو.. هتد نەدەدایەوە.

لە ئەنجامدا ئەم جۆراوجۆریو گەشەکردنەی جیاوازییەکان لە نێو ژناندا، لە ڕووی گوتارییەوەش چیدی هێندە جەختی لەسەر ژن بوون نەدەکردەوە. زۆر لە ڕێبەرە نوێکانی ژنان جەختیان دەکردەوە کە ئێدی دەبێت قسەکردن لەبارەی "هۆشیاری ڕەگەزی"[١٢٦] بخرێتە لاوە. وا دەردەکەوێت لەم ماوەیەدا ئەو ناسنامە جیاوازانەی ژنان لەسەر بنچینەی ئامادەییان لە بونیادی هیرارکییەتی کۆمەڵگادا هەیانبوو و مەیلە ئایدیۆلۆژییو سیاسی و.. تایبەتییەکانیان بەهێزتربوون لەوەی کە"ناسنامەی ژنانە" ئەکتیڤ بکەن. ژنان بوون بە دەستەو کۆمەڵەو چالاکیان دەنواند، بەڵام تەنیا وەك ژن کاریان نەدەکرد. لە ئەنجامدا سەرەڕای ئەم چالاکییەیان "بزاڤی فیمینیستی" یان فۆرمۆلە نەدەکرد.[١٢٧]

ئەم جیاوازیانە هەلومەرجی لە بنەڕەتدا دژواری بزاڤی ژنانی پیشان دەدا. ژنەکان لە کەلێنە کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسیو هزرییەکانی کۆمەڵگادا وەها پەرتەوازەببوون کە بە ئاسانی ناسنامە ژنانەییەکەیان دەکەوێتە ژێر تیشکی وابەستەییە کۆمەڵایەتییەکانیانو ناتوانن لە ماوەیەکی درێژدا بەردەوامی بە هاوبەستەییەکانی خۆیان بدەن. ویلیام ئۆنیل پێیوایە گریمانەی بزاڤ ئەوەبوو کە ژنان "یەکێتیەکی جیاواز لە چینو کاریان هەیەو لە [پاشکۆیەتیکردنی] بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان بێبەرین،" بەڵام گۆڕانکارییەکانی دوای بە دەستهێنانی مافی دەنگدان پیشانیاندا ئەم تێگەیشتنە ڕاست نەبووە.

**سستەمی سیاسی: دەوڵەتو بونیادی حزبی**

لە بونیادی سیاسی ئەمریکادا بەهەمان شێوەی کە هۆکارگەلێك لە هەلومەرجی جیاوازدا هاوکاری دروستبوونو بەردەوامی بزاڤە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان دەکەن، لە هەلومەرجێکی دیکەدا دەبنە هۆی ئەوەی بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان لەوەی بە"گۆڕەپانی



سیاسەتی بزاڤ"[١٢٨] ناودەبرێت (واتە ئەو چالاکیانەی لەشێوەی کردەی ڕاستەوخۆ و بە گشتی تا ڕادەیەك بەدەرن لە چوارچێوە دامەزراوەییە جێگیرەکان) بێنە دەرەوەو درێژە بە چالاکییەکانیان بدەن لە چوارچێوەی دامەزراوە، هەبییەکاندا. ئەگەر لە سستەمە نادیمۆکراتییەکاندا سەرکوتکردن دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی بزاڤ و مۆبالیزەی کۆمەڵایەتی- بە شێوەیەکی کاتی یاخود هەمیشەیی- لە سستەمە سیاسیە دیمۆکراتییەکاندا، وەڵامدانەوە ڕێژەییەکانی حکومەت بۆ خواستەکانی بزاڤە کۆمەڵایەتییەکانو میکانیزمە هەبییەکان بۆ پەلکێشکردنی ئەم بزاڤانە بۆ نێو چوارچێوەی بەدامەزراوەبووی هەیی و، هەروەها گوتاری هەژموونی کە سستەمی سیاسی پشت ئەستۆرە پێی دەبنە هۆی ئەوەی بزاڤ نەتوانێت (یاخود بە پێویست نەبینێت) درێژە بەسیاسەتی کاری خۆی بەشێوەی مۆبالیزەی بەردەوامو چالاکی نواندن لە گۆڕەپانی سیاسەتی دانەمەزراوی بزاڤدا- لەبەرامبەر سیاسەتی ڕۆژانەی بەدامەزراوە بوو- بدات.

لە دەیەی ١٩٢٠ تاکو نیوەی دەیەی ١٩٦٠ بۆ زۆر لە بزاڤە کۆمەڵایەتییەکانو بەشێوەیەکی تایبەتی بزاڤی ژنان ئەو ڕەوشە لەئارادا بوو. لەم چەند دەیەدا، وێڕای ئەوەی ڕێکخراوەکانی بزاڤ تا ڕادەیەك بەردەوامیان بە ژیان و چالاکییەکانی خۆیان دەدا، بەڵام ئەم چالاکییە بەگشتی لە چوارچێوەی سستەمی هەییو بەپشت بەستن بە ئامرازەکانی سیاسەتی ڕۆژانە بوو کە هەندێ کات سەردەکەوتوو هەندێ کات- ڕەنگە لە زۆربەی بارەکاندا- سەرنەدەکەوت.

پیادەکردنی نفووز لە کۆنگرە لە ئاستی فیدراڵ و ئەنجوومەنی ویلایەتەکاندا لە بڕیاردان لە سەر هەندێ لەو یاسایانەی پشتیوانی لە ژنان و منداڵان دەکەن، لە یەکەمین ساڵەکانی دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان سەرکەوتوو بوو، لە هەندێ باردا بۆ هاوکاریکردنی ژنانو منداڵان گوژمەگەلێك تەرخانکران. کۆنگرە ١,٢٥٠,٠٠٠ دۆلاری بۆ خوێندنی دایکان تەرخان کرد؛ پڕۆژەی باکرزو ستۆکیاردز[١٢٩] لە پشتیوانی لە بەکاربەران لە ساڵی ١٩٢١ بڕیاری لەسەردرا، هەروەها بڕیار لەسەر یاسایەك بۆ





ئاسانكاری هاووڵاتیبوونی ژنە بەمێردەكان لە ساڵی ١٩٢٢ درا؛ یاسایەك بۆ پیادەكردنی "سستەمی فەزیلەت" (واتە دابەشكردنی پلەوپایەو یاداشتەكان لەسەر بنچینەی سەلاحییەتو شایستەییەكان نەك پەیوەندییە تایبەتییەكان یاخود هۆكارەكانی وەك رەگەز) لە خزمەتكردنی وڵات لە ساڵی ١٩٢٣ لە كۆنگرەدا بڕیاری لەسەردرا؛ چاكسازی كاری منداڵان لە ساڵی ١٩٢٤ بڕیاری لە سەردرا. هەندێ لە ویلایەتەكان بڕیاریان لەسەر یاساكانی كاری شەوانەو یاسا پەیوەندیدارەكان بە سەعاتەكانی كارو حەقدەست كە بە شێوەیەكی تایبەتی وەڵامدەرەوەی خواستەكانی ژنە ریفۆرمیستەكان بوون؛ بیست ئەنجومەنی ویلایەتی مافی ئەندامبوونیان لە دەستەی دادپەروەریدا بە ژنان بەخشی، میشیگان و مۆنتانا بڕیاریان لەسەر یاسای حەقدەستی یەكساندا؛ ڤیسكانسین بڕیاری لەسەر لایحەی مافە یەكسانەكاندا؛ و ڤیرجینیا لە٢٤ داواكاری ریفۆرمی ژنان، بڕیاری لەسەر ١٨ حاڵەتدا.[١٣٠]

ئەوەی سەرەنج راكێشە ئەوەیە، كۆنگرە بەكردەوە لەژێر گوشارەكانی گروپە جیاوازەكانی ژنان هەندێك بڕیاریدا كە پاڵپشتیان لە"جیاوازی" ژنان دەكردو هەروەها هەندێك بڕیار كە یەكسانی ژنو پیاویان بە بنەما دادەنا. بڕیاردان لەسەر یاسای دایكو منداڵ بەمانای پشتگیریكردنی ئەو مەسەلەیە بوو كە ژنان (وەك دایك) لەگەڵ پیاوان لە رووی پەیوەندییەكانیان بە دەوڵەتەوە جیاوازن و، لە ئەنجامدا دەبێت وەك گروپێكی جیاواز بەشێوەیەكی جیاواز رەفتاریان لەگەڵدا بكرێت. بەڵام بڕیاردان لەسەر ئەو یاسایەی هاووڵاتیبوونی ژنانی لە پاشكۆیەتی هاووڵاتیبوونی مێردەكانیان دادەبڕی، بەمانای جەخت كردن بوو لەسەر یەكسانی ژنانو پیاوانو ئەو بەڵگەهێنانەوە بنەڕەتییەی پەسەند دەكرد كە "ژنێك بەهەمان ئەندازە تاكەكەسە كە پیاوێكو نابێت هاووڵاتیبوونی لە رێی شووكردنەوە بەدەست بێنێت یاخود لەدەستی بچێت مەگەر ئەوەی كە ئەم رەوشە لەبارەی پیاوانیشەوە راست بێت"[١٣١].

دەشێ بڵێین ئەوەی زێتر لەهەر شتێك لە بڕیاردانەكانی دەوڵەت لەو زەمینانەی كە پەیوەندیان بە مافو داواكارییەكانی ژنانەوە هەبوو، سەركەوتنیان بوو لە پیادەكردنی



گوشار نەك بێگەردی جۆری داواكە. ئامێری حكومەتی ئەمریكاو دامودەزگا یاسادانەرەكەی لەبەرامبەر ژنانیشدا پەیڕەویان لە بنەماكانی ئەو یارییە دەكرد كە لە بەرامبەر داواكارییەكانی گروپە كۆمەڵایەتییەكانی دیكەش كاری پێ دەكردن: گروپێك لە سەپاندنی خواستەكانیدا سەركەوتوو بوو كە بەبوونی سەرچاوەی زێتر بتوانێت نفووزی پیادە بكات.

بەڵام لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٢٠ ژنان زێتر لە جاران لەوەی وەك بلۆكێكی یەكپارچە كاربكەن، پەكیان كەوت، داواكارییەكانیان رووبەڕووی بەرنگاری كۆنگرە بوونەوە. كۆمیتەی هاوبەشی كۆنگرە لە كاروبارەكانی ژناندا رایگەیاند دەبێت ژنان لە گوشاری خۆیان بۆ سەر كۆنگرە كەمبكەنەوە، چونكە كۆنگرە "لە داواكارییەكانی ژنان ماندوو بووە". لە نیوەی دووەمی دەیەی بیست كۆنگرە چەندین جار داواكارییەكانی ژنانی لە بوارە جیاوازەكاندا رەتكردنەوە. دیوانی باڵای وڵات زۆر لە پێشنیارەكانی چاكسازیی بەپێچەوانەی دەستوور لەقەڵەمدان وەك یاساكانی منداڵانو یاسای كەمترین حەقدەست بۆ ژنان [١٣٢]. بەبۆچوونی سینكلەر، ئەو كاتەی ژنان مافی دەنگدانیان بە دەستهێنا، تەسەوری ئەوە دەكرا كە ژنان وەك گروپێكی تاڕادەیەك یەكگرتوو كاربكەنو بیروڕاكانیان بتوانن لە گۆڕەپانی سیاسەتدا دەستنیشانكەربن. دواجار، لە یەكەمین ساڵەكاندا دامەزراوە حكومییە جیاوازەكان ئاسانتر خۆیان دەدایە دەست گوشارەكانی گروپەكانی ژنانو دواكارییەكانیان، بەڵام بەرەبەرە دەركەوت كە گوشارەكان بەردەوامیان نییە، ژنان كەمتر بەشداری لە هەڵبژاردندا دەكەنو بیروڕاكانیشیان یەكگرتوو نینو "ترسی" نوێنەران لە ژنان كۆتایی پێهاتو چیدی خۆیان نەدەدا دەست گوشارەكانیان[١٣٣] و لە ئەنجامدا، "ئەفسانەی" دەنگی ژنان نفووزی خۆی بەتەواوی لەدەستدا.[١٣٤] بۆ نموونە، ئەو كاتەی كۆمیتەی قەزایی ئەنجومەنی نوێنەران لە ساڵی ١٩٢٥ كۆبووەوە بۆ گوێگرتن لە گوتەكانی نوێنەرانی رێكخراوەكانی ژنان لەبارەی ریفۆرمی مافە یەكسانەكانو لە ماوەی دانیشتنەكانیدا كە سێ رۆژیان خایاند دەركەوت كە تەنیا حزبی نەتەوەیی ژنان پشتیوانی لە ریفۆرم دەكات، ریفۆرمیان لە پرۆگرامی





کارەکەیان دەرهێنا، چونکە دەرکەوت کە ژنان هێندەی بایەخیان بە ریفۆرمی مافی دەنگدان دەدا هێندە بە دوای ئەم ریفۆرمەدا ناچن."[١٣٥]

سەرەڕای ئەوە، گروپەکانی راوێژی ژنان بەنیسبەت گروپەکانی دیکە لە رووی دارایی‌و ئابوورییەوە لاواز بوون‌و دواجار سەرچاوەکانی نفووزیان سنووردار بوون. هەروەها کایەی یەکسانی کار یەکێك بوو لەو کایانەی پیادەکردنی چالاکییەکانی راوێژی ژنان تیایدا هێندە سەرکەوتوو نەبوو. لەو هەلومەرجەدا کە ئایدیۆلۆجیای ماڵداری بەهێز بوو و سیاسەتێکی روونیش لە پشتیوانیکردن‌و کاری ژنان‌و دروستکردنی ئاسانکاری یاخود تەنانەت هەڵگرتنی کۆسپەکان لە سەر رێگا لەئارادانەبوو، لەم دەیەدا گۆڕانێکی شیاوی باس لە رۆڵی ئابووری ژناندا دروست نەبوو. بە دەربڕینی یەکێك لە مێژوونووسە ئابوورییەکان، لە دەیەی ١٩٢٠ دا "ئاراستەی فیمینیستە خەباتگێڕەکان لە پێناو گرتنەبەری رێگا بۆ ئەو کاروپیشانەی ئەگەری پێشکەوتنیان تێدا هەبوو شکستی هێنا"[١٣٦] و سەرەڕای ئەو تێگەیشتنە سەرەتاییەی کە مافی دەنگدان دەتوانێت ببێتە هۆی "شۆڕشێك لە پێگەی ژنان"دا، تاڕادەیەك هیچ پێشکەوتنێکی هەستپێکراو بە مەبەستی بەدەستهێنانی یەکسانی ئابووری بەکردەوە رووی نەدا.

لەبەرئەوەی لەسەر بنچینەی ئایدیۆلۆژیای لیبرالی دەوڵەت، دەبێت هاوڵاتیان وەك "تاکەکەس"ی ئەبستراکت پێناسە بکرێن، هەڵوێستی ئەو فیمینیستانەی جەختیان لەسەر جیاوازی مەیلەکانی ژنان لە گۆڕەپانی سیاسەتدا دەکردەوە، رووبەڕووی پەرچەکرداری نەرێنی دەوڵەت دەبووەوە. تەنانەت ئەو سیناتۆرو نوێنەرانەی لایەنگری مافی دەنگدان بوون بۆ ژنانیش بە توندی دژی سیاسەتی پشت ئەستوور بە رەگەزبوون و "خەباتی سیاسی لەسەر بنچینەی دژایەتییە رەگەزییەکان" بە "شتێك کە ناکرێت بکرێت"لەقەڵەم دەدا.[١٣٧]

بەم شێوەیە، گروپە جیاوازەکانی ژنان دەیانتوانی لە پێناو داواکاریگەلێکی تایبەتیدا چالاکی بنوێنن، بەڵام نەدەبوو ئەم داواکاریانە ببنە بنەمای رێکخستنێکی سیاسی‌و جێگیرو بەش بەش لەسەر بنچینەی رەگەز. دەبوو ژنان زێتر لە چوارچێوەی سستەمی



حزبی هەبیدا کاریان کردبا تابتوانن بەخواستەکانی خۆیان بگەن. ئەمە رەنگە لەگەڵ یەکسانی بنەڕەتیش گونجاوبێت کە ئایدیۆلۆژیای بزاڤی ژنان لە سەدەی نۆزدەدا جەختی لەسەر دەکردەوە. بەڵام لەهەمان کاتدا، لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەی کە لەسەر بنچینەکەی پیاوان لە بونیادەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا پەرەیان بە باوکسالاری و سەکوتکردنی ژنان دەدا، ناکۆك بوو.

ستراکتۆری دوو حزبی سستەمی سیاسی لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کە دەبوو رێگر لەبەردەم گەشەکردن‌و سەرکەوتنی رێکخستنێکی سەربەخۆی ژنان. زۆر لە ژنان لە چالاکییە سیاسییەکانی خۆیاندا وایان بەباش دەزانی پشت بە ئامێری حیزبی حزبە بەهێزەکان ببەستن و ئەگەر بەدوای یەکسانی لەگەڵ پیاوانەوەن، لەو دامەزراوانەدا کە پیاوان خاوەنیانن لەگەڵیان، لە تەك ئەوان‌و، بە شێوەی ئەوان چالاکی بنوێنن؛ و ئەم تێگەیشتنە جگە لەوەی سەرچاوەی لەوە وەرگرتووە واتە تێگەیشتنی تا رادەیەك زاڵ لە یەکسانی لە شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژناندا یەکسانییەك بوو کە تەوەرەکەی پیاوان بوون و ژنان دەیانویست *لەگەڵ پیاوان یەکسان بن*، تا رادەیەکی زۆر "پێویستی" سیاسی لە روانگەی ژنانیشەوە پیشاندەدا. زۆر لە ژنە چالاکەکان لە ناسادا دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان پەیوەندیان بە لیگی ژنان یاخود حزبی ژنانەوە نەکرد بەڵکو چالاکی خۆیان لە چوارچێوەی سیاسەتی نەریتی حزبیدا کۆکردەوە[١٣٨].
ئەو پشتیوانە چالاکە سیاسیانەی ئینتیمای حزبیان هەبوو لەلایەکەوە لەو بڕوایەدابوون دەبێت ژنان بچنە نێو سیاسەتەوە تاکو دۆخی خۆیان هێور بکەنەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا، باشتری ژنان لە سیاسەتدا وەك زۆر لە ژنە سیاسییەکانی دیکە بە نامومکین و نەخوازراو لەقەڵەم دەدا. ئەم ژنانە لەگەڵ ئاگاییان لەمەڕ مەیل و بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەکانی ژنان کە لەسەرووی ناسنامەکەیانەوە وەك ژن بوو، پێیانوابوو ئەم مەیلانە دەبنە رێگر لەوەی ژنان لە دەنگداندا بە تەواوی لەسەر بنچینەی رەگەز دەنگ بدەن و ئەگەر ژنە کاندیدەکانیش خۆیان وەك ژن بپاڵێون نەك تەنیا دەنگی پیاوان،





بەڵکو تەنانەت ناتوانن دەنگی ژنانیش بەدەست بهێنن و ئەمەش بەمانای شکستە لە خەباتی هەڵبژاردنی لە هەموو ئاستەکاندا[١٣٩].

ئەم پێویستییە سیاسییە لە چوارچێوەی سستەمی حزبی و هەڵبژاردنیدا یەکێك بوو لەو هۆکارانەی رێگەی دەگرت لەوەی ژنان، چالاکی سیاسی بەجیا لە چالاکی حزبە سەرەکییەکان بەسوودو کاریگەر لەقەڵەم بدەنو لە ئەنجامدا دەبوو لە چوارچێوەی هەمان سستەمدا کاربکەن. بەڵام کار لەو چوارچێوەیەشدا گیروگرفتی تایبەتی خۆی هەیە. ئایا لە چوارچێوەی حزبەکانیشدا ژنان نابێت وەك "ژن" بەدوای بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی ژناندا بچن؟ لەم ئاستەشدا "سەربەخۆییخوازی" سنووردارییگەلێکی هەن. لەوەی کە لە جەختکردن لەسەر "پرۆگرامی کاری فیمینیستی یاخود ژنانە" سەرکەون پەیوەندی بەکاری یەکگرتووی ژنانەوە هەبوو، بەڵام ژنان لەم ئاستەدا سەرکەوتوو نەبوون. یەکێك لەو ژنانەی ئەندامی حزبی دیمۆکرات بوو لەبارەی ئەم بێتواناییەی ژنان لە کاریگەری خستنە سەر سیاسەتی حزبی گوتی "هیچ ژنێك ناناسم کە ژنێکی دیکە پەیڕەوی ئەو بێت. هیچ سیاسەتمەدارێك ناناسم لەبارەی هیچ کێشەیەك لەم جیهانەدا لە دەنگی ژنان بترسێت"[١٤٠]. ئێستا ئەگەر ژنان وەك بلۆکێك لە سستەمی سیاسی ئەمریکادا کاریان نەدەکرد و ئەگەر کاندیدێکی ژن بەلای کەمەوە نەیدەتوانی ئەوە زامن بکات کە دەتوانێت دەنگی ژنان بەدەست بێنێت، بۆچی دەبوو پشتیوانی لەو بکرێت؟ بەم شێوەیە، لەلایەکەوە سستەمی سیاسی و حزبی ئەمریکا، بەیەکگرتوویی کارکردنی ژنانیان پێ قووت نەدەدرا و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەبێت ژنان وەك هاوڵاتی کاربکەن نەك وەك ژن، و لەلایەکی دیکەوە ئەم هاوڵاتیانە ئیمتیازێکی تایبەتیان نییە کە لە پاڵاوتنیان بۆ پلەوپایە هەڵبژاردنییەکان پشتیوانییەکی تایبەتیان لێ بکرێت.

وێڕای ئەوەی ژنە چالاکەکان لە لقەکانی ژنان لە دوو حزبی دیمۆکرات و کۆماریخواز لە درێژەی چەند دەیەی دواتریش پشتیوانیان لە هەڵبژاردن و دانانی ژنان دەکرد. لەوەی لە پلەوپایەکانی بڕیارداندا جێگە بگرن، بەڵام بە گشتی، دەرفەتە سیاسییەکان بۆ ژنان کەم بوون و تا چەندین دەیەش زۆر بە کەمی مانەوە. تەنانەت ئەگەر ژنان بۆ چەند



بەرپرسیاریەتییەکیش لەبەرچاو دەگیران بەسەرنجدان لە تواناکانیان بۆ کاری تایبەتی بوو نەك هەڵوێستیان لەبارەی ئەو کێشانەی پەیوەندیان بەژنانەوە هەیە. ئەم شتە بۆ جۆرێك لە توکەنیزم[١٤١] چوو کە بەپێی ئەو پرەنسیپە هەمیشە ژمارەیەکی ژنان لە پلەوپایە هەڵبژاردنی و کاربەدەستییەکان تەنیا وەك نموونەگەلێك لە ئامادەیی ژنان لە ژیانی سیاسیدا ئامادەییان هەبوو، بەبێ ئەوەی ئەم ئامادەییە بەمانای سەرنجدان بێت لە مەسەلە سەرەکییەکانی ئەو سیاسەتگوزارییەی ژنان بەگشتی بایەخیان پێدەداو فیمینیستەکانیش بەتایبەتی[١٤٢].

جگە لە سنووردارییە ستراکتووری و ئایدیۆلۆژییەکان کە سستەمی سیاسی و حزبی ئەمریکا بۆ فیمینیستەکانی دروست دەکردن، دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان ئامانجە فیمینیستەکانو ترسی نەریتی ئەمریکییەکان لە کۆمۆنیزم و بەلشەفیزم یەکێك بوو لەو کەرەستانەی کە هەندێك لە باڵە فەرمانڕەواکان سوودیان لێ وەردەگرت بۆ لاوازکردنی راستەوخۆی فیمنیزم. گوزارەکانی دژە جەنگ لە بزاڤدا بوونە هۆی ئەوەی لە وەزارەتی جەنگدا بە توندی گۆمان لە فیمنیزم بکرێتو تەنانەت جۆن ویکسن[١٤٣] وەزیری جەنگ لە ساڵی **١٩٢٢** هێلکارییەکی گەورەی بەناوی "تەونی جاڵجاڵۆکە" کێشابوو کە رێکخراوەکانی ژنانی بە "بەلشەفیزم" دەبەستنەوە[١٤٤]. وەزارەتی جەنگ پێیوابوو کە چالاکییەکانی فیمینیستەکان لەگەڵ ئاشتیخوازیو سۆشیالیزمدا بە ئاراستەی لەناوبردنی ئەمریکا بوون. تەنانەت گروپە میانڕەوەکانی ژنان وەك کۆمەڵەی ژنە لاوەکانی مەسیحی، کۆمەڵەی ئەمریکی ئابووریی ماڵەوەو لیگی ژنانی دەنگدەر ببوونە نیشانەی هێرشەکانی وەزارەتی جەنگ.[١٤٥]

بەم شێوەیە، سستەمی سیاسی بە گشتی بە درێژایی دەیەکانی دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بۆ بەردەوامیدان بەچالاکی بزاڤی ژنانو سیاسەتی پشت ئەستوور بە رەگەز سستەمێکی نەگونجاو بوو و گوتارە هەژموونییەکانیش ئەو رەوشەیان توند دەکرد.





### گوتاری هەژموونی لەبارەی شوێنگەی ژن

لە دەیەکانی دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان و لە کەفوکولکەوتنی سیاسەتی پراگماتیزمی توندی ژنان، ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوە جارێکی دیکە لە چوارچێوەی گێڕانەوەگەلێکی نوێ و بە پەنابردنە بەر چەمکەکانی زانستە نوێکانو بەتایبەتی دەروونناسیی نوێ خرایەڕوو. ئەم تێگەیشتنە بۆ سەرمایەداری بە سوود بوو، چونکە لە ڕێگەیەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ دەیتوانی ژنان بەرەو پەراوێزی بازاڕی کار بنێرێت. لەم ماوەیەدا پێویستی بە هێزی کار (بەشێوەیەکی تایبەتی لە ماوەی هەڵایسانی کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٢٠ و دەیەی ١٩٣٠ ساڵەکانی دوای شەڕی دووەمی جیهانی) نەیدەتوانی وەڵامدەرەوەی گرتنە خۆی هەم ژنانو هەم پیاوان بێت و، لەهەمان کاتدا، *پشت بەستن* بەهێزی کاتیو تا ڕادەیەك لە ڕووی کۆمەڵایەتی "ناشەرعی" ژنان بەسوود بوو. سەرەڕای ئەوە، خستنەڕووی گوزارەی لەماڵدامانەوە لەگەڵ تێگەیشتنە نەریتییەکان لە ڕۆڵی ژنان کە چەند بەشێکی گەورەی کۆمەڵگا لە ژنان و پیاوان ئەویان بە ڕاست دەزانی، کۆكو تەبابوو . وا دەردەکەوێت پێناسەی "ژنی باش"، وەك *دایك و هاوسەری* باش پەسەندترو پاساودەرتر بێت لە ئامانجە فیمینیستییەکان. لەلایەکەوە پڕوپاگەندە ڕاگەیاندنییەکان و لەلایەکی دیکەوە هەڵوێستە ڕادیکاڵەکانی هەندێ لە فیمینیستەکان کە بەرەبەرە بەرەو ئەوە دەچوون تێگەیشتنی خۆیان لە فیمنیزم وەك تێگەیشتنی زاڵ لە بزاڤدا بسەپێنن، دەبووە هۆی ئەوەی وا دەرکەوێت کە فیمنیزم، هزرو شێوازێکە بە ئاراستەی تێکدانی گشت سستەمی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە زاڵەکان لە سەری لە ئاستە جیاوازەکاندا کە لەتوانایدایە زۆر لەو بەهاو ئامانجانەی مەبەستن و تەنانەت مەیلە سۆزاوییەکانی تاکەکانیش لەناوببات.

لە چوارچێوەی گێڕانەوە نوێکانی "ئایینی لەماڵدامانەوە"دا هەوڵدەدرا بەهۆی چەمکەکانی وەك"ئەندازیاری ماڵ"(١٤٦) و "بەڕێوەبەری ماڵ"(١٤٧) ستایشی ڕۆڵی ژنان لە ماڵدا بکەن و جەخت لەسەر بە سوودبوونی بکەنەوە. گۆڤارەکانی ژنان لە گرنگترین



ئەو هۆکارانە بوون کە ئەم ئایدیۆلۆژیایەیان بڵاودەکردەوە کە- سەرەڕای ئەوەی بەڕێوەبەرو سەرنووسەرەکانیان خۆیان بە ژنی خاوەن کارو پیشەیی لە قەڵەم دەدا- داوایان لە ژنان دەکرد "ژن" بنو بە باسکردنی یەکسانی لەگەڵ پیاوان "پەیوەندی قووڵ، دەوڵەمەندو بەبەرهەمی ژن و مێرد" لەناو نەبەن و وەك "تاکە ڕێگەی کەماڵ" سەیری هاوسەری و دایکایەتی بکەن(١٤٨). وێنەی گۆڤارەکان چ گۆڤارە گشتی و چ گۆڤارە تایبەتییەکانی ژنان وێنەی ژنە خۆشحاڵ و دەم بەپێکەنینەکانیان پێکدەهێنا کە بە "ژنایەتی تایبەتی" خۆیان شادبوون. گۆڤاری تایم وەك "پارێزەری ڕوئیای ئەمریکی" باسی ژنە ماڵدارەکانی دەکرد کە ئەرکی مەترسیداری "بەڕێوەبەری ماڵ" یان لەئەستۆدایە(١٤٩).

لە قوتابخانە و زانکۆکانیش جەخت لەسەر جیاوازی نێوان ژنو مێرد و پێویستی جیاکردنەوەی فەزاکانیان دەکرا. پرۆگرامی وانەی قوتابیانی زانکۆ لە دەیەی ١٩٢٠ و دوای ئەوە "لەسەر بنچینەی مەیلو بەرپرسیارییەکانی ئەوان وەك دایك و لە ماڵ" ڕێکدەخرا. تەنانەت لە ساڵەکانی دوای شەڕی دووەمی جیهانیش ناوونیشانە دەرسییەکان وەك هەڵبژاردنی هاوسەری خوازراو، فێرکردنی ماڵداری، ئارایشکاری و ... هاتنە نێو بەرنامەی دەرسی زۆر لە ناوەندی و کۆلێژەکان. ڕەنگە یەکێك لە سەرنج ڕاکێشترین گۆڕانکارییەکان لە بەرنامەی دەرسی کچاندا ئەوە بووبێت کە لە کۆلیژێك "تیۆرو شێوەی ئامادەکردنی شەش کەبابی ناسك" جێگەی وانەی "فەلسەفەی کانت"ی گرتەوە.

پیشەسازی فیلمیش کە لە دەیەکانی ١٩٢٠ و تا ١٩٣٠ دا هەندێکات ڕەنگدەرەوەی ژیانی ژنە خاوەن کارو پیشەییە سەرکەوتووەکان بوو، لە دەیەکانی دواتر بە گشتی وێنەی ژنی وەك بابەتێکی سێکسی یاخود ماڵداری تەواو گوێڕایەڵ دەخستەڕوو(١٥٠).

کاربەدەستەکانیش لە دامەزراوە جیاوازەکاندا پشتیوانیان لە ماڵداری ژنان دەکرد. جۆ ئیگل(١٥١) ئەندامی کۆنگرە ڕایگەیاند "کاری ژن دەبێت ئەوە بێت کە بۆ پیاوێکی باش





هاوسەرێکی باش بێت‌و بە باشی خێزانەکەی کە لە منداڵەکانی ئەو پێکدێن پەروەردە بکات"[١٥٢].

لەم ماوەیەدا بەرهەمگەلێکی زۆر بڵاودەبوونەوە کە تیایدا بە شێوەیەکی "زانستی" و بەخستنەڕووی ئامار و ژمارەکان جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکرایەوە کە منداڵان پێویستیان بە ئامادەیی هەمیشەیی دایکان هەیە، ئەگەر نا ڕووبەڕووی گیروگرفتی روحی و دەروونی دێن.

سەرەڕای ئەوە، لە هەندێ بەرهەمدا کە ناسراوترینیان کتێبی ژنی مودێرن: ئەو رەگەزەی خۆی دۆراندووە[١٥٣] بوو و لە ساڵی ١٩٤٧ بڵاوبووەوە، وەك ژنە نەخۆشەکان باسی فیمینیستەکانی دەکرد.

زۆر لە ژنە چالاکەکان لە گۆڕەپانە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا دیدێکی نێگەتیڤیان سەبارەت بە کاری ژنان هەبوو. نوسینگەی کاری ژنان پێیوابوو کە "خۆشگوزەرانی ماڵ‌و خێزان، کارێکە بە ئەندازەی توانای ژنێك و ئەو ژنانەی کاردەکەن شوکێك لە تەندروستی و بەختەوەری خێزان دەدەن"[١٥٤]. تۆژەرێکی وەك هێلن دویچ[١٥٥]- کە هەڵبەت خۆی ژنێکی خاوەن کار، ئەکتیڤ‌و تەواو پیشەیی بوو- لە بەرهەمەکانی خۆیدا وەك کەسانێك کە "گرێی پیاوەتی"[١٥٦] یان هەیە باسی ئەو ژنانەی دەکرد کە لە "رۆڵی ژنانە" ی خۆیان ناڕازی بوون و پێیانوابوو کە دەبێت ژنان خاوەنی رۆڵە تایبەتییە "سروشتی"یەکانیان بن[١٥٧].

لە ژێر کاریگەری ئەوکەشەدا، رای گشتیش بەتوندی لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای لەماڵدامانەوەدا کۆك و تەبا بوو. لە خەباتی کرێکاریدا، پیاوە کرێکارەکان ئامادە نەبوون هاوکاری زۆر لەگەڵ کرێکارە ژنەکاندا بکەن، چونکە بەبۆچوونی ئەوان کاری ژنان تەنیا لەو حاڵەتەدا دەکرا پاساوی بۆ بهێنرێتەوە کە داهاتی هاوسەرەکانیان کافی نەبوو. لە نێو توێژەکانی ناوەندی و چینی ناوەڕاستیشدا کارکردنی ژنان زێتر وەك هەوڵێك بۆ بەدەستهێنانی "پارەی ناوگیرفان" سەیری دەکرا.[١٥٨] بەگشتی، زۆرینەی



خەڵك ئەو تێگەیشتنەی کە دەبێت ژنان لە بەرپرسیاریەتیە نەریتییەکانی خۆیان لە ماڵ جیاببنەوە، رەت دەکردەوە. ئەو راپرسیانەی لەم ماوەیەدا ئەنجامدراون رادەی نفووزی ئەم گوتارە پیشاندەدەن. لە ساڵی ١٩٤٥ راپرسی دامەزراوەی گالۆپ پیشانیدا کە تەنیا لەسەدا ١٨ کۆمەڵگای ئەمریکا (بەپێی نموونەی لێکۆڵینەوەکە) لەگەڵ کارکردنی ژنە بەمێردەکاندا بوون لەو کاتەی هاوسەرەکانیان توانای داراییان هەیە[١٥٩].

ئەوەی سەرنج راکێشە جەخت کردنەوەی زۆر لەسەر لەماڵدامانەوەی ژنان لە هەلومەرجێکدا بوو کە ژنان بەهۆی گەشەکردنی خێرای بەرهەمە تەکنەلۆژییەکانی مۆدێرن زۆر کەمتر لە جاران کاتی خۆیان بەکارەکانی ماڵەوە دەکوشت. جێگرەوەی کارە نەریتییەکانی ماڵ، "ئایینی دایکایەتی" بوو کە جەختی لەسەر رۆڵی دەستنیشانکەری ژنان لە پەروەردەی منداڵان‌و پێویستی سەرنجدانی کاتیی تەواو بەمنداڵان بۆ رێگەگرتن لە گرفتە روحی و دەروونییەکانیان دەکردەوە. ئەم تێگەیشتنە لە دایکایەتی لە کۆمەڵگا نەریتییەکاندا کە ژنان کاتیان نییە لە پەروەردەی وردی منداڵەکانیان دا بگوزەرێنن و تەنانەت لە بوونی رۆڵی دەستنیشانکەرانە بۆ خۆیان کەمتر ئاگاداربوون مانای نەبوو و بەدیاردەیەکی تەواو نوێ دەژمێردرا کە ئەو دەروونناسییە مۆدێرنەی خەڵکی عامە پەسەندی دەکات سەرەکیترین پاڵپشت و راگەیەنەری بوو[١٦٠].

* * * *

جگە لە بێباکی گشتی، ناکۆکی لە نێو بزاڤی ژناندا رۆڵێکی زۆری لە ئاوابوونی فیمنیزمدا هەبوو. لە ساڵەکانی دوای بڕیاردان لەسەر ریفۆرمی نۆزدەیەم، تەوەری هاوبەشی خەبات لە نێو چوو و دەتوانین بڵێین فیمنیزم سەنتەری یەکێتییبەخشی خۆی لەدەستدا. رێبەرانی بزاڤی مافی دەنگدان بە چەقبەستن لەسەر یەك مەسەلە، ئامانجی کۆتایی خۆیان خستە نێو پەردەیەکی تەمومژەوەو، لە ئەنجامدا ئەوەی لەژێر ناوی رزگاری خرابووە ڕوو بووە جێی راڤەی جیاوازو ئەمەش بۆوە هۆی دروستبوونی درز لە نێو گروپە جیاوازەکاندا. لە هەلومەرجی نەمانی بەرنامە یاخود ئامانجی هاوبەشدا،





شانسێکی زۆر نەما بۆ پێشکەوتن یاخود بەدەستهێنانی پشتیوانی گشتی کە بۆ درێژەدان بە خەبات پێویست بوو[١٦١]، بە هەمان شێوەی کات دەڵێت"چالاکی بەبێ یەکێتی لە نێو رێکخراوەکانی ژناندا دەکرا وەك نەمانی هەموو جۆرە چالاکییەکی "ژنان" سەیری بکرێت"[١٦٢].

ناکۆکی لەمەڕ ریفۆرمی مافە یەکسانەکان لە نێو فیمینیزمدا نیشانەی ناکۆکی نێوان فیمنیزمی یەکسانی و جیاوازی بوو. ئامانجە ناکۆکەکانی وەك پشتیوانیکردن لە ژنان لە گۆڕەپانی ئابووری و لە هەمان کاتدا، کردنەوەی رێگا بۆ دەرفەتە یەکسانەکان بۆ ئەوان لە نیشانە دیارەکانی ئەو ناکۆکییە بوون.

فیمنیزمی جیاوازی لە ماوەی دوای بەدەستهێنانی مافی دەنگدان بە شێوەیەکی ناکۆکانە هەم گەشەی کردوو بەهێز بوو (بەسەرنجدان لە ژمارەی گروپەکان، رێکخراوەکان، ئەو تاکانەی لە ژێر سایەی گوتارەکەیدا بوون) هەمیش بەکردەوە لە گوتاری فیمینیستیدا سەرکوت کراو دواجار وەك "پارێزگاری" نافیمینیستی و دژە فیمینیستی، بە شێوەیەکی گشتی- بەلای کەمەوە بەشێوەیەکی کاتی- لە پرۆسەی سەرەکی هزری فیمینیستیدا نەما. ئەم لقەی بزاڤی ژنان بە جۆرە "هۆشیارییەکی درۆزنانە" و لەژێر کاریگەری ئیلقاکردنە باوکسالارییەکان سەیری دەکرا. بەسەرنجدان لەوەی زۆر لەوانەی بانگەوازیان بۆ دەکرد "دایکایەتی" یان لە مانا.... کۆمەڵایەتییەکەیدا و نەك شێوە بایۆلۆجییەکەی- بە "سروشتی" لەقەڵەم دەدا، رەنگە بتوانین بڵێین تاڕادەیەك لەگەڵ فیمنیزم لە دژایەتیدا بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا گەشەکردنەکەی نیشانەی بایەخدانی بنەڕەتی فیمنیزمی یەکسانی بوو بەو راستییەی کە لەلایەکەوە، ژنان "بەشێوەیەکی واقعی" لە پیاوان جیاوازن- لەبەر هۆی تەواو بایۆلۆژی- و لەلایەکی دیکەوە، زۆر لە ژنان دەیانەوێت و لە ئەنجامدا مافی ئەوەیان هەیە، خۆیان وەك دایك- وەك رۆڵێکی کۆمەڵایەتی- بناسێنن و هەرجۆرە بانگەشەیەکی فیمینیستی دەبێت ئەم داوایە لەبەرچاو بگرێتو ناتوانێت سەرکوتی بکات[١٦٣].



هەرچۆنێك بێت، یەکێك لە گرفتە سەرەکییەکانی فیمنیزم لەم ماوەیەدا ئەوە بوو کە هەردوو باڵەکەی تاکڕوانگەیی بوون. لە لقی یەکسانیدا، جیاوازی ژنان لەگەڵ پیاوان پشتگوێ خراو ئەو ژنە ناپیشەییەی نەیدەویست خۆی بە گشتی لە "کایەی گشتی"دا، کە بەهەرحاڵ پیاوەکان پێناسەیان کردبوو، پێناسە بکات، لە بازنەی تێبینییەکانی دەرچوو. لە لقی جیاوازیشدا تاڕادەیەك خۆبەستنەوەی ژنان بە "فەزای تایبەتی" کە ئەویش هەر پیاوان پێناسەیان کردبوو، مافی ژنان سەبارەت بە هەڵبژاردن و پێویستی یەکسانی تەواوی ئەو ژنانەی ئەم خۆبەستنەوەیەیان پەسند نەکرد پشتگوێ دەخرا. بە دەستەواژەیەکی دیکە، لەم ماوەیەدا هەردوو لقی فیمنیزم لە نێو گوتارێکی پیاوانەدا بوون کە لەسەر ئەو حیسابە دەیانویست لەگەڵی بجەنگن و لە ئەنجامدا هێندەش بە "رادیکال" نەدەژمێردران.

بە گشتی دەتوانین بڵێین کە بە دەستهێنانی مافی دەنگدان نەیتوانی کاریگەرییەکی پراکتیکی بخاتە سەر ژیانی ژنە ئەمریکییەکان. چونکە ژنان نەیانتوانی وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی- ئەو ئامانجانەی کە بۆ هەر گروپێکی فیمینیستەکان مانایەکی هەبوو- لەسەر بنەمای پرۆگرامێکی هاوبەش سوود وەرگرنو گروپێکیش کە بە دوای ریفۆرمی مافە یەکسانەکانەوە بوو نەیانتوانی بڕوا بەڕای گشتی سەبارەت بەداواکارییەکانی خۆی بهێنێت و نەك لە پیادەکردنی گوشار لەسەر دەستگا حکومییەکان بەسەرکەوتنێك بگات[١٦٤].

لە هەمان کاتدا، بەدرێژایی چەند دەیەیەك کە فیمنیزم و بزاڤی ژنان لە باری هەڵپەساردندا بوون، گۆڕانگەلێك لە رەوشی بابەتی و زەینی ژنان لە کۆمەڵگای ئەمریکیدا هاتنە ئاراوە کە سەرهەڵدانی شەپۆلی دووەمی فیمنیزم کۆتایی هات.





## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

1- O'Neil. op. cit

2-Lunardini, *op. cit*., p. 150.

3- abeyance

4- V. Taylor. "Social. Movement Coontinuity: The Women's Abeyance".
*American Sosiological Rview* 54, ) 1989(. pp. 761-2)

5- Duggan. *op. cit*., pp. 75-92.

6- O'Neill, *op. cit*., 90.

7- Cott, *op.cit*., p. 243.

8- Inez Haynes Irwin

9- polity

10- V. Taylor. *op. cit*., PP.761-75.

11- League of Women Voters. LWV

12- Chafe. *op. cit*., pp. 115





13- Oakley, *op. cit*., p. 22

14- Cott. *op. cit*., p. 86.

15- Lwnardini, *op. cit*., o. 161.

16- Oakley, *op. cit*, p.22

17- Cott, *op.cit*., p. 74, Chafe, *op. cit*., p. 121.

18- Womans' Committee for Political Action

19- Charlotte Perkins Gilman

20- Carrie Chapman Catt

21- Cott, *Ibid*., p. 251.

22- *Zanta International*

23- *Quota International*

24- *National Federation of Woman's Clubs*

25- Lena Madesin Phillips

26- *Ibid*., pp. 89 – 90

27- *Ibid*: O' Neill, *op. cit*., p. 90.

28- *National Woman's Trade Union League*

29- *Ibid*. p. 91

30- *National Congress of Parents and Teacher Association*

31- Cott, *op. cit*., p.87.



32- Rapp and Ross. *op. cit*., p. 97

33- D. King, Multiple Jeupardy, Multiple Consciousness : The Context of a Black Feminist Ideueology" in M. R. Malson et al,. eds., Feminist Theory in Practice and Process, (Chicago. University of Chicago Press. 1989). p,89.

34- Sinclair, *op. cit*., P. 312.

35- National Consumer's League

36- Florence Kelley

37- O' Neill, *op. cit*., 90: Cott. *op. cit*., pp. 87-88.

38- Cott, *op. cit*., p. 88- 91.

39- Emma Wold

40- *Ibid*., pp. 72. 94.

41- G. Duerst – Lahti. "The Government's Role in Building the Womans' Movment". "*Political Science Qwarterly* 104, 2 (1989), pp. 251- 55.

42- Rapp. And Ross, *op. cit*., P. 97.

43- V. Taylor, *op. cit*,. P. 764.

44- Durest – Lahti, *Ibid*. P. 255

45- Equal Rights Ammendment, ERA

46- Rapp and Ross. *op. cit*., P. 97

47- Lunardini, *op. cit*., p.162





48- Chafe. *op. cit*., pp. 127, 113

49- Cott. *op. cit*. p. 127.

50- Yates. *op. cit*., pp. 52-23

51- Daughters of American Revolution, DAR

52- Cott, *op. cit.,* pp. 180-82.

53- Chafe . *op. cit*., p. 53

٥٤- هەڵبەت وا دەردەکەوێت کە تەنانەت "ئالیس پول"یش پیش خستنەڕووی پێشنیاری چاکسازی مافە یەکسانەکان، بڕوای بە نەهێشتنی یاساکانی پشتیوانی نەبوو. ئەو ساڵی ١٩٢١ بە ڕێبەرایەتی حزبی ژنان لە ماساچۆست ئامۆژگاری کرد کە ئاگاداربێت ریفۆرمە یاساییەکان دژی یاساکانی پشتیوانی بۆ دابینکردنی خۆشگوزەرانی زێتری ژنان نەبن و ئەگەر لە شوێنێك نایەکسانی لە بەرژەوەندی ژناندایە لە جیاتی نزمکردنی Cott, *op. cit*., pp. 121-125)پێگەیان ڕەوشی پیاوان هێورببێتەوە. (بە وەرگرتن لە:

55- Coolidge. *op. cit* .p. 172.

56- Cott, *op. cit*., pp. 121, 125

57- Antia. Philipps

58- Women's Service corps.

59- Bnkin and Bach. *op. cit*., p. 6.

60- Lunardini . *op. cit*., p. 160.

61- Chafe, *op. cit*., p. 115.

62- Yates. *op. cit*., p. 53.



63- S.A. Hewlett. A Lesser Life: The myth of Women's Liberation in Anerice. (New York, Warner. 1987). P.214.

64- Women's Co-operative Guild

65- Rowbotham. Women in Movment, *op. cit*., pp. 243 – 45

66- Cott, *op. cit*. pp. 91-92.

67- modrn warfare

68- *Ibid*., pp. 243-44

69- Sara Bard Field

70- Lunardini, *op. cit*., p. 157.

71- Lilian Kerr

72- Bell Case La Follette

73- Cott. *op. cit* ., p. 70.

74- *Ibid* ., p.80.

75- Hewlett , *op. cit*., p. 198.

76- Women's Joint Congressional Committee

77- Cott. *op.cit* ., p. 98.

78- Hewlett. *op. cit*., p. 212

79- Cott, *op. cit*., pp. 245-246

80- Sinclair, *op. cit*., pp. 343 – 44





81- Cott, *op. cit* ., p. 101.

82- Frank Kent

83- *Ibid*., p. 226.

84- Chafe. *op. cit*., p. 31-31 : Hewlett *op.cit* .,p. 152

85- Poyser

86- Sinclair, *op. cit*., p. 344

87- Ann Martin

88- Frances Kellor

89- Cott . *op* . *cit* ., p.101-109.

90- *Ibid*., p . 108. Hewlett . *op. cit*., p. 160-610.

91- Hewlett, *Ibid*., p. 160

92- Cott, *op* . *cit*., p. 254.

93- Rebecca Felton

94- Chafe, *op. cit*., p. 39.

٩٥- بۆ بینینی وێنەگەلێك لە خۆپیشاندانی ژنان کە پلاکارت و ئاڵاکانیان تیایدا دیارن، بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ: cott, *op. cit*., Flexner, *op. cit*.

96- Chafe, *op. cit*., p. 109.

97- Yates. *op. cit*., p. 40.

98- Lunardini, *op. cit*., p. 156



99- Chafe. *op. cit*., pp. 125- 126

100- Maud younger.

101- Cott, *op. cit*., p. 124

102- *Ibid*., p 125.

103- Alva Blemont

104- Lunardini. *op* . *cit*., p. 152.

105- Burnita Shelton Mathews

106- Cott. *op. cit*. p. 75

107- Lunardini , *op. cit*., pp. 151-52

108- Caroline Spenser

109- Doris Stevens

110- Cott, *op* . *cit* . pp. 75 – 76

111- Lunardini . *op. cit*. p. 154

112- Chafe . *op. cit*., pp. 34-35

113- ELeanor Rathone

114- Moude Royden

115- Lunardini, *op. cit*., p. 151

116- Elizabeth Glendouer Evans

117- Cott, *op. cit*., p. 128





118- *Ibid*, p. 123.

119- Waman Citizen

120- Cott. *op. cit*., pp. 128-29

121- *Ibid* p.138

122- *Ibid*. pp. 134 – 39

123- Hewlett, *op. cit.*, p 214

124- Cott, *op. cit*., p. 135.

125- V. Taylor, *op. cit*., pp. 763- 64.

126- Sex – consciousness

127- Cott, *op . cit*., pp. 95-96.

128- polities of movement

129- Packers and Stockyards

130- Rapp and Ross, *op. cit*., P. 96: Chafe,*op. cit*., p.28.

131- Cott, *op. cit*., pp 98-99

132- Chafe, *op. cit*., p. 29

133- Sinclair, *op. cit* ., p. 344.

134- Hewlett, *op. cit* ., p. 161.

135- Lunardini, *op. cit*., 165.

136- Chafe, *op. cit* ., p.58.



137- Lunardini, *op. cit* ., p. 160.

138- Cott, *op. cit*., p. 86.

139- Ibid., pp. 112-113.

140- Hewlett, *op. cit*. P. 161.

141- tokenism

142- V.Taylor, *op. cit*., p.764.

143- John Weeks

144- Rapp and Ross. *op.cit.* pp. 97-98

145- Hewlett, *op. cit.,* p.183.

146- home engineering

147- home management.

148- Chafe, *op. cit.,* pp 105-106.

149- Hewlett, *op. cit.,* p.248.

150- *Ibid.,* pp. 250-51.

151- Joe Eagle

152- Chafe, *op. cit.,* p. 62.

153- *Modern Woman : The Lost Sex*

154- Ibid ., p. 64.

155- Helene Deutsch





156- masculinity complex.

157- Taylor. *op . cit.,* p. 765.

158- Chafe , op. cit., pp. 62, 77-78.

159- Taylor, *op. cit* p. 765

160- Hewlett, *op. cit*., ch. 11

161- Chafe, *op. cit*. P. 113

162- Cott, *op. cit*., p. 266

١٦٣- هێڵکاری ژماره ٣ (پاشکۆ) هۆکاره کاریگەرییەکان لەسەر هەڵپەساردنی شەپۆڵی یەکەم پیشاندەدات

164- Hewlett. *op. cit*,. 216

گوتاری مۆدێرنیتە

بونیادی ئابووی- کۆمەڵایەتی سەرمایەداری

دەوڵەتی لیبرال

ڕەوشی بابەتی ژنان

شێوە وەرگرتنی ناسنامەی پشت ئەستوور بە ڕەگەزی ژنانە (ئێمە یان خود)

ڕێکخستن و مۆبالیزەی سەرچاوەکان

بزاڤ و گوتارەکانی دیکە

بزاڤی ژنان

گۆڕان و کردەکانی دەوڵەت

گۆڕانەکانی سەرمایەداری

بێبزواتی ڕێژەی بزاڤ

تیۆری کۆمەڵایەتی فیمینیزم

**هێڵکاری -١- مۆدێلی ڕوونکردنەوەیی بۆ بزاڤی ژنان**



گوتاری مۆدێرن: ڕەخنەی قەدەرخوازای، پیرۆزی داماڵین لە سستەمی هەیی، ئەگەری دووبارە بیرکردنە

#

پیرۆزکردنی ئایدیۆلۆژی لە ماڵدامانەوە

#

هاتنی ژنان بۆ کایەی گشتی

کار

فێربوون

خەیری و بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان

شوێنگەی جیاکاریخوازانەی ژنان لە کایەی گشتیدا

#

بنەمای یەکسانی لە سەرمایەداری، دەوڵەت و گوتاری مۆدێرنیتە

فۆرمولەبوونی ناسنامەی گشتی

شەپۆلی یەکەمی فیمینیزم

دروستکردنی ژێرخانەکانی پەیوەندی لەلایەن دەوڵەتی سەرمایەداری

گۆڕانە تەکنۆلۆجییەکانو بوژانەوەی ئابووری

کاتی ئازاد و توانا داراییەکان

دروستکردنی پەیوەندی نێوان ژنان

بونیادی هەلی سیاسی

زەمینەی ڕێکخستن

بزاڤە کۆمەڵایەتییە هاوسێکان

کاریگەرییە گوتاری و هۆشیارکارییەکان

(# ئەمە نیشانەی دژایەتی نێوان هۆکارەکانە)

**هێڵکاری -٢- هۆکارە کاریگەرەکان لە فۆرمولەبوونی شەپۆلی یەکەمی بزاڤی ژناندا**




**هێڵکاری -٣- هۆکارە کاریگەرەکان لە فۆرمولەبوونی قۆناغی هەڵپەساردنی شەپۆلی یەکەم**